# گۆڕانە ژیارییەکان و جیهانی ئیسلامی



نووسینی:
د. ئەحمەد داود ئۆغلۆ

وەرگێڕانی:
د. هادی عەلی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی (١٣)

گۆڕانە ژیارییەکان و جیهانی ئیسلامی

نووسینی: د. ئەحمەد داود ئۆغلۆ

وەرگێڕانی: د. هادی عەلی

# العالم الإسلامي في مهب التحولات الحضارية

د. أحمد داود أوغلو

ترجمة:

د. هادي علي

المعهد العالمي للفكر الإسلامي (١٣)





ناوی کتێب: گۆڕانە ژیارییەکان و جیهانی ئیسلامیی.

نووسینی: د. ئەحمەد داود ئۆغلۆ.

وەرگێڕانی: د. هادی عەلی.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (١٣).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٧٥٣)ی ساڵی (٢٠١١)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١١.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# پێشەکیی وەرگێڕ

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا ناوی (گۆڕانە ژیارییەکان و جیهانی ئیسلامیی)یە (Civilization Transformation and The Muslim World) لە نووسینی سیاسەتمەداری ناوداری تورکیا (د. ئەحمەد داود ئۆغلۆ - وەزیری دەرەوەی تورکیا)یە، نووسەر و بیرمەندی میسریی بەڕێز (د. ئیبراهیم بەیومی غانم) وەری گێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی بە ناوی (جیهانی ئیسلامیی لە بەردەم گۆڕانە ژیارییەکاندا - العالم الاسلامي في مهب التحولات الحضارية) و چاپی یەکەمی لە ساڵی ٢٠٠٦دا بڵاو کراوەتەوە.

بەشەکانی کتێبەکە لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا لە چەند کۆڕ و کۆنگرەیەکی گرنگدا نووسەر پێشکەشی کردوون، پاشان لە دووتوێی ئەم کتێبەدا بڵاوی کردوونەتەوە.

ئێمە لەبەر گرنگیی بابەتەکانی و لەسەر داوای لقی کوردستانی (پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی) هەڵساین بە وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردیی.

دەستپێکی وەرگێڕانەکەشم هاوکات بوو لەگەڵ شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکانی وڵاتانی ناوچەکەدا دژ بە ڕژێمە دیکتاتۆر و گەندەڵەکان و سەرکەوتنی لە هەریەك لە میسر و تونس. ئەوە بۆخۆی هاندەرێکی تربوو بۆم بۆ زیاتر گەرمبوون لەسەر وەرگێڕانی کتێبەکە. چونکە بابەتە سەرەکییەکانی کتێبەکە بە دەوری ئەوەدا دەخولێنەوە کە گۆڕانکارییە گەورە و نەوعییەکانی دوودەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم و هەرەسهێنانی یەکێتیی سۆڤیەت و بلۆکی سۆشیالیستی و سەرهەڵدانی سیستمی نوێی جیهانیی بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەو هەلومەرجە نێودەوڵەتییە نوێیەی دوابەدوای ئەو گۆڕانکارییانە هاتنە

ئاراوە، پێشبینی ئەوەیان لێدەکرا گۆڕانکاریی و ڕووداوی گەورەتر و فراوانتریان بەدوادا بێت لە مەودایەکی نەزۆردووردا.

هۆکاری سەرەکیی ئەو جۆرە پێشبینیانە ـ بە ڕای نووسەر ـ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە شارستانێتیی ڕۆژئاوا بە گشتی بە هەردوو بەشەکەیەوە (واتە ئەورووپا و ئەمریکا)، بە قەیرانێکی ڕیشەیی و دژواردا تێدەپەڕێت و ناتوانێت خۆی بە تەنها و لە ناوخۆی خۆیدا چارەسەری بکات، بە تایبەتی دوای ئەوەی گەیشتۆتە قۆناغێکی پەڕگیر و ترسناك لە خۆبەزلزانین و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی هەر کولتوور و شارستانێتییەکی تری ناڕۆژئاوایی بە ناوی جیهانگیرییەوە.. وەك ئەو بیرۆکەیەی لە لایەن گەورەبیرمەندانی ڕۆژئاواییەوە بە کۆتاییهاتنی ئایین و ئایدۆلۆژیا، یان کۆتایی مێژوو گوزارشتی لێدەکرێت.

شکستهێنانی ئایدۆلۆژیای مارکسیزم و لێکهەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت و بلۆکیی سۆشیالیستی، ئاماژەی قووڵ و مێژوویی هەڵگرتووە لەسەر ئەو قەیرانەی کە لەمێژە ڕووبەڕووی شارستانێتیی مادديگەرای ڕۆژئاوا بووەتەوە.. لە ڕاستیدا شکستهێنانی مارکسیزم ئەوەندەی بەڵگەیە لەسەر شکست و دەرکەوتنی قەیرانی شارستانێتیی ڕۆژئاوا و بنەما فەلسەفییەکانی، بەو ئەندازەیە بەڵگە نییە لەسەر سەرکەوتنی سەرمایەداری و لیبراڵیزمی ڕۆژئاوایی، وەك لە ڕواڵەتدا دەردەکەوێت. چونکە مارکسیزم خۆیشی زادەی هەمان ئەو فەزا مەعریفی و فەلسەفییەیە کە سەرمایەداریی ڕۆژئاوایی بەرهەمهێناوە. جیاوازیی بنەڕەتی لە نێوان مارکسیزم و سەرمایەدارییدا زیاتر لە چۆنێتی دابەشکردنی بەرهەم و ساماندایە.

یەکێك لەو نیشاندەرانەی کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شارستانێتیی ڕۆژئاوا لە قەیرانێکی گەورەدایە، بریتییە لە لاوازیی، یان ڕاستتر بڵێین نەبوونی ڕەهەندی ئەخلاقی و مرۆیی لەو شارستانێتییەدا، هەر ئەوەشە وای لێکردووە خۆی لەسەر حسابی لاوازکردن و وەلانانی شارستانێتییەکانی تر بونیاد بنێت و نەهێڵێت هیچ ڕۆڵێك لەسەر شانۆی ژیان ببینن. ڕووداوە مێژووییەکانیش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن

كە ڕۆژئاوا لە سەردەمی فراوانبوونی ئیمپریالیزمی خۆیدا و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، لەو کۆمەڵگا و وڵاتانەدا دەستی بەسەردا گرتوون، کاری بۆ پەکخستنی گشت هۆکارەکانی هەڵسانەوە و پێشکەوتن کردووە، بۆ ئەوەی هەمیشە وەك پاشکۆ بە دەوری خولگەی ڕۆژئاوادا بسووڕێنەوە و بازاڕێکی کراوەبن بۆ بەرهەمەکانی.

ئەو خاڵە لاوازە یەکێکە لە گرنگترین ئیشکالیاتەکانی قەیرانی شارستانێتیی ڕۆژئاوا، کە ناتوانێت دەرك بەو ڕاستییە بکات کە پێویستی بە شارستانێتییەکانی تر هەیە و بەرژەوەندیی لەوەدایە کار بکات بۆ دروستکردنی ڕوئیایەکی نوێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شارستانێتییەکانی تر لەسەر بنەما ئەخلاقییەکان و شەراکەت. بۆیە دەبینین لەبری ئەوەی هاوکاری بکات بۆ هەڵسانەوەی جیهان بە گەشەپێدانی شارستانێتییەکان و نوێکردنەوەی کولتوور و فەرهەنگی نەتەوە نائەورووپاییەکان، وەك باشترین ڕێگاچارە بۆ دەربازبوون لەو قەیرانەی تێیکەوتووە، بەپێچەوانەوە گەورەترین کۆسپ لە ڕێگای پێشکەوتنی جیهانیی و پەرەسەندنی شارستانێتییە نائەورووپاییەکاندا دروست دەکات. هەرئەو تێڕوانینە نادروستەیە کە (هینتنگتۆن) لە تیۆری (بەریەککەوتنی شارستانێتییەکان)دا ئاگاداریی دەدات بە ڕۆژئاوا لە مەترسی هەڵسانەوەی شارستانێتییەکانی تر لە جیهاندا. هەر لەبەر ئەو هۆکارەشە کە شارستانێتیی ڕۆژئاوا لە ناوەندە مێژووییەکانی خۆیدا قەتیس ماوە وەك (لەندەن، پاریس، بەرلین و ئێستاش واشنتۆن) و نەگوازراوەتەوە بۆ دەرەوەی ئەو ناوەندانە. بەپێچەوانەی شارستانێتیی ئیسلامییەوە کە لە سەردەمە زێڕینەکانیدا بە ئاسانی ناوەندەکانی خۆی دەگواستەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە پێیان دەگەیشت. ئەوەبوو لە مەدینەوە گوازرایەوە بۆ دیمەشق و بەغدا و قاهیرە و قەیرەوان و قورتوبە و ئەصفەهان و بوخارا و سەمەرقەند و ئەستەنبوڵ.

یەکێك لەو گرێ سەرەکیانەی کە شارستانێتیی ڕۆژئاوا بۆ چەند سەدەیەکە گیرۆدەی بووە و بە هۆیەوە خودی شارستانێتییەکە و مرۆڤایەتی بە گشتی دووچاری قەیرانێکی گەورە بۆتەوە، پەیوەستە بە پەیوەندیی نادروستی نێوان

ئیسلام و ڕۆژئاوا. ڕووداوەکانی مێژووی نوێ و هاوچەرخیش دەیسەلمێنن کە ئەم کێشەیە دژوارترین و ئاڵۆزترین کێشەی ژیارییە ڕووبەڕووی جیهان بۆتەوە.

ڕاستییەکیش هەیە کە ڕۆژئاوا تا ئێستا وەك پێویست دەرکی نەکردووە، یان نایەوێت دەرکی بکات و بە ئیجابی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئەویش ئەوەیە کە ئیسلام هەر لە سەرەتای هاتنیەوە لە سەدەی حەوتەمی زایینییدا لە بەردەمی هێزی هیچ شارستانێتییەکی تردا شکستی نەهێناوە، نە لە بەردەم شارستانێتیی ڕۆمەکان و فارسەکاندا لە سەرەتای سەرهەڵدانیدا و نە لە بەردەم شارستانێتیی مەغۆلەکان وخاچدارەکاندا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و نە لە بەردەم شارستانێتیی ڕۆژئاوادا لەم سەردەمەدا، لە بەردەم هیچ هێزێکی تریشدا هەرگیز لە ئێستا و ئایندەدا شکست ناهێنێت. لە بەرژەوەندیی ڕۆژئاوا و جیهانیشە بە گشتی کە ڕۆژئاواییەکان دەرك بەم ڕاستییە بکەن و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئیسلام و جیهانی ئیسلامییدا ڕاست بکەنەوە و سوود لە لایەنە مەعنەوی و ئەخلاقی و کولتووری و تەشریعییەکانی ئیسلام وەربگرن لەپێناو بنیاتنانی ئایندەیەکی نوێ و گەش بۆ جیهان بە گشتی.

ئەمڕۆ جیهان بە گشتی و ڕۆژئاوا بە تایبەتی پێویستی بە چاکسازیی ڕیشەیی هەیە کە بەها و ڕەوشتەکانی بۆ بگێڕێتەوە، دوای ئەوەی تا بینەقاقای نقوم بووە لە مادديات و ڕەفتاری بەکاربردنی بەرهەمە مادديیەکاندا، چونکە شارستانێتیی هاوچەرخ وەك (مالك بن نبي) وەسفی دەکات، بووە بە شارستانێتیی شتەکان (حضارة الاشياء). مرۆڤایەتی ملکەچ بووە بۆ پێوەرە مادديیەکان و کاریگەریی سەلبی کردۆتە سەر هاوسەنگیی ناوخۆیی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە ناو خێزان و کۆمەڵگەدا. ئەو بەختەوەری و ئاسوودەییەی مرۆڤ بە دوایدا دەگەڕێت، بە تایبەتی مرۆڤی ڕۆژئاوایی لە ڕووی ڕۆحی و دەروونیەوە ونی کردووە و ناتوانێت هەروا بە ئاسانی بەدەستی بهێنێتەوە.

بەڵام حەرەکەتی مێژوو ئەوەمان پێدەڵێت کە جیهان لەسەر یەك حاڵەت ڕاناوەستێت و بە یەك ئاڕاستە ناڕوات، بەڵکو ئاڕاستەی حەرەکەتی مێژوو بۆی هەیە

له هەر چرکەساتێکی مێژووییدا بگۆڕێت و گۆڕانکاریی گەورەش بە دوای خۆیدا بهێنێتە کایەوە، بە تایبەتی لەم سەردەمەدا کە هەموو لایەکی جیهان وەك گوندێکی بچوك، یان وەك ماڵێکی گەورەی لێهاتووە بە هۆی شۆڕشی پەیوەندییەکان و تەکنۆلۆژیای ڕاگەیاندن و کرانەوەی مەعریفە و مەعلومات و زاڵبوونی بەسەر هەموو سنوور و بەربەستەکاندا. بۆیە مەرج نییە شارستانێتیی ڕۆژئاوا کۆتایی پێشکەوتن و کۆتایی مێژوو بێت وەك فۆکۆ یاما بانگەشەی بۆ دەکات. ئەو ئوممەتەی ئەمڕۆ خاوەنی پێشکەوتنە، مەرج نییە بۆ هەمیشە هەروا بڕوات، بە پێچەوانەشەوە ئەو ئوممەتەی کە ئەمڕۆ لە دەرەوەی بازنەی شارستانیەتدایە، مەرج نییە تاسەر بەو شێوەیە بەردەوام بێت.

ئەو ڕووداوە گەورانەی کە لەم سەردەمەدا لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا ڕوودەدەن، بە تایبەتی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، سەرجەمیان ڕووداوگەلێکن کە ناکرێ بە پێوەری ڕووداوە ئاساییەکان هەڵسەنگاندنیان بۆ بکرێت، بەڵکو پێویستە بەپێی پێوەرە گەورەکانی شارستانییەت مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت. کەم قۆناغی مێژوویی هەیە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بە ئەندازەی ئەم سەردەمە ڕووداو و گۆڕانکاریی گەورەی بەخۆوە بینیبێت لە ڕووی خێرایی و قووڵی و نەوعییەوە و لە کاتێکی زۆر پێوانەییدا. ئەم ڕووداوانە بە هەموو پێوانەیەك بەڵگەن لەسەر وەرچەرخانێکی مێژوویی گەورە و هەمەلایەنە لە ڕووخانی شارستانێتییەك و دروستبوونی شارستانێتییەکی نوێ دەچێت. ئەگەرچی شارستانێتییەکان لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا لەناو ناچن، یان دروست نابن، بەڵکو پێویستی بە کاتێکی درێژخایەن هەیە لە نێوان کۆتاییهاتنی شارستانێتییەك و سەرهەڵدانی یەکێکی تردا.

ئەو گۆڕانکارییانەی کە ئەمڕۆ لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوودەدەن، ڕاستە بەرئەنجامی کەڵەکەبوونی مەعریفی و حەرەکەتی مێژوویی گەلانی ناوچەکەن، بەڵام خێراییەکەی و فراوانییەکەی لە ئاستی چاوەڕوانکراو زۆر زیاتر و قووڵترە. دیارە لە هەر گۆڕانێکیشدا حەرەکەتی گۆڕانکارییەکان خێراتر و گەورەتر دەبێت

وەك حەرەكەتی تۆپەڵە بەفرێك كە لە دامێنی چیایەكەوە بەرەو خوار لێژ دەبێتەوە. بۆیە گۆڕانكارییەكانی ئەمدواییە وامان لێدەكەن چاوەڕوانی گۆڕانی زۆر گەورەتر بكەین، چونكە هەتا چالاكی و زیندوویێتی لە ناو كۆمەڵگەكاندا كاراتر و خێراتر بێت، ئەوا ڕووداو و گۆڕانكاریی گەورەتر بە دوای خۆیدا دێنێتە كایەوە.

لە لایەكی ترەوە هۆكاری ڕووخانی شارستانێتییەك بە تەنها ناگەڕێتەوە بۆیەك هۆكاری وەك ڕاوەستانی گەشەكردنی ئابووریی، یان دواكەوتنی تەكنۆلۆژیا، یان بۆ قەیرانێكی سیاسی و كۆمەڵایەتی، چونكە ڕووخانی شارستانێتییەك یان دروستبوونی شارستانێتییەكی تر بەستراوە بە چەندین هۆكاری گرنگەوە كە ڕەنگە گرنگترینیان ئەو هۆكارانە بن، كاریگەریی ڕیشەیی دەكەنە سەر لایەنی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی. بۆیە هۆكارە فیكری و ڕۆشنبیری و پەروەردەییەكان بە گرنگترین و كاریگەرترین ئەو هۆكارانە دەژمێردرێن. هەر لەو سۆنگەیەوەیە كە قورئانی پیرۆز ئاماژە دەكات بە یەكێك لە یاسا بنەڕەتییەكانی گۆڕان، كە پەیوەستەبە خودی مرۆڤ خۆیەوە: (إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ) (الرعد: ١١)، چونكە مرۆڤ خۆی بەتواناترین بوونەوەرە لەسەر دروستكردنی گۆڕان و گۆڕانی مرۆڤیش دەبێتە هۆی گۆڕانی كۆمەڵگە و ئوممەت و جیهان. بۆیە ئەوەی كە زۆر گرنگە و پێویستە بایەخی تەواوی پێبدرێت، مەسەلەی پەروەردەكردنی مرۆڤە لەسەر بەهاكانی دادپەروەری و ئازادی و یەكسانی و چاكەخوازی و بەخشندەیی بەرامبەر بە مرۆڤەكان و بوونەوەرەكان بە گشتی. بە واتایەكی تر مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ خودی خۆی و ئینسانییەتی خۆی.

ئەم كتێبەش توێژینەوەیەكی زانستیانەیە سەبارەت بەو قەیرانە ڕیشەییەی ڕووی كردۆتە شارستانێتیی ڕۆژئاوا و هۆكارەكانی، ئەوەش ڕوون دەكاتەوە كە ئەو قەیرانە قەیرانێكی ڕاستەقینەیە و مومكین نییە شارستانێتیی ڕۆژئاوا تا مەودایەكی درێژخایەن وەك یەك دوو سەدەی ڕابردوو بتوانێت لەسەر پێی خۆی ڕابووەستێت. لە هەمان كاتدا ئەوەش ڕوون دەكاتەوە كە شارستانێتیی ئیسلامیی لە توانایدایە

جارێکی تر هەڵسێتەوە و لەسەر شانۆی ژیان ڕۆڵی کارا و ئیجابی ببینێت.. ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییەش نیشاندەرێکی تری بەهێزە لەسەر ڕاستی و دروستیی ئەو پێشبینیانەی کە لەم توێژینەوەیەدا ئاماژەیان پێکراوە.

**د. هادی عەلی**

**ئایاری ٢٠١١ ـ هەولێر**

# پێشەکیی نووسەر

ئەم کتێبەم بە سێ قۆناغ نووسیوە، قۆناغی یەکەم بریتی بوو لە توێژینەوەیەك کە پێشکەشم کردبوو بە کۆنگرەیەك لە شاری ئەستەنبوڵ لە (دیسەمبەری ١٩٨٩) دەربارەی پەیوەندییەکانی تورکیا بە دەوڵەتانی کۆمەڵەی ئەوروپییەوە، ئەوەش ڕاستەوخۆ دوای ڕووخانی دیواری بەرلین بوو، تیایدا شیکردنەوەکەم چڕ کردبویەوە لەسەر گۆڕانکارییە ڕۆشنبیرییەکان و ئەو قەیرانەی کە هاتووەتە کایەوە و تیایدا پێنج خاڵی سەرەکیم خستبوونە ڕوو:

١- داڕووخانی بلۆکی سۆشیالیستی ئاماژەیە بۆ بوونی قەیرانێکی ژیاریی هەمەلایەنە بە دەرهاویشتە جیاوازەکانیەوە، بەڵام ئەم داڕووخانە بە سەرکەوتنی کۆتایی سەرمایەداریی ڕۆژئاوا دانانرێت.

٢- بیرۆکەی یەکێتیی ئەوروپا هەوڵێکە بۆ زیندووکردنەوەی نەریتێکی کۆن کە لە شارستانێتیی ڕۆژئاوادا ڕەگی داکوتاوە و مەبەست لێی جارێکی تر گەڕانەوەی ناوەندی شارستانێتییە بۆ دەستی ئەوروپا.

٣- هۆکارە ژیارییەکان و باکگراوندە مێژووییەکانیان لە هۆکارە ئابوورییەکان کاریگەرتر دەبن لە دیارییکردنی هەڵوێستی دەوڵەتانی کۆمەڵەی ئەوروپیدا لە بارەی داخوازیی تورکیا بۆ بەدەستهێنانی ئەندامێتی تەواو لە یەکێتیی ئەوروپادا.

٤- ئەو ڕێبەرە ئەوروپیانەی کە قەناعەتی تەواویان بە ناوەندێتیی شارستانێتیی ئەوروپا و باڵادەستی بۆ وەلاتانی شارستانێتییەکانی تر هەیە، هەرگیز ئامادە نابن کە دەوڵەتێکی موسڵمان لە ناو ئەوروپادا بێت.

٥- خەیاڵی (ناوەندێتی بە دەوری خود) لە لای مرۆڤی ڕۆژئاوایی وەك (ئارنۆڵد تۆینبی) وەسفی کردووە، گەورەترین کۆسپە لە بەردەم فرەیی ژیانی هاوبەش لە ئەوروپادا.

بەڵام قۆناغی دووەمی نووسینی ئەم کتێبە ساڵی ١٩٩١ بوو، کە هەڵسام بە شیکردنەوەی پێشینەی فەلسەفی و دەرئەنجامە سیاسییەکانی گۆڕانە ژیارییەکان لە بەراوردکارییەکی بونیادی نێوان هەردوو شارستانێتیی ڕۆژئاوا و ئیسلامدا. ئەو شیکردنەوەیەش لە چوارچێوەی توێژینەوەیەکدا پێشکەشم کردبوو بۆ کۆنگرەی بیست و سێیەمی ساڵانەی کۆمەڵەی دیراساتی نێودەوڵەتی لە ژێر ناونیشانی: (ڕەهەندە نوێیەکان لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا) کە لە (فانك وفەر ـ ئەڵمانیا) لە ڕۆژانی٢٠ـ ٢٣/مارس/١٩٩١ دا گرێ درا. ئەم گریمانانەی خوارەوە تەوەری توێژینەوەکە بوون کە ڕاستەوخۆ دوای سەرکەوتنی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە جەنگی کەنداودا پێشکەشم کرد:

یەکەم: تێوری کۆتایی مێژووی (فۆکۆ یاما) کە جەخت دەکاتەوە لەسەر سەرکەوتنی دیموکراتییەتی لیبراڵی بێمەرج و دانانی بە دواقۆناغی پەرەسەندنی ئایدۆلۆژیای ئینسانی، ئەو تیۆرە کە لە چوارچێوەی پێشبینیکردن دەرناچێت، پاساوی تیۆریی دا بەدەست هێزە باڵادەستەکانەوە بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی پەیکەری سیستمی جیهانیی.

دووەم: گەشبینی بە ئایندەی چەمکی سیستمی جیهانیی نوێ لە قۆناغی دوای شەڕی سارد، مەرج نییە ڕەنگدانەوەی ڕاستییە سیاسییەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بێت.

سێیەم: دروستبوونی هێزی سیاسیی ڕاستەقینە پشت بەستوو بە شوناسی ژیاریی، دەبێتە هۆی هاتنەکایەی (هاوسەنگی) لە پەیکەری هێزدا لە ناوچەی ئەورۆئاسیا، هەرئەوەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دژایەتی و پشێوی سیاسی لە بری دروستبوونی سیستمێکی جیهانیی کارا.

چوارەم: دووبارە زیندووبوونەوەی شونای ئیسلامیی شێوەیەکی ترە لە شێوەکانی گۆڕانە ژیارییەکان و دەتوانێت بەدیلێکی ژیاریی تێر و تەواو پێشکەش

بکات که ململانێی شارستانێتی ڕۆژئاوا بکات بێئەوەی ببێتە سەرچاوەی هەڕەشەی سیاسیی بۆی.

ئەو ڕووداوە سیاسییانەی لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا ڕوویاندا، ڕاستیی ئەو بۆچوون و پێشبینیانەیان سەلماند کە لە هەردوو توێژینەوەکەدا هاتبوون، چونکە کاتێك بریقەی تیۆری (گەشبینبوون بە ئایندە) دەستی کرد بە کاڵبوونەوە، بە تایبەتی لە ماوەی دوای جەنگی بۆسنە، کاتێك کەلەپوور و شوناسی ئیسلامیی لە ناوجەرگەی ئەوروپادا بە شێوازەکانی بەربەرییەت و لەناوبردنی ڕەگەزی وێرانکران، کەڵەکەبوونی ناهاوسەنگییەکانی سیستمی جیهانیی سەلماند، ئەو ناهاوسەنگییانەی کە بە دەستی شارستانێتیی ڕۆژئاوا ئەنجام دران، بێدەنگبوون و بێهەڵوێستی لە بەرامبەر پێشێلکارییەکانی (صربیا) دژ بە مافەکانی مرۆڤی موسڵمانانی بۆسنە، سەلماندی کە شارستانێتیی ڕۆژئاوا پێکەوەژیانی ئاشتیانەی نێوان فەرهەنگ و ژیارە جیاوازەکانی پشتگوێ خستووە، جگە لە کێشە و ناکۆکییە ناوخۆییەکانی نێوان ڕژێمە فەرمانڕەواکان کە بویە هۆی ئاگرسەندنی زیاتری ناکۆکییە سیاسییەکان و خراپبوونی بارودۆخەکان لە زۆرێك لە ناوچە جیۆسیاسییە هەستیارەکاندا.

لە ڕوانگەی ئەو دوو توێژینەوەیەوە، هەڵسام بە دووبارە دارشتنەوەیان وەك بەشەکانی ئەم کتێبە، ئەوەش قۆناغی سێیەمی ئامادەکردنی کتێبەکەیە. ئەگەرچی ئامادە کرابوو کە لە نۆڤەمبەری ١٩٩٢دا بڵاوبکرێتەوە، بەڵام دواخرا بە هۆی ڕیزبەندی هەندێ کار و ئەرکی تری خۆمەوە.

بەشی یەکەمی کتێبەکەم بە پیاچوونەوەیەکی ڕەخنەیی تیۆرەکانی (کۆتایی) دەست پێکرد، کە بانگەواز دەکەن بۆ کۆتایی ئایین و ئایدۆلۆژیا و مێژوو، مەبەستیشم لەم پیاچوونەوە ڕەخنەییە ڕاڤەکردنی ئەو چەمکە نادروستانەبوو کە مۆدێلێکی تازەگەریی پەیوەست بە ئایندەی مرۆڤایەتی لەسەر ڕاوەستاوە. دوای ئەوە لە بەشی دووەمدا گواستمەوە بۆ ڕووماڵکردنی قەیرانە ژیارییەکە، بە شێوەیەك

چوارچێوەیەکی تیۆریی بکێشێت بۆ بیرۆکەی سەرەکیی ئەم کتێبە، کە بریتییە لە داڕووخانی بلۆکی سۆشیالیستی وەك ئاماژەیەك بۆ هەبوونی قەیرانێکی ژیاریی گشتی و دەرهاویشتە کاریگەرەکانی. بەڵام بەشی سێیەم تیشك دەخاتە سەر هەوڵەکانی دووبارە ڕێکخستنەوەی پەیکەری نەگۆڕە فەلسەفییەکانی مۆدێلی ڕۆژئاوا بە مەبەستی زاڵبوون بەسەر ئەو قەیرانە ژیارییەدا، بەشی چوارەمیش دەرئەنجامە سیاسییەکانی ئەو گۆڕانکارییە ژیارییانە بە تێروتەسەل تاوتوێ دەکات.

لە بەشەکانی تری کتێبەکەدا هەڵساوم بە شیکردنەوەی هەڵوێستی جیهانی ئیسلامیی بەرامبەر ئەو گۆڕانکارییانە. بەشی پێنجەمیش بنەما و نەگۆڕە تیۆرییەکانی کاردانەوەی جیهانی ئیسلامیی بەرامبەر قەیرانە ژیارییەکە تاوتوێ دەکات. لە کاتێکدا بەشی شەشەم تیشك دەخاتە سەر گرێ فیکری و بونیادییەکان لە جیهانی ئیسلامییدا. هەروەك بەشی حەوتەم ڕۆشنایی دەخاتە سەر گرژی و (تحديات)ە سیاسییەکان لە نێوان ناوەندەکانی هێز لە سیستمی جیهانییدا و ڕۆڵی جیهانی ئیسلامیی وەك لایەنێك لە گرێ ژیارییە دوو ڕەهەندەکاندا کتێبەکە بە چەند سەرنجێك لە بەشی هەشتەمدا دوایی دێت.

لە کۆتاییدا دەمەوێ سوپاس و پێزانینی قووڵی خۆم ئاڕاستەی بەرپرسانی زانکۆی ئیسلامیی جیهانی لە مالیزیا بکەم لە پێش هەموویانەوە دکتۆر عەبدولحمید ئەبو سولەیمان و دکتۆر کەمال حەسەن و پرۆفیسۆر دکتۆر ئەنیس ئەحمەد، بە هۆی هاوکاری و پشتیوانییکردنیان بۆم بۆ پێشکەشکردنی توێژینەوەکە لە کۆنگرەی ساڵانەی توێژینەوە نێودەوڵەتییەکاندا، هەروەها حەز ئەکەم سوپاسی جوانی خۆم ئاڕاستەی دکتۆر أ.ف.بنشوای و دکتۆر عەبدوڵڵا ئیحسان و دکتۆر عەبدولڕەشید موتن و دکتۆر یوسف زیاو ئۆزگان بکەم بۆ بەشداریی بەسوودیان بۆم لە کتێبەکەدا، هەروەها سوپاسی تایبەتیم بۆ خاتوو سەکینە شارۆن نیدل کە هەڵسا بە نووسینەوەی دەقە ئینگلیزییەکەی بە شێوەیەکی زۆر ورد، هەروەها خۆم بە قەرزاری دکتۆر منەوەر ئەنیس و ئەحمەد ماهیر دەزانم کە ئەگەر هاوکاریی ئەوان

نەبوایە کتێبەکە ڕێگای چاپکردن و بڵاوبوونەوەی ئاسان نەبوو. دیسان سوپاس و پێزانینم بۆ برا و خۆشەویستم دکتۆر ئیبراهیم ئەلبەیومی غانم کە هەوڵی دا بۆ بە عەرەبیکردنی کتێبەکە بۆ خوێنەرانی عەرەبی زان لە میسر و وڵاتانی تر، ئەمەش ئاوات و خەونی لە مێژینەم بوو.

فۆكۆ یاما پێناسی مێژوو بەوە دەكات كە بریتییە لە: (هەوڵدانی مرۆڤ لەپێناو جێگیركردنی سیستمێكی سیاسیی جیهانیی پێكەوەگونجاو). لە سۆنگەی ئەم پێناسەیەوە جارێكی تر پێناسە هیگڵییەكەی مێژوو دووپات دەكاتەوە بەو پێیەی كە (بەرزبونەوەی مرۆڤە بۆ ئاستە باڵاكانی عەقڵانیەت و ڕزگاربوون...)، كە (دەگاتە قۆناغێكی كۆتایی لۆژیكی لە سەرەڕێی هێنانەدی تێگەیشتنی تەواو لە خود) (فۆكۆ یاما،١٩٩٢: ٦٤) فۆكۆ یاما هەوڵ دەدات بیسەلمێنێت كە هەوڵ و تێكۆشانی مرۆڤ لە كۆتایی نزیك بووەتەوە، چونكە دیموكراسی لە مۆدێلە ڕۆژئاواییەكەیدا كۆتایی بە مێژوو هێناوە، دوای ئەوەی دەستی كۆمەڵگەكانی گرتووە بەرەو ئازادی لە جیهانی هاوچەرخدا. جارێكی تر دەگەڕێتەوە و ئاماژە بە دەرئەنجامەكەی (هیگڵ) دەكات كە مێژوو لە دوای شەڕی (چینا لە ١٨٠٦)دا بە كردەوە كۆتایی پێهاتووە، چونكە (هیگڵ) ڕای وابوو كە (بنەماكانی ئازادی و یەكسانی كە دەوڵەتی لیبراڵی نوێیان لەسەر دادەمەزرێت بەو شێوەیەی كە لە دەوڵەتە زۆر پێشكەوتووەكاندا جێبەجێ دەكرێت، هیچ بنەما و پرنسیپێكی تری بەدیل بۆ ڕێكخستنی كاروباری سیاسیی و كۆمەڵایەتی لە لیبراڵیەت باڵاتر نییە) (١٩٩٢: ٦٤).

گریمانە بنەڕەتییەكەی (فۆكۆ یاما) لەسەر ئەو بیرۆكەیە دامەزراوە كە پێی وایە پێشكەوتن لە مێژوودا ڕێڕەوێكی ڕێكی بەرەوژووری هەیە. ئەم بیرۆكەیەش ڕەگەزی هاوبەشە لە نێوان فەلسەفەی هیگڵی و ماركسیزمدا. لەم ڕوانگەیەوە تیۆری فۆكۆ یاما تەنها دووبارە داڕشتنەوەی گریمانەكانی سەدەی نۆزدەهەمە. لێكهەڵوەشانەوەی مۆدێلی ماركسیزم جەختی لەسەر ئەوە كردۆتەوە كە ئەو گریمانانە پێویستە بخرێنە بۆتەی تاقیكردنەوەوە، ئەو دانراوانەی كە ئاڕاستەكانی دیموكراتییەتی لیبراڵی و سۆشیالیستی كلاسیكی بەرهەم هێناوە. فۆكۆ یاما دەڕوات بۆ ئەوەی كە جیاوازی (ماركس لە هیگڵ لە نەوعیەتی ئەو كۆمەڵگەیەدایە كە لە كۆتایی مێژوودا سەرهەڵدەدات) (١٩٩٢: ٦٥). (هەردوو ئاڕاستەكەی لیبراڵیزم و سۆشیالیزم پێكەوە یەك قۆناغ پێك دێنن) (١٩٩٢: ٦٦).

تێزی گەردوونی میکانیکیی نیوتن و توێژینەوەی مەعریفی بۆ تیۆری مەرکەزیەتی مرۆڤ لە گەردووندا و ئەخلاقیەتی عەقڵانی، هەموو پێکەوە بوونە بەردی بناغەی فیکری ڕۆژئاوایی لە سەردەمی ڕێنیسانسدا و ڕێگای ساز کرد بۆ خەیاڵدانی فەلسەفیی فیکری پێشکەوتنی تاکئاڕاستەی مرۆڤایەتی و کەشوهەوای ئامادە کرد بۆ سەرهەڵدانی دیموکراسی لیبرالیزم و مارکسیزمی کلاسیکی.

بەڵام لێك هەڵوەشانەوەی مارکسیزم تەنها هەڵوەشانەوەی بە دامەزراوەییکردنی لایەنی ئابووری و سیاسیی نییە بە واتا چینایەتییەکەی، بەڵکو هەڵوەشانەوەی ئەو بنەما فەلسەفییەیە کە لەسەری ڕاوەستاوە، ئەو بنەمایەی کە لە خاسیەت و بۆچوونە عەقائیدییەکانیدا هاوبەشە لەگەڵ فەلسەفەی دیموکراسی لیبرالیدا، هەربۆیە گەشەسەندنی ئابووری لە دەیەی هەشتاکاندا و بەجیهانیکردنی سیستمە ئابوورییەکانی سەرمایەداری نابێ مانای سەرکەوتن بەسەر مۆدێلی مارکسیزمدای لێ وەربگیرێت.

دەتوانرێت بوترێت کە تێزەکانی تیۆری کۆتایی دیاردەیەکە لە دیاردەکانی جیهانی ڕۆژئاوا، لە کاتێکدا کە ئەم تیۆرە شێوازێکی هاوچەرخی وەرگرتووە. پەنابردنی ئەم تیۆرە بۆ بەرهەمهێنانی چەند گریمانەیەکی سنوور فراوان بۆ دەستنیشانکردنی چارەنووسی مرۆڤایەتی، بەو سیفەتە قبوڵ دەکرێت کە ئەنجامێکی سروشتییە بۆ گریمانەکردنی ئارەزووی مرۆڤی هاوچەرخ بۆ کۆنترۆڵکردنی هێز و تواناکانی دەوروبەری کۆمەڵایەتی و لە خودی سروشتیشدا.

لەبەر ئەوەی شیکردنەوەی خاسیەتە فەلسەفی و دەروونی و مەنهەجییەکان و گرێکوێرەکانی ئەم ئاڕاستە فەلسەفییە لە بیرکردنەوە پێویستە، بۆ ئەوەی بتوانین کۆپیە هەموارکراوەکەی تیۆری کۆتایی لە نزیکەوە پشکنینی بۆ بکەین، لە ڕوانگەیەکی تیۆری و شیکاری و تاقیکاری لەلایەکەوە، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانین شیکردنەوەیەکی بەدیل بەرهەم بهێنین، بە مەبەستی هەڵسەنگاندنەوەی ئەو گۆڕانکارییە ڕیشەییانەی کە بەسەر سیستمی جیهانیدا هاتووە لە لایەکی ترەوە.

پرسیاری زۆر ئاڵۆز لە بارەی تیۆرەکانی کۆتاییەوە ئەوەیە کە ئایا ئەو تیۆرانە چەند پێشبینییەکی پشت بەستوون بە دیاردەیەکی کردەییەوە؟ یان تەنها چەند بۆچوونێکی خەیاڵین کە لەسەر چەند لادانێکی مەنهەجی ڕووکەش بنیاتنراون؟ لە حاڵەتێکدا ئەو تیۆرانە ڕاستی خۆیان بسەلمێنن وەك شیکردنەوە وردەکارییەکانی هەر دیاردەیەکی کردەیی، ئەوا پرسیارێکی تری جەوهەری دێتە ڕوو: ئایا بەڕاستی ئەو تیۆرانە دەتوانن وێناکاری و لێکدانەوەی ورد بۆ پرۆسەی بەرزبوونەوەی مێژوویی پەیوەست بە ڕەهەندی کات، شوێن پێشکەش بکەن؟ یان تەنها چەند ڕەنگدانەوەیەکی سادەیە بۆ واقع کە ڕووناکی دەخاتە سەر وردەکارییەکانی ناوخۆی پەیکەری گشتی بەو شێوەیەی کە (سی ڕایت میلز) بۆ تاقیکاری ڕووت پێناسەی دەکات (١٩٥٩: ٥٢)، شێوازی دووەمی شیکارییەکە هاوکاری ئەوە دەکات کە ڕەنگدانەوەیەکی جوزئی دیاردەیەکی کرداری پێشکەش بکات بە هۆی پشت بەستنی سروشتی خۆی بە ڕواڵەتە دەرەکییەکانی ڕەنگدانەوە کۆمەڵایەتییە سادەو تایبەتەکان بە ئەو پەیکەرە نموونەییەی کە هەیە، بەڵام دەرفەت نارەخسێنێت بۆ خستنەڕووی پرسیارەکان لە بارەی ئەو تێبینییەوە، لەسەر ئەو بنەمایە دەرەنجامەکانی ئەم شێوازە لە شیکردنەوەکان کارا و کاریگەر دەردەکەون لە کاتێکدا ئەو بنەما ئەخلاقییانەی کە ئەو مۆدێلەی لەسەر ڕاوەستاوە، باشترین شێواز بێت بۆ لێکدانەوەو دیاریکردنی چارەنووسی مرۆڤایەتی.

تیۆرەکانی کۆتایی هەر لە تێڕوانینە سەرەتاییەکانیدا چەندین بەڵگەی ماناداریان تێدایە لە بارەی گرێکوێرە مەنهەجیەکانییەوە دەتوانین بە سەرنجدانی وردی ئەو گفتوگۆیانەی کە تایبەتن بە ئایین و ئایدۆلۆژیا پشکنینی ئەو ڕاستییە بکەین، چونکە شیکاری وەصفی (کۆنت) لە بارەی پەرەسەندنی مێژوویی مەعریفەی ئینسانییەوە کە لاهوتی و زانستییە، هەروەها ڕاگەیاندنی (نیتشە) لە بارەی مردنی خواوە، وەك سەرکەوتنی کۆتایی تازەگەری و نیشانەیەك لەسەر کۆتاییهاتنی ئایین قبوڵکران.

بەپێی ئەو گریمانە بێت یان ڕاستتر ئەو خەملاندنانەی کە لە تیۆری کۆتاییەوە دەرهاتووە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە، ئەوا ئایین تەنها دیاردەیەکی قۆناغە سەرەتاییەکانی مەعریفە و هوشیاری ئینسانییە، بۆیە لە سەردەمی تازەگەرییدا هیچ ڕۆڵێکی نابێت، ئەگەر ئەو جۆرە پێشبینیکردنە ڕاست بێت، ئەوا هیچ بێداربوونەوەیەکی ئایینی لە ئایندەی مرۆڤایەتییدا ڕوو نادات، بەڵام ئەوەتا بێداربوونەوە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا – کلاسیکی و مۆدێرنەکانیش – ئەو بۆچوونە بێسەروبەرانەی پوچەڵکردووەتەوە، کە ڕۆژگارێك لە بوارە فیکرییەکەدا وەك ڕاستی حساب دەکران.

مشتومڕەکان لە بارەی کۆتایی ئایدۆلۆژیاوە لە دەیەی شەستەکاندا نموونەیەکی ترە بۆ ڕۆشنبوونەوەی ئەو ئیشکالیەتە مەنهەجییەیە، ئایا ئەوە هەوڵێك بوو بۆ وەسفکردنی دیاردەیەکی تاقییکاری ڕاستەقینە لە بارەی حاڵەتێکی کۆمەڵایەتی تێبینی کراو، یان نموونەیەکی دانراو بوو نوخبەیەك لە زانایانی کۆمەڵناسی کاریان لەسەر کردبوو بە مەبەستی دارشتنی تێڕوانینێکی کۆمەڵناسی نوێ بۆ خۆ لادان لە کێشە و ململانێ ناوخۆییەکانی سیستمەکەی ئەوکاتە؟ ئایا ئەو هەوڵە پێشەکییەك بوو بۆ ئامادەکردنی پەیکەرێکی تیۆری گشتگیر بۆ واقیعی جیهانیی؟ یان تەنها گوتارێکی بە زۆر ڕێکخراوە لە چوارچێوەی نموونەیەکی گشتگیرتردا و هەڵقوڵاوی حاڵەتی دەمارگیری شارستانێتی ڕۆژئاوایە بۆ مەبەستی پراگماتییانەی مامەڵەکردن لەگەڵ قەیرانی شەڕی سارددا؟ ئایا ئەو جەدەلیەتە تێڕوانینێکی کارای جیهانیی بەرهەمهێناوە بۆ چەمکی ئایدۆلۆژیا؟

لە واقیعدا دوای تێپەڕبونی زیاتر لە سێ دەیە بەسەر ئەو ماوەیەدا تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت، ئێستا لە هەلومەرجێکی باشتردایین کە بتوانین توێژینەوە لە بارەی ئەو پرسیارانەوە بکەین، وەك پێشەکییەك بۆ پەنجە خستنە سەر ئەو ئیشکالییەتە بنەڕەتییانەی کە ڕووبەڕووی تێزەکانی تیۆری کۆتایی بووەتەوە، لە سۆنگەی توێژینەوەکانی لە بارەی تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیاوە (ئەی– شیلز) ئاماژە بۆ ئەو

حاڵە دەکات کە لە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی لە بارەی (ئایندەی ئازادی) باس کرا، کە نزیکەی سەد و پەنجا نووسەر و سیاسەتمەدار و ڕۆژنامەنووس و مامۆستایانی زانکۆ تیایدا بەشداربوون و لە مۆزەخانەی نەتەوەیی بۆ زانست و تەکنەلۆژیا لە شاری میلانۆ لە سێپتەمبەری ١٩٥٥دا گرێدرا. ئامانج لەوکۆنگرەیە وەك (شیلز) دەڵێت: بریتی بوو لە ((بەهێزکردن و صافکردنی پرۆسەی توێژینەوەکانی بیروڕاکانی لیبراڵیزم و سۆشیالیزم بۆ دۆزینەوەی باکگراوندە هاوبەشەکانی نێوانیان و پێدانی گوڕو تینی زیاتر پێیان لەسەر ڕێگای دارشتنەوەی بیروڕای نوێ کە سروشتێکی زیاتری واقعبینانە و گشتگیرییانەی هەبێ، بەشێوەیەك بگونجێت لەگەڵ هەلومەرجی کۆمەڵگەی ئازاددا))، (شیلز،١٩٦٨: ٤٩) روونیشی دەکاتەوە کە لە کاتی چالاکییەکانی کۆنگرەکەدا (ڕیمۆن ئارۆن) ئاماژە دەکات بە هۆکارەکانی کێشە گەرمەکانی ئایدۆلۆژیا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کە تا ڕادەیەکی زۆر سنووردار کراوە، دوابەدوای ئەوەش (ئارۆن) ڕاڤەی زیاتری ئەم جەدەلیەتە لە کتێبەکەیدا بە ناوی (تلیاکی بیرمەندان) دەکات ئەوەش لە ڕوانگەی خۆیەوە بۆ ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیزم.

ئارۆن دەڵێت: (بیروهەستە نەتەوەییەکان ـ کە پێویستە هەروابێت ـ هەمیشە پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگە ئینسانییەکان بەهێز دەکات، ئەگەرچی ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیزم لەناو ئەوروپای ڕۆژئاوادا مەحکومە (لە قەفەسی تۆمەتبارکردندایە)، ئەو ئایدۆلۆژیایەی کە هەر لە پێشەوە دارشتنەوەیەکی ئاسایی دەخوازێت بۆ ڕاستییەکان و لێکدانەوەکان و ئارەزووەکان و پێشبینییەکان، بۆیە ئەرکی سەرشانی هەر بیرمەندێك کە بیەوێت بڕوا بە ناسیۆنالیزم بهێنێت کە مێژوو بەشێوەیەك لێك بداتەوە کە بریتییە لە خەباتی بەردەوام دژ بە وەحشیگەری، یان پێشبینیکردنی ئاشتییە لە نێوان نەتەوە سەربەستەکاندا لەسەر بنەمای ئاڵوگۆڕکردنی ڕێز، بەڵام ئەم تێکەڵکردنەی نێوان ناسیۆنالیزمی شۆڕگێڕانە و دبلۆماسیەتی مەکیاڤیلیانە کە

(چارلز موراس) بەرگری لێ دەکات، سەرکەوتوو نەبوو لە هەڵگیرساندنی پشکۆی ڕابوونی ناسیۆنالیزم لە دەوڵەتە ئەوروپییەکاندا)) (١٩٦٨: ٢٩).

لێرەدا دەتوانین سێ خاسیەتی واتادار دەربهێنین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گرێکوێرە تیۆری و مەنهەجیانەی کە دووچاری تیۆرەکانی کۆتایی هاتووە:

یەکەم: ئەو گریمانە لەدەیەی شەستەکاندا لە چوارچێوەیەکی سنووردار‌دا بەردەوام بوو، بەڵام ڕاستگۆیی ناوەڕۆکەکەی تەنها لە ناو ئەوروپادا بوو، بەبێ ئەوەی ئاشتی جیهانیی بڵاوبکرێتەوە، دوو دەیەکەی تری دوای شەستەکان بەردەوامبوونی خەباتی ناسیۆنالیزمی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا خستەڕوو، ئەو بوومەلەرزە سیاسییەی کە لە دوای هەڵوەشانەوەی سیستمی سۆشیالیستی ئەوروپای هەژاند، بە هەموو تیۆرەکانیەوە کە پەرۆش بوو بۆ داڕشتنەوەی چارەنووسی مرۆڤایەتی لەسەر بنەمایەکی مارکسیزم، یان لەسەر چەند بنەمایەکی ناکۆك لەگەڵ مارکسیزمدا، جگە لەوەش ئەو دابەشبوونە سیاسییانەی کە ڕووی کردە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و بە تایبەتی لە یوگسلافیا و دووبارە داگیرسانەوەی شۆڤێنیزم لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، بە تەواوی ئەگەری جێبەجێبوونی ئەو تیۆرەی لە ناو ئەوروپادا شکست پێ هێنا.

دووەم: ئەو تیۆرە ئامانجی تەنها ئەوەندە نەبوو کە ئایدۆلۆژیای سەردەمی کۆلۆنیالیزم بە ڕەوا دابنێت، بەڵکو هەوڵی ئەوەشی ئەدا بۆ داڕشتنەوەی گوتارێکی سیاسیی نوێ لە ماوەی دوای جەنگی جیهانیی دووەمدا، بەلەبەرچاوگرتنی چەند بەهایەکی گرنگ کە لە پێشەوە دیاری کرابوون، وەك پێشەکیەك بۆ دروستکردنی ژینگەیەکی سیاسی نوێ لەسەر هەردوو ئاستی نەتەوەیی و نێو دەوڵەتی.

سێیەم: خاسیەتی سێیەمی ئەو تیۆرە لە سەرئەنجامە سروشتی و لۆژیکییەکانی ئەو داڕشتنە ژێربەژێرییەدایە، واتە تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیا کە ((خۆی بۆخۆی گوتارێکی ئایدۆلۆژیای ڕووکەش کراوە و چوارچێوەیەکی مەرجەعیشە لەهەمان کاتدا، بەتاڵکردنەوەی ژیانی فیکری و سیاسی لە ئایدۆلۆژیاکان، دانانی کۆمەڵەیەکی

تری بەهاکان دەخوازێت کە ببنە بنەما بۆ ئایدۆلۆژیایەکی نوێ، ڕاستە کە سفر هیچ بەهایەکی ئیجابی، یان سەلبی تێدا نییە، بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە سفر هیچ بەڵگەیەکی نەبێت بۆ خۆبەدوورگرتن لە هەر ڕەخنەیەك لەو ڕوانگەیەوە. لایەنگرانی تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیا هەوڵیاندا کە چەمکی ئایدۆلۆژیا سنووردار بکەن لە چوارچێوەی پێناسەی (مانهایم) بۆ بیرکردنەوەی یۆتۆپیانە، لەگەڵ ئەوەشدا گفتوگۆکەی (هابەر، ١٩٦٨: ٢٠٥) ڕووەکەی تری هەمان پارەیە کە دەڵێت: کۆتایی ئایدۆلۆژیا نزیکە لە داڕشتنەوەیەکی ئایدۆلۆژیانەی بارودۆخەکە بە مەبەستی پاساودانی تێکەڵکردنی بیرمەندەکان لەگەڵ شێوازی ئەمریکییانەدا بۆ ژیان).

بەهەرحاڵ پرسیاری تیۆری و مەنهەجی بنچینەیی دەربارەی تیۆری کۆتایی مێژوو هەمان پرسیارە کە پێشتر ڕووبەڕووی تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیاکراو، ئەوەکە: ئایا تیۆرێکی تاقیکارییە و دەتوانرێت سیفەتی بابەتیبوونی پێ بدرێت، یان تەنها فۆرمێکی تری بە ئایدۆلۆژیکردنی قۆناغەکەیە؟ ئەو پرسیارەی کە پەیوەستە بە بابەتیبوونی تیۆرەکەوە بە ڕاستی پرسیارێکی تەواو گرنگە لەم ڕوانگەیەوە، چونکە تیۆرەکانی تری کۆتایی لە تەقەلای ئەوەدان کە پێناسەی نوێ بۆ ئایین و ئایدۆلۆژیا و مێژوو دابهێنن، ئەو تیۆرانەن کە تا ڕادەیەکی زۆر پشت بەستوون بە ئەزموونی مەسیحیەتی ئەوروپا، کە ئەزموونێکی سنووردارە لە چوارچێوەیەکی کات و شوێنی دیاریکراودا و لەو ڕوانگەیەشەوە بەشدارە لە پێکهێنانی هەلومەرجی ئێستای ئەوروپادا بە هۆی نەگۆڕە فیکری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە.

تیۆری مۆدێرنێتەی (کۆنت) دەگەڕێتەوە بۆ مەسیحیەتی دوای (کانت) لە ئەوروپادا کە ڕووبەڕووی قەیرانێکی ڕاستەقینە بوویەوە لە ژێر کاریگەرییەکانی مۆدێرنێتە و بنەما گەردوونی و بەها مەعریفییەکانیدا، ئەم تیۆرە ڕەنگدانەوەی ئاڕاستەی ڕیفۆرمخوازی لاهوتی مەسیحیەت بوو، کە مەودای زاتییەت و تاقانەیی خۆی وەك ئەزموونێکی ئایینی خستەڕوو کە پەیوەستە بە نەگۆڕە بنەڕەتییەکانی تایبەت بە بیرۆکەی خوایەتی سنووردار و لاهوتی ئەخلاقییەوە.

دوا بەدوای ئەوە ئەو گۆڕانکارییە بوویە خاڵی دەستپێکی فۆرمی مۆدێرنێتە بۆ تیۆری کۆتایی ئایین، ئەو گۆڕانکارییەی کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینەکان و کۆمەڵگەکانی ترەوە نییە، بۆ نموونە ئیسلام، هەمیشە هۆکاری گەورەی زۆربەی پەرەسەندنە فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی ئیسلامیی بووە لە هەمان سەدەدا، ئەو ڕەهەندە دینامیکییەی کە لە ئایینی ئیسلامدایە پرۆسەیەکی ژیانەوە و نوێبوونەوەی بەخۆوە دی بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، هەروەها ڕیفۆرمە ئایینییەکانی ئەمدواییەی ئایینی مەسیحیەتیش پووچەڵیی ئەو پێناسەیەی خستەڕوو کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بۆ ئایین دانرابوو.

سەبارەت بە تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیاش بەهەمان شێوە کەوتە ژێر کارتێکردنی خوێندنەوەی نابابەتیانەی مەسەلەکەوە لە پرۆسەی فۆرمەلەکردنەوەی پێناسەی ئایدۆلۆژیادا، ڕیمۆن ئارۆن دەڵێت: (ئەگەر من لیبرالیزم یان سۆشیالیستی، پارێزکار بم یان مارکسیزم، ئەوا ئایدۆلۆژیاکان کەلەپوورێکی قۆناغێکن کە ئەورووپا گرنگی فرەیی درك دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ گومانێکی هەبێ لە جیهانیبوونی پەیامەکەی خۆی). ئەم قسەیە ئەو تایبەتمەندێتییە بنەڕەتییە ڕوون دەکاتەوە کە تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیا جیادەکاتەوە، بۆیە جیاوازیی چینایەتی لە نێوان شێوازەکانی ئایدۆلۆژی و ڕیفۆرمخوازی قوتابخانە فیکری و سیاسییەکاندا کە لەسەردەستی تیۆریستەکانی کۆتایی ئایدۆلۆژیا پەرەی سەندووە ڕۆڵی ناوازەیان هەبووە، ئەو ڕۆڵانەش نموونەی فرەیین لەناو خودی تێڕوانینی ئەورووپیانە خۆیدا، هەربۆیە بەجیهانیبوونی پەیامی ئەورووپایی کە ئاڕاستەی فراوانبوونی سیاسیی دروست کرد لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمدا، ڕووکەش بوون و فرەییە درۆینەکەی شارستانێتی ڕۆژئاوای خستە ڕوو، ئەمە لەکاتێکدا کە نوخبە فیکری و ڕیفۆرمخوازە پەراوێزخراوەکانی کۆمەڵگە نائەورووپییەکان هیچ جووڵەیەکیان لێوە نەهات، جگە لە خۆخەریککردن بە جەدەلیاتە تیۆری و کردەییەکانی بەپێی ڕیزبەندییە سەرەکییەکانی خۆیان، ئەم دیاردەیە ئیشکالیەتێکی کردەیی هێنایە کایەوە لە بارەی شەرعیەت لەو

کۆمەڵگایانەدا، هەروەها بوو بە هۆی لەدایکبوونی ململانێ لە نێوان بەجیهانیبوونێکی بەزۆر سەپێنراو بە سەریاندا لە لایەکەوە، لەگەڵ فرەییەکی رووکەشی کە شارستانێتی ڕۆژئاوا بانگەوازی بۆ دەکات لە لایەکی ترەوە.

ئەو تێڕوانینە لایەنگیرەی کە دووچاری تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیابووە، دەتوانین لەبارەی تیۆرە نوێکەی تایبەت بە کۆتایی مێژووش تێبینی بکەین، دەبینین کە فۆکۆ یاما بە شێوەیەك سەیری مێژووی مرۆڤایەتی دەکات، هاوشێوە و ئاڕاستەیەکی دیاریکراوی هەیە (١٩٩٢: ٧)، بۆیە لە یەکچوونێك لە نێوان شوناسی مرۆڤایەتی و شوناسی مێژوو بەگشتی و شوناسی شارستانێتی ڕۆژئاوادا دادەنێت، بەوەش هەرئەوەنییە کە ڕۆڵی بنیاتنەرانەی شارستانێتییەکانی تر لە مێژوودا فەرامۆش دەکات، بەڵکو چاو لەوەش دەنوقێنێت کە ئەو شارستانێتیانە لە ئایندەدا بتوانن هیچ بەدیلێکی تیۆری، یان کردەیی بهێننە کایەوە، لە کاتی شیکارکردنی کۆمەڵگە ناڕۆژئاواییەکاندا فۆکۆ یاما بۆ ئەوە دەچێت کە ئەو کۆمەڵگایانە هیچ ڕۆڵێکیان نییە جگە لەوەی کە تەنها گۆڕاوی پاشکۆن، یان ئامانجن بۆ فراوانبوونی بەهاو دامەزراوە ڕۆژئاواییەکان، هەروەها تیۆرە کورتکراوەکەی سنوورێکی کات و شوێن بۆ ڕەگەزی مرۆڤ دەکێشێت، بەوپێیەی کە ئەزموونی شارستانێتی ڕۆژئاوا بە شێوەیەکی ڕەها جیهانییە، بەم شێوەیە سەیر دەکەین کە شیکردنەوەکەی هەمان ئەو خەسڵەتانەی تێدایە کە لە تیۆرەکانی پێش تیۆری کۆتاییدا هاتوون، وەك ئەوەی کۆپیی جیاواز بن بۆ نموونەی مۆدێرنێتە.

لەگەڵ هەبوونی هەندێ جیاوازی مەنهەجی و زاراوەیی لە ڕوانگەی نموونەی مۆدێرنێتەوە، گۆڕانکارییە ژیارییەکان لە فۆرمە ئایدۆلۆژییەکەی هەلومەرجی ئێستادا لەگەڵیا بەشدارن، چونکە پەیوەندییەکی بەردەوام هەیە لە نێوان ئەو تیۆرانەدا لە چوارچێوەی پرۆسەی دروستکردنی سەرمایەداری مادیگەرادا، دیارە کە ڕەفتاری ئاسایی کۆمەڵگەی بەکاربەری مادی گەرا، نەگونجاوە لەگەڵ بیرۆکەی بەختەوەری هەمیشەیی کە هەڵقوڵاوی ڕێنماییە ئایینییەکانە، بۆیە تیۆری کۆتایی ئایین لە هەوڵی

پەراوێزخستنی هەموو ئەو شتانەیە کە تایبەتن بە ڕۆحانیاتەوە، وەك پێشەکییەك بۆ یەکخستنی ڕەفتاری مرۆڤەکان و لەقاڵبدانیان بەیەك شێوە، لەکاتێکدا کە ئایدۆلۆژیاکان کاردەکەن بۆ پەرەپێدانی فۆرمێك لە ڕەفتاری میسالی لە بری هەستە ئایینییەکان، تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیا لە هەوڵی ئەوەدایە ڕموزی نوێ بۆ مرۆڤی ڕیفۆمخواز بتاشێت کە بە شێوەیەکی ئیجابی پابەندبوونی هەبێ بە بەهاکانی سەردەمەوە، ئەو بەهایانەی کە لە مێژوودا بە سیستمی: ((خۆشگوزەرانی سەرمایەداریی ناسراوە)) (هابر، ١٩٦٨: ٢١٠)، لە ڕاستیدا تیۆری کۆتایی مێژوو هۆکارێکی بەرگریکار لە مۆدێرنێتەی شارستانێتی ڕۆژئاوا، دژ بە بەرەنگاربوونەوەکانی قەیرانە ژیارییەکان دێتە کایەوە، لە بری ئەوەی کە ڕواڵەتە جیاوازەکانی پەیوەست بە ژینگە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکە لەبەرچاو بگرێت، کە هەڕەشە لەسەر ئاشتی و سەقامگیری ڕەگەزی مرۆڤ دروست دەکەن، ئەو مەسەلەی کە بۆی هەیە مرۆڤی ئەم سەردەمە بکاتە خاوەن بەختەوەری، چونکە قۆناغی کۆتایی مێژووی مرۆڤایەتی دەبینێت و شانازیش بەوەوە دەکات کە دەبێتە بەشێك لە بینای کۆتایی دەزگایەکی حکومەتی و هەست بە ڕەزامەندی دەکات، دوای ئەوەی کە خەریك بوو لە کۆتایی ڕێگای پەرەسەندنی ئایدۆلۆژی مرۆڤایەتییدا ڕاوەستێت.

بەڵام ناڕوونی بنەڕەتی تیۆرەکانی کۆتایی ئیشکالیەتێکی مەعریفییە کە گرنگی ئەدات بە بنەما کۆمەڵایەتییەکانی مەعریفە و سەردەکێشێت بۆ تەنگژەیەکی ڕاستەقینە لە تێگەیشتنی ڕاستییە بەردەوامەکانی مێژوو، ئەوەتا هیگڵ لە کتێبەکەیدا بەناوی (زانستەکانی لۆژیك) چەمکی ڕاستی بەوە پێناسە دەکات کە بریتییە لە: ((یەکێتی نێوان جەوهەر و بوون، یان دڵ و جەستە)) (١٩٢٩ بەشی دووەم: ١٦٠). دەکرێ ئەم واتایە بکرێتە خاڵی دەستپێك بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەو گرێیە، چونکە گوڕ و پاڵنەری سیاسی بۆ پەرەپێدانی تیۆرەکانی تایبەت بە کۆتایی وەك فۆرمێکی ئایدۆلۆژی هەلومەرجی ئێستا، تێڕوانینێکی تایبەت بۆ تێگەیشتن لە ڕاستییەکانی مێژوو بەرهەم دەهێنێت، ئەم دەروازە مەنهەجییە سەردەکێشێت بۆ

فەرامۆشکردنی ناوەرۆکی قووڵ و واقیعی ئەو ڕاستیيانە، یان بۆ کورتکردنەوەی جەوهەری بەردەوامێتی مێژوویی بۆ تەنها فاکتەرێکی سادە وەك ئەوەی لە تێزەکەی فۆکۆ یامادا هاتووە، کە پشت بەستووە بە بیرۆکەی ململانێ لە پێناو جیاکارییدا، هەروەك فەرامۆشکردنی جەوهەر سەردەکێشێت بۆ دەرکەوتنی لێکدانەوەیەکی بونیادی پەسەند کراو، بەڵام کورتکردنەوە بۆ تەنها هۆکارێك، دەبێتە هۆی پەیدابوونی تیۆرێکی مێژوویی پەرگیر لە گشتاندندا. ئەم دەروازە پراگماتییە ڕەنگە ببێتە هۆی دانانی تیۆرێکی مێژوویی حەتمی سنوور فراوان، لە حاڵێکدا کە تەنها یەك هۆکاری سادە بەس بێت بۆ داڕشتنی پێناسێکی خەسڵەتی دەرەکی ئەو دیاردەیە.

لێرەدا دوو ئەنجامی سروشتی ئەو خەسڵەتە دێتە کایەوە: یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو وێناکردنە دەبێتە هۆی لێکدانەوەیەکی یەکجار وەسفی بۆ ڕابردوو مێژوویی، وەك ئەوەی لە شیکردنەوەکەی (کۆنت)دایە، یان پێشینەیەکی ڕەهای لە ڕادەبەدەر بۆ چارەنووسی مرۆڤایەتی وەك ئەوەی لە تێزەکەی فۆکۆ یامادا هاتووە لە بارەی وێناکردنی بۆ تیۆری کۆتایی مێژوو، بەڵکو فۆکۆ یاما زیادلەوەش دەڕوات کە بنەما مەنهەجییەکانی هیگڵ بۆی ڕۆیشتوون، ئەگەرچی فۆکۆ یاما بەردەوام ئاماژە بە هیگڵ دەکات لە شیکردنەوەکەیدا، چونکە هیگڵ سوورە لەسەر ئەوەی کە پێویستە لەسەر فەلسەفە کە خوێندنەوەی شتێك بکات کە لە خۆیدا دیاری کراوە لە جیهانی واقیعی دا، لە بری لێدەرهێنانی بۆچوون و پێشبینیکردنی ئایندەی مێژوو لەسەر بنەمای ئەگەرەکانی کە زۆرجار تووشی لایەنداری شەخسی دەبن. هیگڵ دەڵێت: تەنها ڕێبازی ڕێکخراوە کە شایانی شوێنکەوتن بێت و توێژینەوەی فەلسەفییانە بتوانێت پشتگیری بکات، وەرگرتنی مێژووە لەو شوێنەوە کە عەقڵانیەت دەست پێ دەکات لە دەرکەوتەی ڕەفتاری کردەیی کاروباری جیهاندا، نەك تەنها کاتێك ئەگەرێکی ناپێگەیشتوو بێت. (١٩٩٠: ١٨٩)، بەڵام ئەنجامی دووەم ئەوەیە کە وێنەی ئاسایی و سادە بۆ نیشانە ڕواڵەتییە بینا کۆمەڵایەتییەکان بەرهەم دێنێت و پاشان دەبێتە هۆی جۆرێك لە دابڕان، بۆ نموونە گریمانەی پێشوەختەی سەرکەوتنی

کۆتایی لیبرالیزمی دیموکراسی سەرمایەداری وەك نموونەیەکی مێژوویی دابڕاو لە نیشانە ڕواڵەتییەکانی تیۆری کۆتایی مێژوو دێت. ڕەنگە ببێتە هۆی چاوپۆشیکردن لە بارگرژییە نەتەوەییەکان و ئاڕاستە دەمارگیرییە ناعەقڵانییەکان لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا. تێزەکەی فۆکۆ یاما سەرکەوتنی میکانیزمەکانی سەرمایەداری و هەڵوەشانەوەی سۆشیالیزم لە دوو گرووپی تەواو جیاوازدا پۆلێن دەکات، وەك ئەوەی کە گۆڕەپانی جەنگێك بێت و فۆکۆ یاما شیکارەکەی لەسەر بیناکردووە و زمانحاڵیشی دەڵێت مێژوو بە کۆتاییهاتنی جەنگەکە دوایی دێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە شوێنەکە جێگای ڕیزکردنی خاڵە لاوازەکانی لایەنی سەرکەوتوو، یان تەنانەت پاڵنەرە هاوبەشەکانی لە پشت ئەو جەنگە نابێتەوە، بەڵام ڕاستییە مێژووییەکانی ماوەی پێش جەنگەکە بەردەوام شایانی لێکدانەوەیە لە ڕوانگەی دەرونی لایەنی سەرکەوتووەوە، هەروەك بارودۆخە پەیدابووەکانی ماوەی دوای جەنگەکە لەوانەیە بەوە لێکبدرێتەوە کە هۆکاری نەگۆڕن و خراونەتە ژێردەستی لایەنی سەرکەوتوو، بێگومان نموونەی ئەم وێناکردنە شیکردنەوەیەکی ڕێك و پێك بۆ خودی دیاردە کردەییەکە پێشکەش ناکات، هەروەها پێشنیازێك بۆ سیستمێکی پراگماتیکی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە پێشکەش ناکات و تیۆرێك بۆ دۆزینەوەی ئەوکۆسپ و تەگەرانەی ڕووبەڕووی ئایندەی مرۆڤایەتی دەبێتەوە دانانێت.

پشت بەستن بەوەی پێشەوە داڕوخانی سۆشیالیزم نابێ بەجیا لەو پرۆسە مێژووییە لێك بدرێتەوە کە لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە دەستی پێ کردووە، کە زاڵ بووە بەسەر سیانە سحریەکەی (عەقڵ – زانست – پێشکەوتن)دا، چونکە ئەزموونی خستنەخوارەوەی بۆمبی ناوکی بەسەر هیرۆشیمادا لایەنی ڕووخێنەری زانستی ئاشکرا کرد، دوای ئەوەی کە پێشتر تەنها لە یەك گۆشە نیگاوە سەیر دەکرا کە جووڵێنەری سەرەکییە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، میکانیزمەکانی سەرمایەدارییش دووچاری ڕەخنەی توند بوونەوە چونکە هۆکار بوون بۆ نامۆبوونی مرۆڤ لە ماوەی شەستەکاندا، هەروەك کارەساتی هیرۆشیما پاڵنەرێك بوو بۆ گرێدانی

کۆڕپەندی کلێساکانی سەر بە ڤاتیکان بۆ جاری دووەم لە نیوەی یەکەمی شەستەکاندا شان بەشانی بەرپابوونی بزاڤی تەواوکاریی ئەوروپایی و بەجێهێنانی گەشەکردنی ئابووریی لە دەوڵەتەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی لە هەمان ماوەدا. هەموو ئەو ڕووداوە یەکبەدوای یەکانە پێویستە بکرێنە بەرنامەی توێژینەوەی لەسەرخۆ، بۆ ئەوەی بتوانرێت لێکدانەوەی گۆڕانکارییە ڕیشەییەکان بکرێت کە بەسەر سیستمی جیهانیدا هاتووە، لە قۆناغی دواتردا. هەموو ئەو ڕووداوانە لەگەڵ داڕمانی سۆشیالیزمدا ڕەنگدانەوەن بۆ پرۆسەیەکی گۆڕانکاری ژیاریی زیاتر فراوان و گشتگیرتر، هەربۆیە داڕووخانی سۆشیالیزم بەهیچ شێوەیەك سەرکەوتنی کۆتایی نییە بۆ دیموکراسیەتی لیبراڵیزم و ئابووری سەرمایەداری، بەڵکو ڕاستتر ئەوەیە کە ئەو سەرکەوتنە لە سنووری سەرکەوتنێکی ڕێژەیی دەرنەچێت، هەروەها ئەو دیاردەیە پێویستە لە چوارچێوەی پرۆسەی گۆڕانکاری مێژوویی بەردەوامدا هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت.

ئەم کتێبەی کە لە بەردەستماندایە بەڵگە پێشکەش دەکات کە ئێمە ئەمڕۆ سەرگەرمی ڕووبەڕووبونەوەی قەیرانێکی ژیاریی بەربڵاوین لە دوای پەیدابوونی چەندین حاڵەتی تێکچوون و ناهاوسەنگی کە دووچاری بنەما پێکهێنەرەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا بووەتەوە، بەڵام بێگومان ئەوە بەو مانایە نییە کە ئێمە ئاماژە بکەین بە کارەساتێکی ئابووری لەناکاو، یان پشێوییەکی جیهانیی لەسەر ئاستی سیاسی لە ئایندەیەکی نزیکدا، هەموو ئەوەی کە دەمانەوێت جەختی لەسەر بکەینەوە ئەوەیە کە حاڵەتی هاوسەنگی هەستیار لەهەر یەك لە پەیوەندی ((مرۆڤ بە ژینگە)) و ((مرۆڤ بە مرۆڤی برای خۆی))، هەروەها پەیوەندی ((مرۆڤ بە تەکنۆلۆژیا))وە، ئەم هاوسەنگییە لە حاڵەتێکی جووڵەی بەردەوامدا دەبێت، تێزەکەی ئێمە لەوە زۆر وردتریش دەڕوات، چونکە هەوڵ دەدەین بۆ سەلماندنی ئەوەی کە گەشەکردنی ئابووری مەرج نییە ڕەنگدانەوەی هاوسەنگی ژیاریی بێت و گەرەنتیش بۆ مانەوەی دەستەبەر ناکات.

تا ڕادەیەکی زۆر کاردانەوەکان هاوتەریب هاتوون لەسەر هەریەك لە میکانیزمی ئابووری سەرمایەداری کە لە دەیەی شەستەکاندا تەشەنەی کردبوو، هەروەها میکانیزمی سیاسی سۆشیالیستی بیرۆکراتی لە دواییەکانی دەیەی هەشتاکاندا لەسەر دەستی بزاڤە جەماوەرییەکان. ئەو کارەی کە ئاماژە دەکات بۆ بەردەوامبوونی هەوڵی مرۆڤ بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیدا، دیسان ئاماژەشە بۆ ئەوەی کە ئەو هەوڵانە چەندە ڕەهەندێکی وێناکاری و فەلسەفی هەیە، هەروەها ڕەنگدانەوە دەزگاییەکانی ئەو گەڕانەش بە شێوەیەکی بنەڕەتی پەیوەستە بە سیستمە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە.

ئەگەر بەشێوەیەکی قوڵتر بگەڕێین بەناو سەرچاوە فەلسەفی و دەروونییەکانی ئەو هەوڵ و گەڕانەی مرۆڤدا، ئەوا لە تواناماندا دەبێت کە ڕاستییەك دەرەنجام بکەین کە ئەو هەوڵانە تەنها بۆ دۆزینەوەی سیستمێکی سەرکەوتوو بۆ چەمکە ئابووریی و سیاسییەکان نییە و بەس، بەڵکو هەوڵدانە بە دوای تێگەیشتنێکی قووڵتر بۆ بەها وجودییەکانی پەیوەست بە قەوارەی مرۆڤەوە و ئەوەش بۆ زامنکردنی ئازادی و سەلامەتی تاکەکانە لە بەرامبەر هەیمەنەی پەیکەرە تەکنیکییەکانەوە، کە دەبنە هۆکاری تەشەنەکردنی هەستێکی گشتی بە نامۆبوون، هەربۆیە ڕاگەیاندنی کۆتایی مێژوو بەو مانایەی کە کۆتایی پەرەسەندنی فیکری ئینسانی بێت، لە بابەتی داواکارییە سوفساتییەکانە بۆ چەند نەگۆڕێکی پڕووپووچ کە وێنای ڕووخانی سۆشیالیزم بەشێوەیەك دەکات گوایە سەرکەوتنی کۆتاییە بۆ بەهاکانی دیموکراسی لیبراڵیزم، بۆیە لەسەرمانە کە هەڵسین بۆ بەرگریکردن دژی داخوازی هەیمەنەی تاك ڕەهەند لە لایەن نموونەی ڕۆژئاواییەوە. لەڕاستیدا ئێمە لە هەوڵی ئەوەداین کە بیسەلمێنین بەڵگەی ڕاستەقینە لەسەر بوونی هاوسەنگی ناوخۆیی بۆ هەر شارستانێتییەك، خۆی لە پێکەوەگونجانی وێناکردنە دەرونی و کۆمەڵایەتییەکان و چۆنێتی بە یەکداچوونی لەگەڵ سیستمە ئابووری و سیاسییەکاندا دەنوێنێت.

چەمکی (هوسرل) ئیدراکی زاتی پەیوەندیدار بە وێناکردنی دیاریکراوی نموونەیەکی شارستانی و پەیوەستبوونی بە شوێنی تاك لە پەیوەندی نێوان منی تاك بە ژیانی جیهانەوە (Lebenswelt)، ئەو چەمکە دەکرێ چەمکێکی وێناکاری پەیوەست بە سەقامگیری ناوخۆیی و مەودای پێکەوەگونجانی لەناو ژیارەکە و پلەی هاوسەنگییەوە دەبێت. ئەم چەمکەی کە (هوسرل) دایناوە ئەرکێکی تایبەت دەخاتە سەرشانی مرۆڤی مۆدێرنێتەی ڕۆژئاوا لە سۆنگەی ئەم وێناکارییەوە، دەگونجێ نموونەی ئەم هەستکردنە بە هۆشیاری لە ڕوانگەی (درکپێکردنی خودی)یەکەی پێشوو باسکراو لە پرۆسەی پەرەسەندنی هەموو شارستانێتییەکاندا ڕەچاو بکرێت، بەڵام خەسڵەتی زیاتر گرنگی خەسڵەتە ژیاریەکان لەناو بەدیلە (درك پێکراوە خودی)یەکاندا خۆی حەشارداوە، درك پێکردنێکی خودی ڕۆشن و کاریگەر دەتوانێت خێرایی بدات بە کردەی هاندانی دەروونی تاکەکان هەروەك هاوکار دەبێت لە دامەزراندنی پەیوەندییەتی تێر و تەواو لە نێوان درککردنی ئەندێشەیی و ژینگەی کۆمەڵایەتیدا.

کێشەی سەرەکی لە کۆمەڵگە سۆشیالیستییەکاندا بریتی بوو لە ئامادەنەبوونی ئەو پەیوەندییە پێکەوەییە، ڕەنگە هۆکاری ئەوەش ئەوە بووبێت کە ئایدۆلۆژیای سۆشیالیزم چالاکییەکی دینامیکی تەنها کاتێك دەستەبەر دەکات کە وێناکردنە تاکی و کۆمەڵایەتییەکان لە حاڵەتی هاوسەنگیدابن، کاردانەوەکانی کردە کۆمەڵایەتییەکان دەگاتە قۆناغێکی گڕدانی بێسنوور، لە کاتێکدا تاك دەست بکات بە دۆزینەوەی ئەوەی کە درك پێکردنی خودی ناکۆکە لەگەڵ پێکهاتە بیرۆکراتییە لە یەکتردابڕاوەکان و بەستراوەکان تا ڕادەیەکی گەورە. لەلایەکی ترەوە کاتێك هەوڵ دەدەین بە قووڵایی کۆمەڵگە سەرمایەدارییەکاندا بچینە خوارەوە لەم ڕوانگەیەوە، ڕەچاوی ئەوەش دەکەین کە داننان بە ڕادەی ڕاستی و سەقامگیری ئەم نموونە لە پێکەوەنووسان لە نێوان تاك و وێناکردنە کۆمەڵایەتییەکان و ڕادەی هاوسەنگییان گەلێك گرانە، هەر بەو شێوەیە دەتوانین ڕاوەستین لەسەر ئەم خەسڵەتانە لە

سۆنگەی کاردانەوەکان بەرامبەر میکانیزمی بازاڕ لە جیهانی سەرمایەدارییدا، بۆیە ناچار دەبین کە دان بەوەدا بنێین کە مرۆڤی ڕۆژئاوایی ئەویش توانای ئیدراکی زاتی لەدەست داوە، هەروەها ئەو دیاردەیەش مەترسی ڕوودانی قەیرانێکی گۆڕانکاری ژیاریی بەدواوەیە، زیاتر لەوەی کە ئاماژە بێت بۆ نزیکبوونەوەی ڕوودانی کۆتایی مێژوو، هەروەك فۆکۆ یاما لە تێزە بەناوبانگەکەیدا بۆی چووە و هەواڵی لە بارەوە داوە.

مێژوو هێشتا کۆتایی پێ نەهاتووە، هێشتا ڕێڕەوەکانی لەقۆناغی ژیاندایە بەئاڕاستەی هاوسەنگی بوون.

**أ- نەمانی ئاسایشی بوون و نامۆبوونی هوشیاریی تاکەکەسی لە سەردەمی پیشەسازییدا:**

ئامانجی سەرەکی مرۆڤ بە درێژایی مێژوو ـ تائێساشی لەگەڵدا بێت ـ ئەوەبووە کە ئازادی و ئاسایشی بوونی ڕەها بێنێتەدی و هەرگیز گوێی بەوە نەداوە کە داخۆ ئەو ئامانجە شیاوی بەدیهاتنە یاننا، هەمیشە بە دەزگاییکردنی هەریەك لە سیستمە ئابوورییەکان و سیاسییەکانی بە لاوە هۆکارێکی پەسەندبووە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە و کارپێکردنی یان کاربۆکردنی بە لای مرۆڤەوە پاساوی خۆی هەبووە، چونکە بڕوای وایە کە باشترین هۆکارە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، جگە لەوەش چالاکی ژیاریی ناگاتە لوتکەی خۆی بەبێ هەبوونی خاڵێکی گەیاندن تا تروسکایی هیوا دەردەکەوێت بە هاوکات لە نێوان درووستبوونی دامەزراوەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی و ئەو ئامانجە بنەڕەتییەدا لە میانەی تێڕوانینە تاکی و کۆمەڵایەتییەکانەوە، بە پێچەوانەشەوە ئیشکالیەتی ژیاریی دەگاتە ئەوپەڕی پلەکانی، کاتێك مرۆڤ هەست دەکات کە خەون و ئاواتی بەر ڕەشەبا کەوتووە لەسەر دەستی دیکتاتۆریەت، یان گێژاوی ئامرازە کۆمەڵایەتییەکاندا، با لێرەدا بەڵگەیەك پیشان بدەین، جیهانی بوونی ئایینی مەسیحیەت وەك دەرهاویشتەیەکی سروشتی هات بۆ چاو چنۆکییەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجی ئازادی و ئاسایشی و خودیی ڕەهادا، لە ساتەوەختێکی مێژوویی مولەقدا کە بووە هۆی داڕووخانی ئەو شارستانێتییە گەورەیە، هەمان ئەو ئارەزووە بوو بە هاندەرێکی دەروونی بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی ژیاری تر کە زۆری نەخایاند ئەو چالاکییە ژیارییە گۆڕا بۆ حاڵەتێکی ڕاوەستاوی ئەوتۆ کە بوو بە هۆی کەڵەکەبوونی قەیرانەکە، ئەو قەیرانەی کە قۆناغێکی گرنگە و بوو بە هۆی پەرەسەندن و ئاڕاستەبوونی بەرەو ڕوانگەیەکی نوێ بۆ ئایینی مەسیحیەت، بەو سیفەتەی کە ئایینێکی خاوەن مۆرکی دەزگایی پابەندکارە و بەهۆیەوە مەسیحیەت دانی نا بە شەرعیەتی سیستمی

ئابووری و دەرەبەگایەتی دا کە هەستکردنی بە نەمانی ئاسایشی وخودیی لێ کەوتەوە.

لەگەڵ هەڵهاتنی ئەستێرەی قۆناغی مۆدێرنێتە و ڕێنیسانسی ئەوروپادا، هیوایەکی نوێ بۆ مرۆڤی ڕۆژئاوایی هەڵهات وەك یەکێك لە هەوڵدانە بێوچانەکانی بۆ بەدیهێنانی ئازادی وجودیی ڕەها لە بەرامبەر چوارچێوە دەزگاییە پوکاوەکانی هەریەك لە کاسۆلیك و فیودالیزمدا.

ئەو ئاڵوگۆڕە ڕاستەقینەی کە سەردەمی مۆدێرنێتە جیادەکاتەوە، سیمایەکی دەزگایی نەبووە، بەڵکو سیمایەکی ئەندێشەیی بوو کە بونیادێکی گەردوونی مەعریفی و بوونخوازی نوێی دانا و بەو هۆیەوە بارودۆخەکان لە ڕۆژئاوا ئامادەبوون بۆ گۆڕانکاری، لە بەرامبەریشەوە ئازادی بوونی ڕەها لە سۆنگەی فۆرمێکی سیحراوی بەناوبانگی (ژیری ـ زانست ـ پێشکەوتن)ەوە خۆی نواند کە پەیوەستبوو بە سەردەمی ڕێنیسانسەوە، هەموولایەك بڕوای تەواویان هێنا بەوەی کە ژیری سەرچاوەی ئازادی ڕەهایە و زانست هۆکارێکی ماددییە بۆ دروستکردنی پێکهاتەی کۆمەڵگە و پێشکەوتنیش سەرچاوەیەکی حەتمیە بۆ ئایندە و تا حاڵ گەیشتە ئەوەی مرۆڤی ڕۆژئاوایی خۆی بە خوا بکات و سنووری دەسەڵاتی خوایی لە ئاینی مەسیحیەتدا ببەزێنێ و ڕێنماییەکانی دامەزراوەی کلێساش تێپەڕێنێت.

لەلایەکی ترەوە لیبرالیزم بووە بە زامنی ئایدۆلۆژی بۆ چەمکی ئازادی لەکاتێکدا کە شۆڕشی پیشەسازی ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی بێوێنەدا، هەستکردنی گشتی لە قۆناغی یەکەمی شۆڕشی پیشەسازییدا وەهابوو کە مرۆڤ توانیویەتی کۆنترۆڵی هەمووشتێك بکات، بە بەکارهێنانی بەندە و کۆیلە نوێکانی کە مەبەست لێی ماکینەیە، ئەو هەستکردنە گشتییەی کە بوو بە هۆی زیادبوونی بڕوایان بە بیرۆکەی پێشکەوتن بە هێڵێکی تاکئاڕاستە کە مرۆڤ بەختەوەر دەبێت بە گەیشتن بە بەهەشتێك لە ئازادی ڕەها لە ئایندەدا وەك دەرەنجامێکی حەتمی پەرەسەندنی تەکنۆلۆژی و ئەو تێڕوانینە لە سەدەی نۆزدەهەمدا گەیشتە

چڵەپۆپە. ئەو تێڕوانینە دەروونییەی مەسیحیەتی ئەوروپایی بە بوونی بەهەشتێکی دونیایی لەسەر ئەم زەوییە، پاڵنەرێکی بەهێزبوو لە پشت بنەماکانی کۆلۆنیالیزم کە هێزە ڕۆژئاواییەکان گرتیانەبەر و سەرەنجامی کێشەو ململانێ ناوخۆییەکانی ئەو سیستمە ئیستیعمارییەش بوو بە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانیی یەکەم.

جگە لەوەی لە پێشەوە باسکرا، هەریەك لە قەیرانی ئابووری لە ساڵی ١٩٢٩ و هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی دووەم لە ١٩٣٩دا، بەشداریانکرد لە کردنەوەی جفرەی خەسڵەتە سروشتییەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا کە نەك تەنها هەڕەشەن لەسەر ئازادی، بەڵکو هەڕەشەن لەسەر بوون و قەوارەی زاتی مرۆڤ خۆی. ئەو ڕووداوانە ڕووی ناشیرینی سیستمی ئابووری ڕۆژئاوایی دەرخست، کە ڕێگربوون لە بەردەم مرۆڤ بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو ئامێر و تەکنۆلۆژیایەی کە خۆی بەرهەمی هێناون، جارێکی تر هیوای مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی ئازادی ڕەها لە ڕێگای بەکارهێنانی گشتگیر و کارای تەکنۆلۆژیاوە بە بنبەستن گەیشت، لەگەڵ ئەوەشدا کە پەرەسەندنی زۆر گەورە بەسەر تەکنۆلۆژیادا هاتووە، بەڵام ئەو پەرەسەندنە بووەتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ متمانە و هەستکردن بە دڵنیایی ونبکات بۆ گەیشتن بە بەدیهێنانی ئازادی تەواو.

جەنگی دووەمی جیهانییش هۆکارێك بوو بۆ کەمکردنەوەی گەشبینی بەرەو بەدەستهێنانی هەستکردن بە ئاسایش و دوای ئەوەی لایەنی ڕوخێنەری تەکنۆلۆژیای جەنگ دەرکەوت، مرۆڤ درکی بەوەکرد کە دۆزەخ لە بەهەشت لێیەوە نزیکترە.

شیکردنەوەی پەرەسەندنی مێژوویی وێرانکاری جەنگیش دەکرێ بە سێ قۆناغەوە:

**یەکەم:** تەکنۆلۆژیای گۆڕەپانی شەڕەکە.

**دووەم:** شوێنکارە ڕووخێنەرەکانی جەنگ لەسەر نەوەی هاوچەرخی جەنگەکە.

**سێیەمیان:** بەردەوامبوونی شوێنکارە ڕوخێنەرەکانی جەنگەکەیە بە تەریبی لەگەڵ بەرەوپێشچوونی پێشکەوتنی زانست دا.

شوێنکارە وێرانکارییەکانی جەنگی تەقلیدی هەمیشە لە چوارچێوەی ژینگەی تۆبۆگرافیای گۆڕەپانی شەڕەکە دەرنەچووە، بەو کوشتارە نامرۆڤانەی کە لە کاتی جەنگە تەقلیدییەکاندا ڕوویانداوە، دەرەنجامی پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیای جەنگی نەبوون، بەڵکو دەرەنجامی قەیرانی ئەخلاقی بوو، بەڵام نەگۆڕەکانی جەنگی تەقلیدی بە هۆی پەرەسەندنی چەکی نوێوە گۆڕاون و جەنگی یەکەمی جیهانیی تەنها (ئەزموونێکی سەرەتایی) وزەی وێرانکەری تەکنۆلۆژیای جەنگی نوێ بوو، کە سنووری وێرانکاری بۆ دەرەوەی گۆڕەپانی شەڕ و پێکدادان درێژکردەوە، بەڵام ـ تەنانەت لەم قۆناغەشدا ـ دەکرێ ئەو جەنگانە بە جەنگی سنووردار لەقەڵەم بدرێت، بە بەراورد لەگەڵ ڕەهەندی کاتی ئەو شوێنکار و زیانانەی کە لێیان دەکەوتەوە، چونکە ئەو جەنگانە بە تەنها نەوەی هاوچەرخی جەنگەکەی دەکردە ئامانج، بەڵام بۆمبی ناوکی بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو زیانی گەیاند بە ئاسایشی و خودیی نەوەکانی دوای خۆی، کە هیچ ڕۆڵ و گوناھ و بەشدارییەکیان لەو جەنگەدا نەبووە. ئەوەی شیاوی ئاوڕلێدانەوەیە کە بڕیارێکی نامرۆڤانەی وەك بڕیاری خستنە خوارەوەی بۆمبە ناوکیەکە، کە بە شێوازێکی دیموکراسییانە وەرگیرا و لەسەر دەستی حکومەتێکی دیموکراسی لیبراڵدا!. زۆر بە خێرایی ئەو بڕیارە لە لایەن سیستمێکی خاوەن فیکری عەقڵانییەوە جێبەجێ کرا، ئەو سیستمەی کە فۆکۆ یاما مژدەی پێ داوە و بە یەکێك لە ڕایەڵە بنەڕەتییەکانی جێگیرکردنی هەیمەنەی شارستانێتی ڕۆژئاوایی بەسەر جیهاندا وەسفکردووە.

بەڵام ئێمە لێرەدا باسمان لە ڕەخنەگرتن لە میکانیزمە دیموکراسییەکە و عەقڵانیەت نییە، بەڵکو باسمان لەوەیەکە ڕۆشنایی بخەینە سەر ئەو ڕاستییەی کە ئاسایشی و خودیی مرۆڤ ناتوانرێت پەیوەست بکرێت بە فۆرمێکی دیاریکراو لە سیستمە ئابووری و سیاسییەکان، بەڵکو ئەنجامێکی حەتمیە بۆ تێڕوانینی جیهان کە

سیستمێکی پێکەوەگونجاو لە تیۆرە خودیی و مەعریفی و بەها لۆژیکییەکان و میکانیزمە کۆمەڵایەتییەکان پێشکەش دەکات، هەروەها پێویستە لەسەرمان دووبارە دان بەوەدا بنێین، کە گرووپەکانی فشار لە کۆمپانیا زەبەلاحەکانی پیشەسازی جەنگی هەڵدەستن بە هەڵگیرساندنی ئاگری زۆربەی جەنگەکان، وەك میکانیزمێکی سوودگەرایی عەقڵانی بۆ ڕاکێشانی ماڵ و دارایی بۆ سیستمی ئابووری لیبراڵیزم.

دەکرێ بوترێت کە پەیوەندییە دەرەبەگییەکانی نێوان ئاغا و کۆیلە بە شێوەیەکی ڕیشەیی گۆڕانیان بە سەردا هاتوو لە چوارچێوەی داڕشتنەوەیەکی نوێدا بۆ چەمکی ئازادی دوای ئەو گۆڕان و پەرەسەندنەی کە بەسەر بونیادە سەرمایەداری و دیموکراسیەکانی لیبرالیزمدا هاتووە. ئازادی وای لێ هاتووە وەها لێك بدرێتەوە کە گۆڕاوێکی پاشکۆی نەگۆڕێکی تازە پەیدا بووە، کە یەکسانییە، هەر تاکێکیش هەوڵ دەدات ڕووبەری پێدراوی خۆی لەو ئازادییە پێوانە بکات بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئازادییەی کەسانی تردا، چونکە مۆدێرنێتە مژدە بەخشە بە ئازادییەکی ڕێژەیی لە بری گرتنەبەری تێڕوانینێکی بنەڕەتی ڕەها بۆ ئازادی، جەختکردنەوەکەی فۆکۆ یاما لەسەر ئەوەی کە: (دیموکراسی لیبراڵیزم ئەو ئارەزووە ناعەقڵانییەی مرۆڤ بۆ دانانی خود باشتر بێت لەوانی تر دەگۆڕێت بۆ ئارەزوویەکی عەقڵانیتر، بەوەی کە خود یەکسانە بە کەسانی تر)) (١٩٩: بەشی دەیەم)، وەك دەربڕینێك لە بارەی ئازادییە ڕێژەییەکەوە، بۆیە لێرە دوو پرسیاری بنەڕەتی سەبارەت بەم دیاردەیە هەیە، یەکەمیان ئەوەیە کە: ئایا ئەو یەکسانییە بونیادییە بە دەزگایی کراوە دەتوانێت بەدیهێنانی ئازادی زامن بکات؟ پاشان ئایا مرۆڤ لە ڕاستیدا هیچ یەکسانییەکی ڕاستەقینەی بەدەست هێناوە؟ دروستە کۆیلەکان ئازادکران و لەگەڵ ئاغاکاندا یەکسان کران، بەڵام ئایا ئەو یەکسانبوون و ئازادبوونە بەردەوام بوو یاننا؟ پرسیارێکی سەرسوڕهێنەری بێ وەڵامە، ئەگەر وەڵامێك هەبێ ئەوا بەستراوە بە پێناسەی ئازادییەوە، ئەو دەرگایەی کە لێیەوە پێناسێك بۆ یەکسانی و ئازادی دادەنرێت، پێناسێك دادەنێت بۆ ئازادی بەوەی کە دیاردەیەکی ئینسانی ناوخۆییە،

ئەو پێناسەی کە ئازادی بە ڕەنگێکی وێژەیی ڕەنگڕێژ دەکات سەردەکێشێت بۆ لەدەستدانی ئازادی بۆ مرۆڤێك کە لە گۆشەگیریدا دەژی، ئێمە دەتوانین هەڵسەنگاندنێك بکەینەوە بۆ ئەو پێناسەیە لە ڕوانگەی پێناسەکەی (هیگڵ)ەوە بۆ مێژوو، کە فۆکۆ یاماش ئاماژەی پێ کردووە بەوەی کە: بریتییە لە بەرزبوونەوەی مرۆڤ بۆ پلە باڵاکانی عەقڵانییەت و رزگاربوون و گەیشتن بە خاڵێکی کۆتایی لۆژیکی لە لووتکەی بەدەستهێنانی هۆشیارییەکی وجودیی ڕەهادا، یەکسانیش تەنها ڕەهەندێکە لە ڕەهەندەکانی هۆشیاری وجودیی تایبەت بە دەروونی مرۆڤەوە، کە چەندین ڕەهەندی و خودیی تر دەگرێتەوە لە پاڵ پەیوەندییەکانی تری نێوان مرۆڤەکاندا.

لە لایەکی ترەوە چەمکی هوشیاری خودیی (هیگڵ) ڕاستییەك دێنێتە ڕوو کە بنەماکانی دیموکراسی لیبرالیزمی نوێ ئەو چەمکە بنەڕەتییە لە پێناسەکردنی ئازادییدا فەرامۆشی دەکات.، لەسەر ئەو بنەمایە چەمکی ڕێژەیی و بونیادی بۆ ئازادی تایبەت بە نموونەی مۆدێرنێتە ئازادی و هوشیاری خودیی بنەڕەتی و گشتگیری بەدی نەهێناوە، هەروەك نەیتوانیوە ڕوانگەیەکی ڕۆشن بۆ هوشیاری خودیی دابنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەریەك لە هۆشیاری خودیی و ئازادی بەرەو پووکانەوە ڕۆیشتن بە تایبەت لە قۆناغە کۆتاییەکانی پەرەسەندنی سەرمایەدارییدا، کاتێك ئاغا کۆنەکان و ئاغا نوێیەکان لە بری ئەوەی ببنە هاووڵاتی یەکسان، گۆڕان بۆ کۆیلەی بەکرێ گیراو بۆ تەکنۆلۆژیای پیشەسازی، ئەو تەکنۆلۆژیایەی کە یاسای تایبەتی خۆی بەسەر پەیوەندییە ئینسانییەکاندا سەپاندووە، لەسەر ئەوەشەوە ئەگەر یەکسانیش هاتبێتەدی یان نا، ئەوا بەردەوام جێگای گومان دەبێت، ئەگەرچی ناوەرۆکی یەکسانی و ئازادیش دیاری بکەین. بەدوورکەوتنەوە لە بە جیهانیکردنی دروشمەکانی دیموکراسی، ئەوا دیلکراوەکانی میکانیزمی دیموکراسی لیبراڵیزمی نوێ زەحمەتە بتوانن دیموکراسیەتێکی جیهانیی دابمەزرێنن بۆ ڕێکخستنەوەی کاروباری نێودەوڵەتی، ئەوەش لە ناو هۆڵ و دەروازەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەجوانی

دەردەکەوێت، کە ئەنجامێکی سروشتییە بۆ پەیدابوونی چەمکی ئاسایشی بە کۆمەڵ، لە کاتێکدا وادانرابوو کە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو دەزگایە بێت کە زۆر باشتر پابەند دەبێت بە بەهاکانی یەکسانییەوە. بەهەر حاڵ درووشمە یۆتۆپیاییەکان کە دەڵێت: مرۆڤ یەکسانی بەدەستهێناوە لە چوارچێوەی بە جیهانیکردنی بەها تایبەتەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوادا، لەگەڵ ئەو بەرگە پڕوپوچەی کە پەیوەندییە نیودەوڵەتییەکانی پەردەپۆشکردووە، لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا دەخرێتە بەرتوێژینەوەو شیکردنەوە.

ئەو شکستەی دووچاری پێناسەی ڕێژەیی بونیادی بۆ ئازادی بووە، جەخت دەکاتەوە لەسەر پێویستی دووبارە هەڵسەنگاندنی تیۆری هوشیاری خودیی (هیگڵ)و بەها ئەخلاقییەکانی پێش بازدانە گەورەکەی تەکنۆلۆژیای پیشەسازی، لەو ڕوانگەیەشەوە (ر.سیمون) ڕەخنەی توندی ئاڕاستەی ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە کردووە بۆ ئازادی بەو پێیەی کە سنووردار نییە و لەسەر هەق بووە کاتێك دەڵێت: ئازادی وەك بەهایەکی جەوهەری ناکرێ لە ڕەوشتی جوان (فچیلە) جیابکرێتەوە[1]، بەو پێیەی (کانت) پێشنیازی کردووە، فۆکۆ یاماش دووپاتی کردۆتەوە کە دانانی دەستوورێکی مەدەنی یەکێکە لە پێداویستییە بنەڕەتییەکان لە پێناو درککردنی ئازادی ئینسانیدا، بەڵام ئەوە بەس نییە بۆ زامنکردنی ئازادی ڕاستەقینە، ئەو ئازادییە ڕاستەقینەیەش هەرگیز نایەتەدی بەبێ هێنانە کایەی بونیادێکی ئەخلاقی بەهاداری دیاریکراو و بەکردەیی کراو، بەشێوەیەك ڕووپۆشێکی شەرعیەت بۆ

---

[1] گرین (١٩٨٩: ٩٩) بەڵگەکەی کورت دەکاتەوە کە دەڵێت: ئازادیی هەڵبژاردن یەکێکە لە ئەرکە عەقڵانییەکان و ئەم ئازادییەش ڕەوایە کاتێك پەیوەست بێت بەجوڵەی کردارییەوە. ئازادی ناکرێ لە فەزیلەت جوودا بکرێتەوە، فەزیلەتیش پێویستی بە ئازادیی ڕەوا هەیە. ئازادی جەوهەرێکی مەعنەوییە کە ناکرێ بە زیندان یان بە گەمارۆدان یان بە هەر ڕەگەزێکی تری ماددیی دەرەکی تێك بشکێنرێت.

تەکنۆلۆژیا پیشەسازییەکان دەستەبەر بکات، کە هێمایە بۆ ئەو ئاغا نوێیانەی کە زۆر دڵڕەقن و سەروەت و سامانی هەموو مرۆڤایەتیان خراوەتە بندەست.

ئەو هەڕەشانەی کە توانای وێرانکاری و کۆنترۆڵکردنی تەکنۆلۆژیای ناوکی زیاد دەکەن و بە جیهانیکردنی ئابووری و میکانیزمە کۆمەڵایەتییە بنەڕەتییەکان چەند جارە دەکەنەوەو ڕێگرن لە بەردەم ئارەزووی مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ئازادی و ئاسایشی و خودیی، ئەو هەڕەشانە هەموویان کاریان کردۆتە سەر ئیدراکی زاتی مرۆڤی ڕۆژئاوایی، مامۆفورد (١٩٤: ٣٩٩) دەڵێت: ((هەرچەند ئامانجی گشتی قۆناغی فراوانبوون، زۆربوونی دەسەڵاتی مرۆڤ بووە بەسەر سروشتدا، واتە دەسەڵاتی مرۆڤی ڕۆژئاوایی بەسەر خەڵکێکی زیاتر نەرمونیان و کەمتر چەکداردا کە ڕووبەرێکی فراوانی جیهانیان گرتۆتەوە، ئەو شارستانێتییەی کە بەو شێوەیە ئەنجام هاتووە دووچاری لێکترازان و کێشەی ناوخۆیی و ناکۆکی بووەتەوە و بووەتە هۆی ناشیرینکردنی زۆرێك لە سەرکەوتنە ڕاستەقینەکان)). نووسینەکانی روودیار و کیبلنج وەك (ئەرکی مرۆڤی سپی) و نووسینەکانی ماکیوز (مرۆڤی تاکرەهەند) و نووسینەکانی تر کە گۆڕانیان لە ئیدراکی زاتی مرۆڤی ڕۆژئاوایی هاوچەرخدا ڕەچاو کردووە، هەروەها ئەو ئاڕاستە گەشەکردووەی بەرەو ڕەفتاری بەکاربەری جۆرێك لە شوناسی فەرهەنگی چەندێتی، لە جیاتی پێکهێنانی ئیدراکێکی زاتی نەوعی هێناوەتە کایەوە، ئەوە چیرۆکی نامۆبوونە کە دووچاری نموونەی ڕەسەنی هەر شارستانێتییەك دەبێت، بەڵام سۆشیالیستی لە لایەکی ترەوە توانی ئەو نامۆبوونە کورت بکاتەوە و بیگەڕێنێتەوە بۆ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان کە ڕێگاچارەیەکی پەیکەریی پێشنیاز دەکات، واتە بەدیهێنانی گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە پێکهاتەی چینایەتی دا بۆ پێکهێنانەوەی ژیان و کۆمەڵگەیەکی نوێ[٢]، داڕووخانی سۆشیالیزم

---

[٢] ڕوانینی بەپەرۆشی دەروونی کە ئاماژەی پێکرا لە شیعرێکی (ئەلیکسندەر بلوك)دا ڕوونە کەت یایدا وەسفی ئامانجەکانی شۆڕشی ڕووسی دەکات، کە بریتین لە: دووبارە پێکهێنانەوەی هەموو شتێك، دووبارە

لەوەدا دەردەکەوێت کە ئەونامۆبوونە ئەنجامی پەیکەرە کۆمەڵایەتییەکان نەبوو، بەڵکو دەرەنجامی نموونەیەکی بنەڕەتی بوو بۆ وێناکردنی جیهان کە کۆمەڵێك ڕوانگە و تێڕوانینی پەیوەست بە مرۆڤ و گەردوونەوە تیایە.

**ب- ڕێژەگەریی مەعریفی و زانست:**

ئەوگریمانە بنەڕەتییەی کە نموونەی مۆدێرنێتەی لەسەر ڕاوەستاوە و دواتر بووە تەوەرێك بۆ فەلسەفەی نوێ، ئەوەیە کە گەیشتن بە ڕاستی کۆتایی تەنها لە ڕێگای پشت بەستن بەو تیۆری مەعریفەوە دەبێت کە مرۆڤ بە چەقی گەردوون دادەنێت، یان ئەوە مەرجەعی کۆتایی گەردوونە، ئەو دانراوە – کە گونجاوە لەگەڵ پەراوێزخستنی (وەحی) دا- لەگەڵ ژیری و تاقیکردنەوەدا پێکەوە سێ سەرچاوەی پێکەوەگونجاو بۆ گەیشتن بە مەعریفە پێك دەهێنن. بە هەرحاڵ حەتمیبوونی ئەم گریمانەیەی کە بڕوای بە باڵادەستی مەعریفەناسی مەرکەزیەتی مرۆڤ هەیە لە گەردووندا، ئێستا جێگای مشتومڕ و تاوتوێکردنە، چونکە ئەو کۆسپە بنەڕەتییەی کە ڕووبەڕووی مەعریفەناسی مۆدێرنێتە دەبێتەوە، لە دابەشکردنی دوو لایەنە و جیاکاری نێوان سەرچاوەکانی مەعریفەدایە کە دەبێتە هۆی لە قاڵبدانی ڕاستی و دابەشکردنی، ئەم دابەشکردنە دوانەییەش دیاردەیەکی (ئەورۆ – مەسیحی) ڕووتە و لە بەشەکانی داهاتوودا ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە لە مەعریفەناسی ئیسلامییدا وەك هاوشێوەکەی لە ئایینی مەسیحیەتدا ڕووی نەداوە. چونکە عەلمانیەتی مەعریفە بەوپێیەی ئەنجامێکی مێژوویی لۆژیکی ئەو لە قاڵبدانەیە کە دووچاری ڕاستی بۆتەوە، هاوتا و تەواوکاری تیۆری مەرکەزیەتی سروشتی گەردوونە، عەقڵانیەت و ئەزموونگەری دوو لە گرنگترین ڕێگاکانی شیکاری زانستەکانی مۆدێرنیتەن، چونکە

ڕێکخستنەوەی شتەکان بۆ ئەوەی هەموو شتێك نوێ بێت. هەروەها بۆئەوەی داد و خاوێنی و جوانی و ژیانی ئاسوودەیی جێگەی ستەم و لادان و ناشیرینی و ڕسواییەکان و ژیانی ناخۆش بگرنەبەر)) (ستایس،١٩٨٩: ٣٨).

نموونەی مۆدێرنێتەی نوێ لەسەر ئەو گریمانەیە دانراوە کە ((بیروبۆچوونەکان لە دوو سەرچاوەی (هەستکردن و درککردن) پەیدا دەبن و کردارە زیندووەکانی ژیریی مرۆڤ پێك دەهێنن)) (راسل،١٩٦٢: ٥٨٥).

بنەمای مەعریفی نموونەی مۆدێرنێتە پشت بەستووە بە دووبارە ڕێکخستنەوەی پەیکەری مەعریفە بە بەکارهێنانی ژیری و تاقیکردنەوە، ئەو بنەمایەش وادادەنێت کە (ڕۆڵی لایەنی عەقلانی لە مرۆڤدا– ئەو لایەنە زیاد بکات، یان کەم ـ هەڵدەستێ بە ئەرکی خۆی بە پشت بەستن بە ئەو زانیاری و پێدراوانەی کە پێشتر هەبوون ـ یان وەك لە وێناکردنی پوپەردایە بە پێی کۆمەڵێك خەملاندن و بیروبۆچوونی دەستکەوتووی بنیاتنراو لەسەر بینین– لە پێناو دروستکردنی قەڵایەك لە مەعریفەی زانستی و بابەتی)) (ألیس، ١٩٧٩: بەشی شەشەم).

تیۆرەکانی مۆدێرنێتە کە مامەڵە لەگەڵ چەمکی ڕاستەقینەدا دەکەن وەك تیۆری هاوڕێکی[٣] و تیۆری یەکگرتن[٤] و تیۆری پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی[٥] و تیۆری پراگماتیزم[٦] و تیۆری ئەدائی[٧] هەموویان بە دەرەنجامی مەعریفەناسی تازەگەری

---

[٣] بەپێی ئەم تیۆرە ئەوا گریمانەکردن یان باوەڕ یان ڕاوبۆچوون کاتێك دروست دەبێت کە گونجاو بێت لەگەڵ ڕاستییەکانی واقعدا.

[٤] پێشەنگە یەکەمینەکانی ئاڕاستەی ئایدیالیزم لەوانە: سپینۆزا، هیگڵ، برادلی، ڕایان وایە کە ڕاستەقینەی گشتییەکە و لێکچووە لە ڕووی لۆژیکییەوە، ئەو گریمانەیە دەکەن کە تیۆرەکەیان پشتبەستووە بە چەندین بەڵگەنەویستی نەگۆڕ کە هیچ گومانێك هەڵناگرن، بۆیە ئەوان (بیرکاری) بە نموونەیەکی ئایدیایی زانست دادەنێن.

[٥] بەپێی تێڕوانینی لایەنگرانی پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی گریمانەکان دروست دەبن ئەگەر لە چوارچێوەی سیستەمێکی دیاریکراودا پێکەوە یەکگرتوو بن، تاکە سیستمی پەسەندکراویش ئەوەیە کۆمەڵەی تیۆرە زانستییەکانی ئەم سەردەمە پێکی دەهێنێت.

[٦] لایەنگرانی تیۆری پراگماتیزم وادەبینن کە گریمانەیەك کاتێك دروستە کە پەیوەست بێت بە تیۆرێکی دروستەوە، تیۆرەکەش دروست دەبێت ئەگەر هاوکار بێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی کە بریتییە لە

ئەژمار دەکرێن، بیرۆکەی کەڵەکەبوونی پێشکەوتنی زانستی بە یەك ئاڕاستە بەو پێیەی کە یەکێکە لەو نەگۆڕە بنەڕەتیانەی کە نموونەی مۆدێرنێتەی لەسەر بنیاتنراوە، دەرهاویشتەیەکی سروشتی بڕواهێنانە بە حەتمیەتی مەعریفە کە لەم مەعریفەناسییەوە سەری هەڵداوە، توندوتۆڵی بونیادی زانستیانەی مۆدێرنێتە ڕەهاییەکی مەنهەجی و تیۆری بەرهەم هێناوە، بە تایبەت لە قۆناغی دوای سەدەی نۆزدەهەمەوە کاتێك ئامێر و ئاوازە مەعریفی و مەنهەجییە سەرکەوتووەکان گۆڕانکاری تەکنۆلۆژیای فراوانیان هێنایەکایەوە، فۆرمە سیاسییە بەناوبانگەکەی (ژیری– زانست– پێشکەوتن) دەرەنجامێکی هەڵکشانی ئەو لە خۆڕازیبوونە بوو. ئەو پەرەسەندنەی کە سەدەی بیستەم بە خۆیەوە بینی - کە لەسەر پێکهاتە توندوتۆڵەکانی تیۆرەکاندا هات، ئەگەرچی هێشتا بە توندوتۆڵی ماوەتەوە - تەنها ڕێکەوتنێکی ڕووت نەبوو، بەڵکو بەشێکی تەواوکاری ئەو پەرەسەندنە مەعریفی و مەنهەجییە بوو، بە بەکارهێنانی تێڕوانینی (ستاتیتس)، دەتوانین بڵێین مەعریفە ڕوتکراوەکان لە سروشی خوایی، بیروباوەڕی ئیلحادی هێنایە کایەوە، مرۆڤی پرۆمیسیوس وەك داهێنەرێکی ئازا و پڕچەك بە ئامێرەکانی، ڕەمزێکی سروشتی و بەڵگەدارە لەسەر لادان و هەڵگەڕانەوە لە ئایین. لە پرسەنامەیەکی کاریگەردا بۆ مرۆڤ، دادوەر (میخائیل رایزنەر) بەڵێنی داوە کە بە بەکارهێنانی ((دڕندە ئاسنینە میکانیکیەکانی مرۆڤ بەهەشتێك دروست دەکات کە هەموو جیهان دەگرێتەوە))، ئەوەش دوای ئەوەی کە شەڕ دژ بە خواکان ڕابگەیەنێت، هەروەك چۆن ڕەمزی

بەهێزکردنی پێگەی مرۆڤ بۆ کۆنترۆڵکردنی ژینگە. بۆیە گریمانەکە کاتێك دروست دەردەچێت کە بەشێك بێت لە تیۆرێکی جێبەجێکراو لە واقیعی ژیانی کردارییدا.

[٧] بۆ ڕەتدانەوەی ئەو ڕەخنەیەی کە ئاڕاستەی ئەو بۆچوونە کراوە ، دەڵێت هەردوو وشەی (ڕاست) و (هەڵە) لە گوزارشتە وەسفیەکانی، لایەنگرانی تیۆری پراکتیکی وەك شتراوس-بەتایبەتی- جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە ئەوان نە دەربڕینکارەکانن و نە لە جێبەجێکارەکانن، لەبەر ئەوە ئەو وتەیەی کە ڕستەیەك ڕاست بێت مانای دەربڕینکردنە لە پێکەوەگونجانی لەگەڵ ڕستەکەی خۆیدا.

گالیسکەیەکی کشتوکاڵی ئیلحادی لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا دەرکەوت و لە لاپەڕەکانی نامیلکەیەدا بەنانیشانی (نوێژەکانی گالیسکەیەك) پیشاندرا و بە شێوەی پۆستەرات بڵاوبوەوە، کە تیایدا گالیسکەکە شەڕ لەگەڵ خاچدا دەکات.

هەروەها ڕێگای ئاسنین دەربڕینێکی تری ڕەمزی هەڵگەڕانەوە لە ئایین بوو، ئەوەبوو لە پێش شۆڕشی بەلشەفیەوە چیرۆکێکی ڕەمزی – کە دەگەڕێتەوە بۆ (لیۆنتیڤ) کە ناحەزبوو بە مۆدێرنیزم– وەك شەمەندەفەرێکی ڕەشی درێژ بەکار دەهێنرا کە ڕێگا لە کاروانێکی ئایینی دەگرێت بۆ هێمایەك لەسەر سروشتە شەڕەنگێزەکەی مۆدێرنێتە، ئەوەبوو دوای تەواوبوونی شۆڕشەکە شەمەندەفەرەکانی پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستە ڕووسییەکان بە هەموو ناوچەکانی ڕووسیادا دەگەڕان و مژدەیان دەدا بە هەواڵی گەردوونێکی بێ خودا، بەڵکو بە یەکێك لەو شەمەندەفەرانە دەوترا (شەمەندەفەری ئیلحادی خێرا). حزبی فەرمانڕەواش لە ڕووسیا فیستیڤاڵی بۆ کۆمۆنیستی گشتی و ئایینە نوێیەکانی ساز دەکرد، یاروسلاڤسکی ئاهەنگە شۆڕشگێڕییەکانی داهێنا و گۆرانی و مۆسیقای شۆڕشگێڕیانەی بۆ دابین دەکرد و کۆڕ و پێشبڕکێ و بۆنەکانیان بە درێژایی ڕۆژانی ساڵ بۆ ململانێ لەگەڵ کلێسادا ڕێك دەخست. (ستایتس، ١٩٨٩: ١٠– ١٠٨).

نموونەی ئەم گۆڕانکارییە دەروونی و شۆڕشگێڕییەی کە لە چوارچێوەی سۆشیالیزمدا هاتە کایەوە ـ تەنها ڕەنگدانەوەیەکی یاساکەی (کۆنت)ی تایبەت بە پەرەسەندنی ژیریی بوو، بەو پێیەی کە لێکدانەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی پێشکەوتنخوازی بابەتی مەعریفەی ئینسانی و فەلسەفەی زانست بوو.

بەپێی ئەو تیۆرەش هەموو لقەکانی تێگەیشتنی ئینسانی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

**یەکەم:** قۆناغی لاهوتی، یان ئەندێشەیی، کە تیایدا مرۆڤ هەوڵی داوە شتەکان بە گەڕانەوە بۆ هێزەکانی سەرو سروشت لێك بداتەوە.

دووەم: قۆناغی غەیبی ئەبستراکت، کە تیایدا فەیلەسوفەکان پرسیارەکانیان دەربارەی ڕاستی و دروستی لێکدانەوە خستەڕوو بە گەڕانەوە بۆ چییەتی ڕوحانیەت، ئەوانەی کە دەستیانکرد بە گەڕانەوە بۆ لێکدانەوەکانیان لە بری ئەوەی کە سیفەتی واقیعی بوون بەسەر شتە ڕووتەکاندا دابڕێژن، بۆ نموونە گریمانەی بوونی چییەتی ڕاستەقینە لە ژێر ناوی گوزارشتە ڕووتەکاندا، وەك ((ڕاستەقینەی ڕەها)) و ((دادپەروەری ڕەها)) و ((جوڵەی ڕەها)).

سێیەم: قۆناغی پۆزەتیڤیزم و زانستیانەکە تیایدا لێکدانەوەکان شێوەی دەرخستنی پەیوەندییە ئاڵ و گۆڕەکانی نێوان دیاردەکانی وەرگرتووە.

لە ئاست ئەم دووڕیانە مێژووییەدا، نموونەی مۆدێرنیزم ڕووبەڕووی هەڵوێستێکی دژوار بووەتەوە. لە ڕووسیا بۆ نموونە– بزاڤی ژیاندنەوەی ئایینی هەڵسا بە لاوازکردنی ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیستی زانستی، کە بانگەوازی دەکرد بۆ پێدانی پێگەیەکی باڵا بە بێباوەڕی و ئیلحاد لە سۆنگەی پەرەسەندنی حەتمی زانستییەوە. لەسەر ئەو بنەمایە نە ئاڕاستە مێژووییەکەی حەتمیەتی پەرەسەندنی زانستی و عەقڵی و نە بزاڤی ژیاندنەوەی ئایینی ناتوانرێت بە لادان لە ڕێگا دابنرێت، لەبەر ئەوەی کە زیندووبوونەوەی ئاین لە ڕووسیا واقیعێکی حاشاهەڵنەگرە، کەواتە تەنها یەك لێکدانەوە دەمێنێتەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو ئیشکالیەتە، ئەوەیە کە شیکارییەکەی (کۆنت) دەرەنجامی ئەو ژینگە فیکری و فەلسەفییەیە کە تیایدا پەیدا بووە، نەوەك ئەنجامی ڕاستەقینەیەکی ڕەها لە هەر سنوور بۆ دانانێکی کات و شوێنەوە بێت.

لە ڕاستیدا نموونەی ئەم ئەنجام لێوەرگرتنە ڕێژەیی شیکردنەوەی زانستییانە پێویست دەکات، ئەمە لەکاتێکدایە کە شیکردنەوەی ڕێژەیی نەگەشتووە بەهیچ ئەنجام لێ وەرگرتنێکی مێژوویی لە ڕوانگەی تیۆری کۆتایی مێژووەوە.

سوسەر (١٩٨٨: ٦٠) دان بەوەدا دەنێت کە ((کۆنت واقیعیبوون و ماددیبوونی پێوەرەکانی مەعریفەی زانستیانەی بۆرژوازیەت دەسەلمێنێت و لووتبەرزی و

دەمارگیری ئەوروپایی ئاشکرا دەکات))، تائێستاش شوێنکەوتووە هاوچەرخەکانی (کۆنت) لوتبەرزی و دەمارگیری ئەوروپایی لە شیکردنەوەکانیاندا دادەنێن، نموونەی مۆدێرنێتەش توانیویەتی پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان بنەما مەعریفییەکان و میکانیزمە کۆمەڵایەتییەکاندا جێگیر بکات لە ڕێگای بڕیاردانی مەنهەجیەتێکی یەکگرتووەوە، دەتوانرێت شوێنپێی ئەو هەوڵانە بدۆزرێتەوە بە گەڕانەوە بۆ بنەما فەلسەفییەکانی سەدەی نۆزدەهەم. لە ساڵی ١٨٤٤ مارکس لە (دەستنووسە ئابوورییە فەلسەفییە)کەیدا نووسیویەتی کە: زانستە سروشتییەکان ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ زانستە مرۆڤایەتییەکاندا دەبن بە یەك، کە ئەمانیش بە دەوری خۆیان هەمان شت دەکەن لەگەڵ زانستە سروشتییەکاندا.

ئەم لێدوانەی کە مارکس وتوویەتی، هەر لەوە دەچێت کە (کۆنت) لە کتێبی (سیستمی سیاسی پراکتیکی) لە ١٨٥١دا ئاماژەی پێ کردووە، کاتێك دەڵێت: (دەرکەوتنی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرەڕێی تەواوکاریی گەشتە گەشەکردووەکەماندا بەرەو تێڕامانمان بۆ واقیع، ئەو زانستانە بە مۆرکێکی ڕێکخستنی پۆلێنکراو مۆر دەکات لە ڕێگای پێشکەشکردنی تاکە پەیوەندییەکی گەردوونییەوە کە ئەو زانستانە دانی پێدا دەنێن)، هەروەك (رونیسمان) بەشێوەیەکی ڕوون جەختی لەسەر کردۆتەوە (١٩٦٩: ٤) کە زەحمەتە لەکاتی ئێستاماندا بوونی کەسێك دابنێین کە قبوڵ بکات ئەم جۆرە ڕاگەیاندنانە بە جددی وەربگرێت.

ئەو هەوڵ و تەقەلایانە توانیان ڕێگا خۆش بکەن بۆ دانانی بە میکانیزمە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابورییەکاندا، چونکە پەیوەندی هۆکاری و لۆژیکی حەتمی لە نێوان مەرکەزیەتی سروشتی گەردوونی و سروشتی کۆمەڵایەتییە میکانیکییەکەدا بە هۆی دانراوە مەعریفی و مەنهەجییەکانی تیۆری زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە زیاتر ڕۆشن دەبێتەوە، وەك ئەوەی کە (دانیسوف) بنەماکانی داناوە (١٩٧٢: ٧) بەمشێوەی خوارەوە:

١ـ سیستمێك هەیە كۆنترۆڵی تواناكانی گەردوون و كۆمەڵگە دەكات و دەتوانرێت پەی پێ ببرێت.

٢ـ لێكچووەكانی كۆمەڵگە یان ئەو سیستمەی كۆنترۆڵی كۆمەڵگە دەكات مەسەلەیەكە شیاوی بینین و هەستپێكردنە.

٣ـ لە ڕێگای بەكارهێنانی سەرنجدان و هۆكارەكانی تری زانستە مادديیەكانەوە یاساكانی ڕەفتاری كۆمەڵایەتی دەتوانرێت بسەلمێنرێت و بە یاساییش بكرێت.

٤ـ زانستە كۆمەڵایەتییەكان بە تێپەڕبوونی كات ئەوەندە پەرەدەسێنن و دەوڵەمەند دەبن و ڕۆشن دەبنەوە شایستەی ئەوەبن كە لەمەودوا پشتیان پێ ببەسترێت.

لەبەر ئەوەی كە مەعریفەناسی مرۆیی ڕێك و گونجاوە لەگەڵ هەردوو دیاردەكەدا ـ سروشتە گەردوونی و كۆمەڵایەتییەكە ـ بەو پێیەی كە هەردووكیان ڕوو دەكەنە هەمان بابەتە سروشتی و كۆمەڵایەتییەكان، ئەوا مەنهەجیەتێكی جیهانیی دروست دەتوانێت تیۆری ورد و قەناعەتبەخش پێشكەش بكات بۆ لێكدانەوەی هەموو مەسەلە ئاڵۆزەكانی پەیوەست بە سروشت و مرۆڤ و كۆمەڵگەوە، هەروەك فۆكۆ یاما لەمبارەیەوە ڕایگەیاندوە، ئەوا گۆڕانێكی نەوعی لە پەیوەندی نێوان مەعریفەی عیلمی لە چوارچێوەی پێشكەوتنی مێژوویدا و پەیدابوونی زانستە سروشتییە نوێكاندا هاتۆتە كایەوە، بەوپێیە ئەوا توانای سەپاندنی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا بە سوودوەرگرتن لە زانستە سروشتییەكان خاسیەتێكی جیهانیی نەبووە لە هەموو كۆمەڵگەكاندا، بەڵكو پێویستبوو لە ماوەیەكی زەمەنی دیاریكراوی مێژوودا لەسەر دەستی كەسانێكی ئەوروپایی دیاریكراو كەشف بكرێت، لەبەر ئەوە تەنها بە دۆزینەوەیان ڕێبازی بیركردنەوەی زانستییانە دەبێتە مەسەلەیەكی جیهانیی بۆ هەركەسێك توانای بیركردنەوەی عەقڵانی هەبێ و دەبێتە سەرچاوەیەك كە هەموو كەسێك لێی هەڵ دەگۆزێت بەبێ ڕەچاوكردنی جیاوازییە ڕۆشنبیری و ڕەگەزییەكان، هەروەها دۆزینەوەی ڕێبازی بیركردنەوەی زانستییانە جیاكەرەوەیەكی زەمەنی

بنەڕەتی دروست کردووە لە نێوان قۆناغی پێش خۆی و ئەوەی لە دوایەوە دێت و تەنها بە دەرکەوتنی ئەو جیاکەرەوەیە، ئەو دۆزینەوە بەردەوامە پێشکەوتووانەی کە دەرەنجامی زانستە سروشتییە نوێکانە، دەستیانکرد بە پێشکەشکردنی میکانیزمێکی ئاڕاستەکەر بۆ لێکدانەوەی زۆرێك لە لایەنەکانی پەرەسەندنە مێژووییەکانی لەمەودوا)) (فۆکۆ یاما، ١٩٩٢: ٣- ٧٣). سەرەنجام ئەوەبوو کە ئایدۆلۆژیای مۆدێرنێتە و دەرکەوتنی وەك سیستمێکی عەقائیدی ئیلحادی، دەرەنجامی بنەماکانی مۆدێرنێتەی مەعریفی و مەنهەجی پێشخۆی بوو.

ئەوەی شایانی باس بێت ئەوانەی بڕوایان بە تیۆرەکانی کۆتایی هەیە، وەك تیۆری کۆتایی ئایدۆلۆژیا و تیۆری کۆتایی مێژوو هاوبەشی هەمان تێڕوانینی فەلسەفیانەن لەگەڵ ئایدۆلۆژیاکانی تری وەك مارکسیزمدا، کە بەهەمان ئەو دەرەنجامە گەیشتوون کە بڕوایان بە تاکئاڕاستەیی مێژوو هەیە، بۆیە ئەگەر ئیشکالیەتێك هەبێ کە پەیوەستبێت بە بنەما مەعریفی و مەنهەجییەکانی مارکسیزمەوە، ئەوا بێگوومان بوونی ئیشکالیەتی هاوشێوەی دەسەلمێنێت کە سەرشانی تێڕوانینە تەکنۆلۆژیەکانی مۆدێرنیزم بارگرانتر دەکات. بۆ خۆدوورگرتن لە ئیشکالیەتێکی لەو بابەتە کە بنەما فەلسەفی و مەنهەجییەکان لەناو دەبات، شوێنکەوتووانی تیۆرەکانی کۆتایی و لە نێوانیاندا فۆکۆ یاما هەوڵیانداوە بۆ کورتکردنەوەی ئەو ئیشکالیەتە بۆ هەندێ هۆکاری دەزگایی و هەیکەلی، لە بری ئەوەی بگەڕێن بە دوای ئەو بنەما فەلسەفییانەدا کە لە دوای تیۆرەکانیانەوەیە، بەکارهێنانی فراوانی مەنهەجییەتی زانستە سروشتییەکان کە بە سەر زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا جێبەجێ کراوە، بە مەبەستی دروستکردنی مەنهەجییەتێکی جیهانیی یەکگرتوو، توانیویەتی کە ڕایەڵەکانی فیکری کۆمەڵایەتی بونیادی و دەرەکی بەهێز بکات لە ڕێگای وێناکردنی گونجاوەوە کە توانای هەبێ لەسەر سنووردانان بۆ داهێنانکاری و ئاڵۆزکردنی زیاتری مۆدێرنیزم.

هوسرل (١٩٦٥: ٢– ١٥١) ئاماژە دەکات بەو پرسیارە مەنهەجییە لە کاتی شیکردنەوەیدا بۆ قەیرانی مرۆڤی ئەوروپایی و دەڵێت: گەلانی ئەوروپایی دووچاری نەخۆشی بوون، وەك دەوترێت ئەوروپا بە قۆناغێکی دژواردا تێدەپەڕێت و هیچ چارەسەرێکی ڕێگەپێدراو نەماوە، ئێمە لە ڕاستیدا کەوتووینەتە ژێرباری گوژمەیەك لە پێشنیازی توندڕەوانە کە بانگەواز بۆ ڕیفۆرم دەکەن، بەڵام زیادەڕۆیی نییە کە خوازیاربین زانستە مرۆییەکان لە تاوتوێکردنی بابەتەکانیدا سەرکەوتوبن، لە کاتێکدا کە زانستە سروشتییەکان بە کردەوە لە بەجێهێنانی ڕۆڵی خۆیاندا بە ئەوپەڕی لێهاتوویی سەرکەوتوو دەبن، جوانی زانستە سروشتییەکان لە ڕەتکردنەوەیاندایە قەناعەت بە هەموو ئەو شتانە بکات ملکەچن بۆ بینینی تاقیکاریی، لەبەر ئەوەی کە هەموو وەسفکردنەکانی زانستە سروشتییەکان پابەندن بە ڕێساکانی ڕێوشوێنە مەنهەجیبەکانەوە بۆ گەیشتن بە لێکدانەوە وردەکارییەکان، لێکدانەوەکانی دەروون ـ کیمیایی بە شێوەیەکی بنەڕەتی، بەڵام مەخابن دۆخەکە لەگەڵ زانستە مرۆییەکاندا بە تەواوی جیاوازە، ئەوەش بەهۆی هۆکارە ناوخۆییەکانەوە، ئەگەر جیهان تەنها لە دوو چوارچێوەی هاوشێوە پێکهاتبا، چوارچێوەی واقع ـ سروشت و چوارچێوەی ڕۆح سروشت ـ ئەگەر هەریەکەشیان هیچ دۆخێکی جیاکاری خۆی نەبوایە لە ڕووی مەنهەجی و واقیعەوە، ئەوا دۆخەکە بە تەواوەتی دەگۆڕا، بەڵام سروشت خۆی بە تەنها دەتوانرێت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت وەك جیهانێکی خود لە خۆگرتوو، بۆیە تەنها زانستە سروشتییەکان دەمێننەوە کە بە پێکەوەگونجانێکی تەواو، توانایان دەشکێ بەسەر ڕوونکردنەوەی هەرشتێك ڕۆحی هەبێ و مامەڵە لەگەڵ سروشتدا بکات بەشێوەیەکی ڕوونکراوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەم نموونە لە ڕوونکردنەوەی پێکەوە گونجاو لە سروشت ـ بۆ ئەوانەی کە مومارەسەی زانستە مرۆییەکان دەکەن و بایەخ بە ڕۆحانیات ئەدەن بەشێوەیەکی تایبەت ـ بۆ ئەوانە نابێتە هۆی پەیدابوونی جیهانێکی خودلەخۆگرتوو، جیهانێك جگە لە پەیوەندییە ڕۆحانییە ڕووتەکان شتێکی تری تێدا نییە، جیهانێك بەرز دەبێتەوە بۆ ئەوەی پێکهێنەرێکی

بنەڕەتی دروست بکات بۆ زانستە مرۆییە گەردوونییە ڕووتەکان، کە هاوتای زانستە سروشتییەکان بن.

ئیشکالیەتی بنەڕەتی کە تێکەڵ بە مەعریفەناسی مۆدێرنیزم دەبێت، بە کورتی ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ، یان فاکتەری عەقڵانی، بە ڕێگایەکی نەزانراو جیاکراوەیە لەو جیهانە بەرهەستەی کە لە هەوڵی ئەوەدایە بچێتە قوڵاییەکانییەوە، بەڵام ئەو دانراوە هیچ پەیوەندییەکی بە ڕاستییەوە نییە، چونکە ئەو فاکتەرە عەقڵانییە خۆی بە بەشێك لەو جیهانی بەرهەستە دادەنرێت، ئەو هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە یەکبوونی تەواو ئەڵقەیەکی تری بۆش دروست دەکات لە ڕوانگەی پەیوەندی نێوان فەلسەفەی خود و فەلسەفەی بابەت لە ناو مەعریفەناسیدا بۆ مەرکەزیەتی گەردوونی مرۆڤ.

سێ فاکتەر دەکرێ وێنا بکرێت کە دەتوانێت ڕێگری لەو گریمانەیە بکات کە باس لە توانای درککردنی ڕاستەقینەی ڕەها دەکات تەنها لە ڕێگای مەعریفەناسی مەرکەزیەتی مرۆڤ لە گەردووندا لەناو چوارچێوەیەکی دیاریکراوی براوەدا:

**فاکتەری یەکەم:** زانستەکە هەرخۆی بابەتیبوونی ئەنجامەکان و حەتمیبوونیانی پوچەڵکردۆتەوە، چونکە چەمکی ڕێژەیی و بیرۆکەی ئاسۆ نوێیەکانی جیهانە گەورەو نەبینراوەکان، دەریانخست کە هەر دۆزینەوەیەکی زانستییانەی نوێ چەند پرسیارێکی تری نوێ دەخاتە ڕوو، لەبەر ئەوەی هەر بە سانایی گۆڕاوی تری نوێ دەردەکەون کە پێشتر نەبوون، لە بری ئەوەی بگەن بە چەندین ئەنجامی یەکلاکەرەوە.

**فاکتەری دووەم:** ئەوەیە کە زانایانی مەعریفەناسی لە قۆناغی دوای مۆدێرنێتەدا جیاکاری دەکەن لە نێوان ڕاستییە تیۆرییە نێوەندییەکان و دەرەکییەکاندا، ئەوەش بووەتە هۆی قورسترکردنی تای تەرازوی بەدواداهاتنی تیۆرەکە لەسەر حسابی یەکلابوونەوەی تیۆرەکە.

**بەڵام فاکتەری سێیەم:** ئەوەیە کە چالاکی ژیاندنەوەی ئاینی بەرچاو لە دوای دەیەی شەستەکانەوە و بەتایبەتی لە دەیەی هەشتاکاندا، ئاڕاستەیەکی تری هێناوەتە کایەوە، کە سەیری سەروو مەعریفەناسی دەکات.

مشتومڕەکانی ئێستا تایبەت بە مەعریفەناسی و تیۆری زانست بوونەتە هۆی لاوازکردنی متمانەبوون بە زانست و بونیادە مەعریفیەکانی ژێرەوە بەو پێیەی کە پێویستییەکی حەتمی و دیاردەیەکی کەڵەکە بووە.

ئەو توێژینەوەیەی کە ئارەزووی دەکرد بگاتە دانانی زانستێکی کۆمەڵناسی گشتگیر کە توانای هەبێ لەسەر پێشبینیکردنی ئایندەی حەتمی مرۆڤایەتی، لە ڕاستیدا نەیتوانی لەو گفتوگۆیانەدا ببێتە هاوشان. سەرنجەکانی (فیرابند) وەربگرین وەك نموونە کە دەڵێت زانستی فیزیای نوێ کە (کۆپەرنیکۆس) بنەماکانی داناوە، بە توێژینەوەیەکی بنیاتنراو لەسەر بینینکراوەکان دەستی پێ نەکردووە، بەڵکو وەك خەملاندنێك کە نە پشت بەستووە بە هاوشێوەکانی و نە دەگونجێت لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە پشت بەستوون بە ئاستێکی باڵا لە ڕاستگۆیی و ئەو سەرنجانەش (تحدی)یەکی ئاشکران بۆ دژ بە عەقڵانیەت و حەتمیەتی مەنهەجی زانستی نوێ و ڕێڕەوەکەی بەرەو پێشکەوتن، هەروەك هەوڵ دەدات کە ئەگەری بوونی پەیوەندییەکی ڕاوەستاو لەسەر خود بسەلمێنێت لە نێوان سەرچاوەکانی مەعریفەناسی و ئاوازەکانی توێژینەوەی مەنهەجی لەگەڵ ئەنجام لێ وەرگرتنەکانی زانستی نوێ دا.

((کردارە دروستەکان (دروست بەو مانایەی لە مەنهەجی توێژینەوەی زانستییدا بەکارهاتووە) بە دەگەمەن لە ئەنجامی هۆکارە دروستەکانەوە دێن)). لەبەر ئەوە زۆر پەسەندی ژیرییە کە دەستپێشخەرییەکەی کۆپەرنیکۆس بۆ دۆزینەوەی شتێك گەیاندی بە دۆزینەوەی شتێکی تری زۆر جیاواز. (هەروەك لەگەڵ نیوتندا ڕویدا کاتێك ویستی بگاتە دڵنیابوونی ڕەها، سەرەنجام گەیاندی بە چەمکی بەرەوپێشچوونی بەردەوام و یەك لەدوای یەك). لەم حاڵەتەدا ئەو زانایانە شێوازێکی

عەقڵانییان گرتەبەر (بە مانای بەکارهێنراو جارێکی تر لە مەنهەجی توێژینەوەی زانستییدا) لەبەر چەند هۆکارێکی ناعەقڵانی (هەر بەو مانایەی کە لە مەنهەجی توێژینەوەی زانستیدا بەکارهێنراوە). ئەو عەقڵانیەتەی کە وەك بەخت، یان ڕێکەوت، دادەنرێت، یان تەنانەت هاوڕێبوونی گونجاو لەگەڵ کۆمەڵێك داخوازی عەقڵانییەتدا. (ئەو بۆچوونەی کە هیگڵ ناوی ناوە ژیریی بەکار).

ئەو نووسەرانەی کە جەخت دەکەنەوە لەسەر خەسڵەتە ناوخۆییەکان، یان لەسەر ئەو ئەنجامانەی کە بەخت هاوڕێیانبووە بۆ ئەوەی ڕووناکی ببینن، ئەو نووسەرانە زۆرێك لە ئەگەرەکان پشتگوێ دەخەن بەبێ ئەوەی بە دوایاندا بگەڕێن، بەوەش غەمێك دەخەنە سەرغەمی بۆچوونی نادروستی عەقڵانی بوونی یەکلاکەرەوەی زانستی نوێ)) (فیرابند، ١٩٨١: بەشی دووەم: ٢٥– ٢٦٦).

لەم بوارەدا شایانی ئەوەیە ئاماژە بکەین بە ڕەخنەکەی (شیلەر) بۆ فەلسەفەی دانانی (کۆنت) وەك نموونەیەکی تر کە ئاڕاستەی دووبارە پشکنین بۆ مەعریفەناسی ڕوون دەکاتەوە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوت. ئەوەی بەهۆی پێداگری (شیلەر) لەسەر پێنەدانی سیفەتێکی باڵای پێشوەختە بە زانست بە بەراورد لەگەڵ ئایین و زانستەکانی سەروو سروشت.

((ئایین و میتافیزیکا و بیرکردنەوەی وچعی و ئاگاداربوون تەنها قۆناغی مێژوویی ڕووتی پەرەسەندنی مەعریفە نین، بەڵکو بۆچوونە جێگیرەکانی ژیریی و شێوەکانی مەعریفەیە و لە توانای هیچ کامیاندا نییە کە جێگەی ئەوی تریان بگرێتەوە، یان نوێنەرایەتی بکات)) (شیلەر، ١٩٦٣: وەرگێرانی کیرتز و بتراس ١٩٧٠: ١٦٤)، هەموو ئەو بۆچوون و ئاڕاستانە لێدانی پشتشکێنیان داوە لە وێناکردنە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بە مانای مێژوویی کە تێڕوانینێکی حەتمی دێنێتە کایەوە.

ئەمڕۆ لە دۆخێکدا نین کە بانگەشە بکەین بەوەی کە دۆزینەوە زانستییەکان سیستمێکی سیاسیی جیهانیی گریمانە دەکەن بەو شێوەی کە مارکسیزم بانگەشەی بۆ دەکات، بەڵکو پرسیاری میحوەری کە بەهێز خۆی دەخاتە ڕوو لە دیاریکردنی ئەو

گریمانەییانەدا خۆی دەبینێتەوە کە کارتێکردنی هەیە لە مەعریفەناسییەکانی زانست و دیاریکردنی ئەو بەهایانەی کە دەرەنجامەکانی زانست ئاراستە دەکەن وەك فۆرمێك لە فۆرمەکانی تەکنۆلۆژیا.

**ج- تێکچوونی پەیوەندیی نێوان ئەخلاق و ماددە:**

ڕەنگە پرسیاری بنەڕەتی لێرەدا ئەوەبێ: کام سیستمی بەهاکانە کە داهێنانە زانستییەکان ڕێنمایی دەکات؟ جۆری ئەو سیستمە جیهانییە چییە کە گەرەنتی ئەوە دەکات سەرکردەیەکی لەڕێ لادەر نەیەت لە پێناو سەپاندنی بۆچوونە سیاسییەکانی خۆیدا چەکی کیمیایی، یان ناوکی دژ بە نەتەوەکانی تر بەکاربهێنێت؟ ئایا هاوسەنگی ترس میکانیزمێکی کارایە بۆ جێگیرکردنی ئاشتی لە جیهاندا؟ ئەم پرسیارانە ڕۆژانە ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە و بەردەوام لە ڕیزی پێشەوەی ناکۆکییە سیاسییەکانە لەسەر گۆڕەپانی جیهانیی و نێودەوڵەتی. ئەو پرسیارانەش ڕەنگدانەوەی ئەو گۆڕانکارییە ڕیشەییە کە بەسەر تێڕوانینە زانستییەکان و پەرەسەندنە ماددیەکاندا هاتووە، لە هەر دوو نموونە مێژوویی و تازەگەرییەکەدا زانست و پەرەسەندنی ماددی لە ناوەرۆکدا وەك وێنەیەك لە وێنەکانی کەڵەکەبوونی زانستی وەرگیراوە، چونکە ئەو پەرەسەندنە ماددییە وەك ئاماژەیەك هاتووە لەسەر پێشکەوتن، پێشکەوتنیش هەمیشە و بەردەوام دیاردەیەکی ئیجابیە، لەگەڵ ئەوەشدا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا و بەدیاریکراوی لە دوای ئەو ئێش و ئازار و مەینەتییەی کە خستنەخوارەوەی بۆمبە ناوکییەکان بەسەر هێرۆشیما و ناکازاکیدا بەجێیان هێشت، ڕیزبەندی لۆژیکی لە نێوان ژیریی و زانست و پەرەسەندنی ماددی و پێشکەوتن و گەشبینی بە ئاینده، گۆڕا بۆ هەستکردن بە ترس و تۆقاندن لە ئەنجامی خەسڵەتە وێرانکارییەکەی زانستەوە.

شارستانێتییە تەقلیدییەکان لە کاتی خۆیدا دەیانتوانی سیستمە ئەخلاقییەکان بەشێوەیەکی کاریگەر ئاراستە بکەن بۆ ڕێنماییکردنی نموونەکانی تەکنۆلۆژیا و بەرهەمەکانی زانست، چونکە بەرهەمە ماددییەکان هەرگیز قۆرخ نەبوون لەسەر

بازاڕ. ڕاستە کە ئەو تایبەتمەندییە ڕێگربوو لە بەردەم پێشکەوتنێکی ماددی بەرچاو لەو سەردەمەدا، بەڵام ئەو بەها ئەخلاقییانە توانییان ـ لە هەمانکاتدا — ئارەزووی خراپ بەکارهێنان و چاوەڕواننەکراوی داهێنراوە تەکنۆلۆژیەکان دابمرکێتەوە.

لە ڕاستیدا شارستانێتی ڕۆژئاوا بە پشتبەستن بە خەسڵەتە تەکنۆلۆژییەکانی توانیویەتی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە ئامرازەکانی ڕێنماییکردندا ئەنجام بدات، چونکە زانست و تەکنۆلۆژیا بەو سیفەتەیان کە دوو گۆڕاون و پشت بەستوون بە ئامرازەکانی بازاڕ، کاریانکردووە لەسەر پێکهێنانی سیستمی ئەخلاقی نوێ لە کۆمەڵگەدا، هەروەها یاسا وەزعییەکانی ئامرازە ئابوورییەکان و هەموو پێوەرە مرۆییەکانی پووچەڵ کردۆتەوە، بە ڕاددەیەك ئەگەر زانستی ئابووری، ئەخلاقی پێش بخستایە بەسەر زانستە نامرۆییەکاندا ئەوا بە نەزانی تۆمەتبار دەکرایت، بە دوای ئەوەدا بەرهەمهێنانی ئامێرە تەقلیدی و ناتەقلیدییەکانی کوشتنی وەك بۆمبی کیمیایی و ناوکی لەلایەن پیشەسازییە جەنگییەکانەوە دەتوانرێت پاساوی هەبێت بە بەهانەی ئەوەی کە ئەو بەرهەمهێنانە بەشێکی زیندووە لەو چوارچێوە زانستییەدا.

هەروەك تێبینی دەکرێت پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییەکان دەگەنە لوتکەی چالاکییان لە کاتەکانی جەنگدا لە پاڵ ژمارەیەکی زۆرزۆری تر لەو دەزگا و ئامێرانەی کە ڕۆژانە بەکاریان دێنن، لەسەر ئەو بنەمایە بۆ ئامانجی جەنگی پەرەیان پێ دراوە، بۆیە ئەگەر کەسێك ئەو گریمانەیە بکات کە بەرهەمهێنانی زانست قۆرخ بوون لەسەر ئامرازەکانی بازاڕ، ئەوا جەنگ دەبێتە پێویستییەکی حەتمی بۆ خێراییدان بە بەرهەمهێنانی پیشەسازییە جەنگییەکان، ئەوەشمان تێبینی کرد کە سیاسەتمەداران و بڕیاربەدەستان دەستیان کرد بە تاوتوێکردنی کاریگەری ئیجابی دووبارە ئاوەدانکردنەوەی کوەیت لەسەر ئابووری ئەمریکا، هێشتا جەنگی کەنداو هەڕەشەی لە ملیۆنەها خەڵك دەکرد، ئێستاش ئەوەتا ئێمە ڕووبەڕووی ئیمپراتوریە فرەڕەگەزەکانی ئابووری دەبینەوە، کە گوێ نادەن و ملکەچ نین بۆ هیچ کام لە خواستە ئەخلاقییەکان، یان گریمانە پێوەرییەکان.

سەرکەوتنی ماددی پەیکەرەکان، کە پشت بە ئامێرە پیشەسازییەکان دەبەستن بەپێی شێوازێکی زانستییانە، بنەمایەکی ڕواڵەتییە و گوڕێك دەدەن بەو دروشمانەی کە سیما ئاڕاستەییەکانی بەرزبوونەوە و پەرەسەندنی مێژوویی و حەتمیەتی ئاڕاستەی مۆدێرنێتە بەرەو ژیانێکی چاکتر ڕوون دەکاتەوە: ((دۆزینەوەی ڕێبازی بیرکردنەوەی زانستییانە جیاکەرەوەیەکی کاتی بنەڕەتی هێناوەتەکایەوە لە نێوان قۆناغی پێش خۆی و ئەو قۆناغەی کە بە دوایدا هاتووە، تەنها بەدەرکەوتنی ئەو جیاکەرەوەیە دۆزینەوە پێشکەوتنخوازە بەرهەمهاتووەکانی زانستە سروشتییە نوێیەکان دەستیانکرد بەپێشکەشکردنی ئامرازێکی ئاڕاستەکردن بۆ لێکدانەوەی ژمارەیەکی زۆر لە لایەنەکانی ئەو پەرەسەندنە مێژووییانەی کە بە دوایدا هاتن)) (فۆکۆ یاما، ١٩٩٢: ٧٣).

بەو شێوەیە ئامرازەکانی بازاڕ زاڵبوون بەسەر بنەما ئەخلاقییەکاندا، بەڵکو کەوتنە پێشیان لە گرنگییدا، هەروەها ئەو ئامرازانە پێوەرە ئەخلاقییەکان بە هەڵواسراوەیی بەشێوەیەك لە شێوەکان بەجێ دەهێڵن، لە حاڵەتێکدا ئەگەر پەیوەندییەکیان هەبێ یان نا لەبارەی ئەو لێشاوە حەتمییەی ئامرازە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا، بەڵام لەبارەی ئەو سەرکەوتنە ماددیە ڕواڵەتییە و باڵادەستی ئەو کۆمەڵگەیانەی کە بە ئاستێکی پێشکەوتوو ڕێکخراونەتەوە، ئەوا ئەو مەترسییە ڕاستەقینەیە دەخاتەڕوو کە ڕووبەڕووی ئایندەی مرۆڤایەتی دەبێتەوە، چونکە لەدەستدانی توانای مرۆڤ بۆ کۆنترۆڵکردنی هێز و لێهاتنەکانی ژیانی، دەبێتە هۆی لەبیربردنەوەی هەستکردنی بە گۆشەگیری کە مانای کۆتایی ئینسانییەت و ئازادی دەگەیەنێت.

بەڵام حاڵەتی پاشکۆیەتی پلە دوو کە بەسەر بنەما ئەخلاقییەکاندا سەپێنراوە لەبەردەم یاساکانی تەکنۆلۆژیای ڕاماڵەرەوە، ئەوا مسۆگەرە کە دەبێتە هۆی دروستکردنی تێڕوانینێکی دەروونی کۆمەڵایەتی ستەمکاری بەشێوەیەکی جەوهەریی. (مامفورد، ١٩٦٦م) ئاماژە بەوە دەکات کە ئیشوکاری ئاڕاستەکراو بە

هۆی ئامێرکردنەوە ئەو وێرانییەی بەهۆی بەکارهێنانی ئامێرەکانەوە پەیدا دەبێت، دوو جەمسەرەکەی شارستانیەتی ڕۆژئاوا پێکدەهێنن، ئەو سەرکەوتنەی کاری پشت بەستوو بە ئامێر بە دەستی هێناوە، شیاوی ئەوە نییە کە بمانگەیەنێت بە جەمسەرەکەی تری، کە جەمسەرە وێرانکەرەکەیە. (ئیریك فرۆم) باس لەو پەیوەندییە دژوارەی نێوان تەکنۆلۆژیا و ڕێکخراوە لێزانەکان و مەیلی گۆشەگیری و ناهاوسەنگی ئەخلاقی ماددی دەکات کە دووچاری بونیادە ئەخلاقییەکە دەبێتەوە لە لایەك و جەمسەرە وێرانکەرەکەی تری شارستانییەت لە شیکردنەوەکەیدا بۆ سیمای ڕووخێنەری جەنگی نوێ لە لایەکی ترەوە، هەروەها ئاماژەی بەوە کردووە کە ((ئەو پیاوانەی بۆمبەکانیان دەخەنە خوارەوە ڕەنگە درك بەوە نەکەن بە هەزاران مرۆڤ دەکوژن و دەبنە قوربانی لە ماوەی چەند چرکەیەکی دیاریکراودا، ئەندامانی دەستەی فڕۆکەکە هەمیشە وەك تیمێك کار دەکەن یەکێکیان فڕۆکەکە لێ دەخوڕێت و ئەوی تریان بۆمباکە دەخاتە خوارەوە، ئەوانە هیچ باکیان نییە کە چ کوشتن و وێرانکارییەك دەکەن، بەڵکو ڕەنگە هیچ لە بارەی دوژمنەکەشیان نەزانن، چونکە ئەوەی لەو چرکەساتەی سەرقاڵیان دەکات ئەوەیە کە چەندە کۆنترۆڵی باشی ئامێرە ئاڵۆزەکانیان بە درێژایی هێڵەکە دەکەن، بەو شێوەیەی ئەوان لە ناو فڕۆکەکەیاندا ڕێکخراون، لە ئەنجامی هەڵنانیان بەو کارەیان هەزاران، بەڵکو هەندێجار سەدان هەزار کوژراو و سووتاو و تێکچووی لێ دەکەوێتەوە، بێگومان ئەوان لە زیهنی خۆیاندا وێنای ئەوە دەکەن کە ڕوو دەدات، بەڵام نازانن بە تەواوەتی لەسەر زەوی چی ڕوو دەدات، ئەوە مەسەلەیەکی ناکۆك و دژ بەیەکە، بەڵام لە ڕاستیدا گوێی پێ نادەن. ئەوانە – یان زۆربەیان بە لای کەمەوە – هەست بە کەمترین گوناه ناکەن لە کاتی جێبەجێکردنیان بۆ ئەو کارانەی کە پەیوەستن بە ناهەموارترین شتەوە کە مرۆڤ دەستی بۆ ببات، جەنگی ئاسمانی نوێ و دەرەنجامەکانی لە وێرانکاری بە هەمان بنەماکانی بەرهەمهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێ ڕەفتار دەکات، ئەوەتا کرێکارەکان و ئەندازیارەکانیش زۆر دوورن لەو تەکنۆلۆژیا جەنگییەی کە بەرهەمی

دەهێنن و بەردەوامیش دەبن لە ئەرکەکانیان بەپێی پلانی گشتی ئیدارەی کارگەکانیانەوە، بەڵام بە دەگمەن چاویان بە شێوەی کۆتایی بەرهەمەکەیان دەکەوێت، ئەگەر هاتوو چاویشیان پێ بکەوێت بایەخێکی ئەوتۆی پێ نادەن، چونکە هەر بە سادەیی بە بەرپرسیارێتی خۆیانی نازانن)) (فرۆم،١٩٩٠: ٤٦٠)، لەبەر ئەوە لەو قۆناغەی بەرهەمهێنانی تەکنۆلۆژیای جەنگدا، پرسیار لە بارەی پەیوەندی بەها ئەخلاقییەکان بە تەکنۆلۆژیاوە هیچ گرنگی، یان ئامانجێکی نابێت. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە: ((ئەوانە داوالێکراو نین بۆ ئەوەی پرسیار لە خۆیان بکەن کە داخۆ ئەو بەرهەمە بەسوودە، یان زیانبەخشە؟ ئەوە ئیدارەیە کە مافی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی هەبێ، ئەوەندەش کە پەیوەندی بە ئیدارەوە بێت، پەیوەستە بە ڕادەی سوودوەرگرتن لە قازانجە ماددیەکەی و ئیدارە هیچ پەیوەندییەکی بە بەکارهێنانی ڕاستەقینەی بەرهەمی کارگەکەیانەوە نییە)) فرۆم،١٩٩٠: ٤٦٠).

ئەم دیاردەیە دەنگدانەوەی کەڵەکەبوونی تێکچوونی هاوسەنگی پەیوەندی نێوان بەها ئەخلاقییەکان و بەها ماددییەکانە بەشێوەیەکی ترسناك کە هەڕەشە لە پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤی برایەوە دەکات.

ئەوەتا زۆرێك لە هۆکارە ئابوورییەکان و میکانیزمە سیاسییەکانە کە بەشدارن لە پرۆسەی کۆنترۆڵکردنی پەیوەندییە ئینسانییەکاندا، ئەوەش لە ڕێگای سەپاندنی یاسا زانستی و بابەتییەکانیانەوە بە شێوەیەك کە ناتوانرێت لێی لا بدرێت، تەنانەت پەیوەندی پیاو بە ئافرەتەوە کە دەخوازێت بەشێوەیەکی زۆر ڕێزدارانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەو سیفەتەی کە نموونەی یەکەمی پەیوەندییە ئینسانییەکانە، ئەویش بووەتە کەرەستەی خاوی پیشەسازی بەرەڵایی، کە ڕۆژئاوا خۆیشی دانی بەوەدا ناوە وەك ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی پێشکەوتنی ئابووری، کە مرۆڤێك هەڵدەستێ بە دروستکردنی پەیوەندییەك لەگەڵ مرۆڤێکی تردا بەس لە ڕێگای هۆکارێکەوە کە ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەبێ بە ڕژێمێکی دەزگایی پسپۆڕدا و کۆمەڵێك بەهای تایبەت دەکاتە یاسا بۆ ڕێکخستنی ئەو پەیوەندییە ئینسانییانە.

لەناو ئەم ژینگە کۆمەڵایەتییە بەماکینەکراوەدا ئەو کەسەی ـ بۆ نموونە ـ بڕێك پارەی بۆ خەرج دەکرێت بە تەنها مرۆڤ نییە، بەڵکو بەڕێوەبەرە لە کۆمپانیایەکدا، یان بەکاربەرێکی بەرهەمێکە و بەم شێوەیە تا دوایی. بۆیە لەسەرتە کە ڕیزبەندی پەیوەندییەکانت ڕێکبخەیتەوە بەو پێیەی کە یاساکانی ئەو ئامێرە پیشەسازییانە بۆتی دیاری دەکەن، کە ناسنامەیەکی تر بە شوێنکەوتووەکانی دەبەخشێت. بەو هۆیەوە ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی درۆینە بە دەورماندا پەیدا دەکات کە چوارچێوەیەکی بەهایی تایبەتمەندی دەبێت. هەتا ئەو ئامێرە پیشەسازییانە بەهێزتر و ئاڵۆزتربن بە هاوتەریب لەگەڵ پێشکەوتنی ماددییدا، دەرفەتی مرۆڤ بۆ کۆنترۆڵکردن و ئاڕاستەکردنی ئەو پێشکەوتنە کەم دەبێتەوە، بۆ ئەوەی بە هاوکاری کۆمەڵێك بەها و بنەما کە لە ئیرادەی ئازادی خۆیەوە هەڵقوڵابێت وەك بەڵگەیەك لەسەر بەردەوامبوونی مانەوەی خۆی. وەك ئەنجامێکی ئەو تێکچوونە دەروونی– بەهاییە کە لەگەڵ تێکچوونە ئەخلاقییە– ماددییەکەدا بە یەکدا چوون لە خاڵێکی مۆلەقی بەیەکگەیشتنی کۆمەڵایەتی دا، کۆمەڵگە دەگاتە حاڵەتێك لە پشێویی و بۆشایی ئەخلاقی، ئا لەو سنوورەدا، دیکتاتۆریەتێکی شاراوە کە خۆی لەو ئامێرە دەزگاییانەدا دەنوێنێت، کۆنترۆڵی ورد و درشتی ژیانمان دەکەن لە ڕێگای چەند بەهایەکی نێوەندەوە تا کۆتایی دێت بەو جیاوازییەی نێوان ئەخلاقییات و ماددییات.

دوای ئەوەش بەجیهانیکردنی فەرهەنگی ئینسانی دێت بۆ پێکهێنانی پرۆسەیەکی بەگەڕخستنی ئەو بەها پەرپوتانە و دانان وەك پێوەر بۆ ڕەفتاری مرۆڤەکان و دەستووری پەیوەندییە مرۆییەکان، سیمای پراگماتیزمی تێکەڵبوو بەجیهانیکردنیش جۆرێك لە ڕواڵەتیبوون و سادەییکردنی نابەرابەر بۆ پەیوەندییە ئینسانییەکان دروست دەکات، ئەو ڕواڵەتیبوون و سادەییکردنەیە کە توانای سروشتی ئینسانی سنووردار دەکەن بۆ هێنانە کایەی کۆمەڵێکی بڵند و جێگیر لەسەر بنەما و ڕێسای ئەخلاقیی، هەروەك شوێنکەوتەیی و ملکەچبوونی زەلیلی بۆ ئەو بەها تەقەنییە بە زۆر سەپێنراوانە دەبنە هۆی زیادبوونی هەستکردن بە

نیگەرانی و ڕقلێبوون بەرامبەر ئەو تێکچوونە ئەخلاقی ـ ماددییە، بۆیە ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئێمە لێك جیابوونەوەیەکی مێژوویی دەبینین لە نێوان سیستمی بەها ئەخلاقییەکان و پەرەسەندنی ماددی لە شارستانێتی ڕۆژئاوادا، کە یەکێکە لە نیشاندەرە بنەڕەتییەکان لەسەر ئەو قەیرانە ژیارییەی کە خەریکە دەبێتە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر.

**د– تێکچوونی هاوسەنگی ژینگەیی:**

ململانێیەکی گەرم هەیە لە نێوان دوو تێڕوانینی بنەڕەتی ئامێرەکانی کاری شارستانێتی ڕۆژئاوادا، مەبەست لێی تیۆری میکانیکیەتی سروشتی گەردوونی نیوتن و تیۆری میکانیکیەتی تەکنۆلۆژیای پیشەسازییە. لە میانەی قۆناغی یەکەمی فراوانخوازی سەرمایەدارییدا لە بری گریمانەکردنی دژایەتی، تەسلیم بە تەواوکاری نێوان ئەو دوو تێڕوانینە بووبوون، لەمیانەی گەڕان بەدوای ئازادی و ئاسایشدا بۆ گەیشتنی مرۆڤ بە چڵەپۆپەی تەواوخوازی و خودیی، دوای ئەوە قۆناغی ملکەچکردن بۆ میکانیکییەتی دروستکراو و کردن بە ماکینە هات وەك ئامڕازی نێوەند بۆ گەیشتن بە ئەنجامدانی دوورمەوداترین خەونەکانی مرۆڤایەتی لە مێژوودا، ئەوەش خەونی کۆنترۆڵکردنی سروشت بوو.

بەڵام لە میانەی چەند دەساڵی ڕابردوودا پرۆسەی ئاڵوگۆڕکردنی ئەو خەون و پەرۆشەی مرۆڤ (مرۆڤی ڕۆژئاوایی) بۆ داگیرکردنی (سروشت) گۆڕدرا بۆ خەونێکی تر، کە ئەویش هەوڵی پاراستنی هاوسەنگی ژینگەییە، ئەوە کاتێك ڕوویدا کە مرۆڤ درکی بەوەکرد کۆنترۆڵی بەسەر تەکنەلۆژیادا ونکردووە و چیتر ناتوانێت کاریگەرییە وێرانکەرەکەی بەسەر سروشتدا سنووردار بکات، چەندین بەڵگەش هەیە کە ئاماژە دەکەن بۆ تێکچوونی هاوسەنگی ژینگەیی، وەك تێکدانی ژینگەی سروشت و تەواو بەکارهێنانی سەرچاوە سنووردارەکانی ژینگە و فراوانبوونی ترسناکی شێوازەکانی ژیانی عیمرانی، ئەو بەڵگانەی کە بۆ چەند دەیەیەك جێگای ڕەخنەلێگرتن نەبوون،

بەو پێیەی کە دەرەنجامێکی حەتمی پێشکەوتنی ئابووری و پەرەسەندنی ماددی بوون.

بەڵام هەرکە دەیەی هەشتاکانی (سەدەی بیستەم) هات، سروشت یاخی بوونی خۆی بەرامبەر ئەو پێشێلکارییانە ڕاگەیاند کە بوونەتە هۆی لێکهەڵوەشانەوەی مەسەلەی کونی (ئۆزۆن) و گۆڕانکارییەکانی کەشوهەوا و کاریگەری گەرمکەرەوەی (زۆپا سەوزەکە) و مەترسی ڕوو لە زیادبوونی تیشکەکان، هەموو ئەوانە سەلماندیان کە پرۆسەی کۆنترۆڵکردنی مرۆڤ بەسەر ژینگەدا بە مەبەستی فراوانکردنی بازنەی ئازادی و ئاسایشی خۆی، لە ڕاستیدا وای لێهاتووە کە هەڕەشە بن لەسەر مانەوەی مرۆڤ لە ژیاندا و ئەو مانەوەیەش ئەوەندە گرنگە بەشێوەیەك کە مەرجی بنەڕەتی بۆ سەقامگیربوونی ئاسایشی و خودیی مرۆڤ پێکدێنێت.

لەم سەردەمەی ئێستاماندا، پێویستبوو ملبدەین بەو ڕاستییەی کە هیچ گومانێك هەڵناگرێت، ئەویش ئەوەیە کە کاریگەری میکانیزمی پیشەسازی لەسەر سیستمی ژینگەیی جیهانیی بەشێوەیەك گۆڕاوە کە ببێتە نیشانەی پرسیارێکی نیگەرانکەر لەبارەی بەدیهێنانی ئاسایشی و خودیی بۆمرۆڤ. هەر لە سەرەتاوە میکانیزمی تەکنۆلۆژی دەستی کرد بە دووبارە دروستکردنەوەی پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوە وەك نموونەیەکی بچوککراوەی نموونەکانی ئیرادەیی ئینسانی، دوای ئەوە و لە قۆناغێکی دیاریکراوی پێشکەوتندا، ئەو میکانیزمانە دەستیانکرد بە دووبارە پێکهێنانەوەی تایبەتمەندییە ژینگەییەکانی تێڕوانینی (نیوتن) بۆ میکانیکییەتی سروشتی گەردوون، بەم شێوەیە قەیرانەکە بەردەوام بوو لە فراوانبوونی ڕووبەری کارتێکردنی و درێژبوویەوە بۆ پەیکەرە ناوخۆییەکانی ڕژێمە حوکمڕانەکان[٨] و

---

[٨] کێشەی ژینگە یەکێکە لە کێشە سەرەکییەکان لای هەریەك لە ناسیۆنالیستەکانی ڕووس و بەرەکانی گەل لە کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو.

سیاسەتی نێودەوڵەتیش، تا کەموکورتییە ژینگەییەکان گەیشت بە دۆخێکی بەگیرهاتوو لە میانەی دوادەیەکانی سەدەی بیستەمدا، بە پلەیەك کە ڕژێمە سیاسییەکان نەیاندەتوانی دەرەنجامەکانی ئەو کەموکورتییە کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابوورییانە فەرامۆش بکەن.

بۆیە دەوترا کە ڕووداوی (چیر نۆبڵ) ڕۆڵی هەبوو لە پەلەکردن بۆ دانانی سیستمێکی کراوەی ئابووری و سیاسیی لە یەکێتی سۆڤیەتدا بە ئاڕاستەی جێبەجێکردن، پاساوی (گۆرباچۆڤ)یش بۆ سیاسەتی دەرەوەی پشت بەستوو بوو بە باکگراوندێکی ئینسانی، کە دەڵێت: هەموو نەوەکانی مرۆڤایەتی لەسەر پشتی هەمان کەشتی دەپەڕنەوە و مەترسییەکیش هەیە کە هەڕەشە لە مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەکات، ئەو پاساوەی کە بەشێوەیەك لە شێوەکان ئاماژەبوو بۆ ڕەهەندەکانی قەیرانە ژیارییەکە و مەودای کارتێکردنی لەسەر ڕژێمە سیاسییەکان، دوابەدوای ئەوە ئەو قەیرانە پشکی شێری لە کارنامەی کۆبوونەوەکانی سیستمی جیهانیدا داگیر دەکرد، کۆدەنگییەکی هەمەلایەنی دەرکەوت لەسەر پێویستی هێنانە کایەی هاوکارییەکی نێودەوڵەتی بۆ باشترکردنی هەلومەرجە ژینگەییەکان و لەسەر زمانی زۆرێك لە سەرکردە سیاسییەکانی دەوڵەتە جیهانییەکانەوە قسەی لە بارەوە دەکرا، بە تایبەتی لە میانەی کۆنگرەی لووتکەی زەوی کە لە تەمموزی ١٩٩٢دا سازکرا. لەگەڵ ئەوەشدا ناکۆکی لە نێوان باکوور و باشووردا، یان لە نێوان جیهانی پیشەسازی و جیهانی تازە گەشەکردوودا، لە میانەی چالاکییەکانی ئەو لووتکەیەدا

---

گراسنوف دەڵێت: ((لە نیسانی ١٩٨٩ کوڤالێشۆك- کە دواتر بوو بە سەرۆکی لیژنەیەکی حکومی تایبەت بە ژینگە لە یەکێتی ڕووسدا- وریایی دابەوەی کە کارەساتێکی ژینگەیی بەکردەیی دەستی پێ کردووە، لەوانەشە بگاتە خاڵی نەگەڕانەوە لە وڵاتەکەماندا، هیچ ئاماژەیەکیش نیە بۆئەوەی حاڵەتەکە لە کۆمارەکانی سۆڤیەتدا باشتر دەبێت. بزاڤی سەوزی سۆڤیەتی بووەتە هێزێکی کاریگەر، بەشێوەیەك کە حکومەت ناتوانێت بەئاسانی فەرامۆشی بکات. (گراسنوف،١٩٩١: ٤١).

بووە هۆی دەرکەوتنی چەند ئاماژەیەکی ئاگادارکردنەوە بۆ ئەگەری ڕوودانی ناکۆکی بەرژەوەندییەکان لە ئایندەدا، کە پاڵنەر دەبێت بۆ هەستکردن بە پێویستی هاوکاری دووردەبێت لە ئەگەری بەدیهاتن، چونکە هەندێ لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان، لەوانە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تایبەتی، لە هەڵوێستەکەیاندا هەستکردنێکی دەروونی بۆ ئیستیعماری نوێ دیار بوو، ئەوەش لە میانەی پێشنیازێکدا دەرکەوت کە پێشکەشی کرد بوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، ئەوەبوو پێشنیازی کردبوو دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان هەندێ قوربانی بگرنە ئەستۆ لەسەرحسابی پرۆژەکانی گەشەپێدانیان بۆ بەشداریکردن لە پاراستنی ژینگەدا، بەبێ ئەوەی هیچ ڕێوشوێنێکی هاوشێوە ئەنجام بدرێت لە ماکینە گەورەکانی بەدەستهێنانی قازانجی سەرمایەداری لە جودیی ئەمریکا خۆیدا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کەمترین بایەخی نەدا بە جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکانی ئەو لووتکەیە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی پێشەوە دەتوانین بڵێین سیاسەتی دوو پێوانەیی هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە و دژ بە گەشەکردنی ئاسایشی ژینگەی جیهانیی دروست دەکات، چونکە کارەساتی ژینگەیی ئێستا دەرەنجامێکی بەکارهێنانی نابەرپرسیارانەی بەروبومە سروشتییەکانە لە لایەن هێزە کۆلۆنیالیستەکانەوە. لە بری ئەوەی کە خۆیان باجی تاوان و پێشێلکارییەکانی خۆیان دژ بە ژینگە لە ڕابردوودا بدەن، دەیانبینین هەوڵ دەدەن پلانەکانی گەشەپێدانی ئایندەی تایبەت بەو دەوڵەتانە سنووردار بکەن کە لە سەرەتای ڕێگای پێشکەوتندان، ئەوەش دەبێتە هۆی خراپی کەڵەکەبوونی کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان لەو دەوڵەتانەدا.

ڕەنگە کارەساتی ژینگەیی یەکێك بێت لە دەرەنجامەکانی جەنگ بە پشتبەستن بەو ڕاستییەی کە جەنگ یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بە هۆیەوە دەست دەگیرێت بەسەر سەرچاوەکانی ژینگەی سروشتیدا. لەوانەشە ئەو مەترسییەی کە هەڕشە لە ئاسایشی و خودیی مرۆڤ دەکات، ببێتە هۆی دارشتنەوەیەکی نوێی چەمکەکانی

جیۆسیاسی لە پێناو دیاریکردنی پلەبەندی نێوان ئەو ناوچە جوگرافیانەی کە خاوەنی ژینگەیەکی سەقامگیر و دەوڵەمەندن بەسەرچاوە سروشتییەکان، بۆیە پێویستبوو لەسەرمان ئەوە لەبەرچاو بگرین کە سیستمی کۆلۆنیالیستی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەدروست دانرابوو، هەروەها هەردوو جەنگە جیهانییەکەش لە سەدەی بیستەمدا پاساودرابوو، شانازی لەوەشدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تیۆرە جیۆسیاسیانەی کە ڕێگایان سازکرد لە بەردەم هێزە ڕۆژئاواییەکاندا بۆ زەوتکردنی سەرچاوە سروشتییەکانی دەوڵەتەکانی تر.

بەلای ئێمەوە هۆکاری سەرەکی ئەو کێشە ژینگەییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانەی کە هاتووە بەسەر پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوە، زۆرێك لە شارستانێتییە کلاسیکییەکان سروشتیان وەك بەخششێکی خوایی و پێگەیەکی زیندووی شیاو بۆ مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی دادەنا، ئەو تێڕوانینە کۆنە لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونەی تێدابوو کە پەیوەندییەکی پشت بە یەك بەستووی ئاڵوگۆڕ لە نێوان و خودیی مرۆڤ و خودیی سروشتدا هەیە، بەڵام تەکنۆلۆژیا سەرمایەدارییەکە بەو سیفەتەی فاکتەری دیاریکەری و خودیی سروشتی و ماددی و کۆمەڵایەتی ڕەگەزی مرۆڤە لە نموونە تازەگەرییەکەدا، ڕۆڵی نێوەندکاری لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا وەرگرتووە، دوابەدوای ئەوەش ئەو تەقەنیاتە نرخی بازرگانی دیاری دەکات، نەك تەنها بۆ کۆششی ماندووبوونی مرۆڤ، بەڵکو بۆ پێکهاتە لێ وەرگیراوەکان لە سروشت کە لە ڕووی ئابوورییەوە قازانجبەخشن، بۆیە شیاوی ئەو تەقەنیاتە بوو لەو ڕۆژگارەدا بۆ هێنانەدی کۆنترۆڵی کۆتایی مرۆڤ بەسەر سروشتدا، بۆ هێنانەدی خەونی بەهەشتی دنیایی لەسەر زەوی.

بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا ئەو گۆڕانە ڕیشەییە دەردەکەوێت کە بەسەر تێڕوانینی مرۆڤدا بۆ سروشت هاتووە بەو شێوەیەیی کە لە شارستانێتییە کلاسیکی و تازەگەرییەکاندایە لە میانەی وتاری پێشەوای هیندییە سوورەکان کە ناسراوە بە (سیاتل) کە ناردی بۆ حکومەتی ئەمریکی، ئەوەش لە ١٨٥٤دا نووسیبووی کاتێك

داوای لێکرا زەوی گەلەکەی بفرۆشێت بە حکومەتی ئەمریکی، لە وەڵامدا دەڵێت: (سەرۆکی گەورە لە واشنتۆن نامەیەکی ناردووە تیایدا داوای کڕینی زەوییەکەمان لێ دەکات، چەندە لەلام جێگای سەرسوڕمانە مرۆڤ چۆن دەتوانێت کڕین و فرۆشتن بە ئاسمانێك بکات سێبەری بۆ دەکات و زەوییەك کە دەیگرێتە ئامێز؟ ئەو بیرۆکەیە زۆر نامۆیە بۆ ئێمە، ئەگەر تۆ خاوەنی شنەی هەوا و هاژە هاژی ئاو نەبیت، چۆن دەتوانیت بیفرۆشیت؟ هەموو گەردە لمێکی ئەم زەوییە پیرۆزە لای گەلەکەم، ئێمە بەشێکین لێی و ئەویش بەشێکە لە ئێمە، گوڵە بۆنخۆشەکان خوشکمانن، گاکێوی و ئەسپ و هەڵۆگەورەکان برامانن، تاشەبەردەکان و شیلەی باخەکان و گەرمای جەستەی پڵنگ کە لە تەنیشت هاوڕێکەیەوە زەوی دەبڕێت، هەموو ئەوانە سەربەیەك خێزانن، بۆیە سەرۆکی گەورە لە واشنتۆن کاتێك نامە دەنێرێت و تیایدا داوای کڕینی زەوییەکەمان لێدەکات، ئەوا داوای شتێکمان لێ دەکات کە لە توانای ئێمەدا نییە، ئێمە دەزانین کە مرۆڤی سپی دابونەریتی ئێمە درك ناکات، زەوی ئێمە لە چاوی ئەودا وەك ئەو زەویەیە کە بە دوایدادێت، بەشێوەیەکی نامۆ و لە تاریکە شەودا بەنهێنی هاتووە زەوییەکەمان لێ زەوت بکات، ئەو هەرگیز سەیری زەوی ناکات وەك خوشکی خۆی، بەڵکو هەمیشە دوژمنە بۆی.، کاتێك چڕنووکەکانی لەناو سکی زەویدا دەچەقێنێت و هەموو خێر و بەرەکەتەکەی دەردەهێنێت و کۆڵ نادات و هەوڵدەدات بۆ داگیرکردنی زەوییەکانی تر، بەوەش داناکەوێت، بەڵکو نرخێکی بۆ دایکە زەوی دیاری کردووە و نرخیشی بۆ ئەو ئاسمانە داناوە کە ڕۆژێك خوشکی بووە، هەروەك هەر کەو پەلێکی تر کە فرۆشتن و کڕینی پێوە دەکرێت، یان مەڕ و ماڵاتە و بەتاڵان دەبرێت، حەز و ئارەزووی کراوەتەوە بۆ هەڵلووشینی زەوی و وەك بیابانێکی تەخت و وشك بەجێی بهێڵێت، کاتێك دەڕۆیت بۆ شارەکانی سپی پێستەکان شوێنێکی ئارامت دەست ناکەوێت، باخ و درەختانێك نییە کە گوێت لە دەنگی لەرینەوەی گەڵای درەختەکان بێت لە بەهاردا، یان گیزەی باڵەکانی مێرووەکان، ئێمە تەواو دڵنیاین کە ئەم زەوییە ناگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ، بەڵکو ئەوە

مرۆڤە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم زەوییە، هەموو دروستکراوەکان کە پەیوەندی خوێن لە نێوانیاندایە سەر بەیەك خێزانن و هەموو شتەکان یەك شتن)[٩].

بنەماکانی گۆڕانی ڕیشەیی بەگوێرەی تێگەیشتنی مرۆڤ لەبارەی سروشتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانکارییە مەعریفیی و مەنهەجییانەی کە لە دوای سەردەمی ڕێنیسانسی ئەوروپاوە سەریان هەڵدا، هەروەك (بایکون/١٩٩٠: ٢١٠) وەسفی ئامانجەکانی (ئەنجومەنی سالمون) دەکات، ئەو ڕێکخراوە زانستییەی کە لە تێڕوانینە یۆتۆپیاکەیدا وایداناوە کە ئەتلانتیکی نوێ باشترین نموونەیە بۆ تێڕوانینی ژینگەیی نوێ، ئەوەش بە گریمانەکردنی بەدیهاتنی کۆنترۆڵی تەواو بەسەر سروشتدا، بایکون دەڵێت: ((دوایین خشت لە کۆشکی زانیارییماندا بە دۆزینەوەی زانیاری پاڵنەر و بزاوتە شاراوەکانی بوونەوەرەکان و ڕەهاکردنی ملی ئیمپراتۆریەتی مرۆڤایەتی دێتەدی، بۆ ئەوەی دەستی مرۆڤ درێژ ببێت و کاریگەرییەکانی تا ئەوپەڕی توانا هەموو شتەکان بگرێتەوە)). بایکۆن خەیاڵی ئەوە دەکات ژینگەیەکی دروستکراو لەناو کۆمەڵگەدا بە هۆی لاساییکردنەوە و داهێنانە زانستییەکانەوە پەیدا ببێت و لەسەر قسەکانی دەڕوات: دەوروبەرێکمان دەبێت پڕبێت لە بۆنە خۆشەکان، لە حاڵێکدا شارەزاییەکانمان بەتام دەکەین و تێکەڵ بە عەترە بۆنخۆشەکانی دەکەین کە لەوانەیە لە سەرەتاوە کەمێك پێکەوەگونجاو دەرنەکەون، بەڵام بە هەرحاڵێك بێت تێکەڵیان دەکەین بۆ بەدەستهێنانی عەتری نوێ کە جیاوازن لەوەی لێیەوە وەرگیراوە، هەربەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خواردنەکانیش دەکەین بۆ یاریکردن بە زەوقی خەڵك، بەڵکو خانوومان دەبێت کە ماتۆڕ و ئامێری بۆ هەموو جۆرە جوڵەیەك هەبێ، ئەوەش دەرفەتێکی باشە بۆ لاساییکردنەوە و ڕاهاتن بۆ ئەوەی جوڵەیەکی هێمنانەتر و ئاسانتر بکەین، هەروەها تفەنگی باشتر لە کۆنەکان

[٩] ئەم دیکۆمێنتە مێژووییەی پێشەوای هیندییە سورەکان لە کتێبخانەی واشنتۆن پارێزراوە، ڕۆژنامەی سەندای ستار لە بەرواری ٧/حوزەیرانی/١٩٩٢دا دەقی تەواوی بڵاو کردۆتەوە.

دروست دەکەین، یان لە هەرکام ئامێرە ژەنگگرتووەکان بۆ ئەوەی زۆر ئاسانتر و بە کەمترین تێچون کۆنترۆڵی شتەکان بکەین. لە داهاتوودا ئۆتۆمبێل و هۆکاری تر بەکار دێنین، کە بەهێزتر و توندتر دەبن لە هاوشێوەکانیان، بەو شێوەیە زاڵ دەبین بەسەر بەهێزترین تۆپهاوێژ و دەزگاڕاکێشەرە زەبەلاحەکاندا، هەروەك هەموو جۆرە ئامێر و ئامرازێکی جەنگی و ماتۆڕەکانمان بەرەوپێش بردووە. لە دواڕۆژدا تێکەڵەیەکی نوێ لە باروت و ئاگری گریکەکانمان دێتە دەست کوژاندنەوەی بۆنە بێت)) (بایکۆن، ١٩٩٠: ٢١٣).

ئێستا ئەگەر بەراوردێك لە نێوان ئەو دوو دەقەی سەرەوەدا بکەین، لە مەودای ڕاستی و دروستی ئەو دوو پێشبینیەمان دڵنیا دەبین. زۆرێك لەو ڕواڵەتانەی کە بایکۆن لەوێناکردنەکەیدا بۆ یۆتۆپیای ئەتلانتیکی نوێ باسی کردوون، ئێستا هاتوونەتە دی وەك تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی چەمکەکانی کۆمەڵگەی زانستی، لەوانە بۆ نموونە ئاوەدانییەك کە پڕبێت لە بۆن و بەرام، خانووی خاوەن ماتۆڕی جوڵێنەر (کە مەبەستی فڕۆکەیە) کە دەفڕێت بە هەوادا، لەگەڵ ئەوەشدا پێشبینیەکەی پێشەوای هیندییە سوورەکانیش هاتۆتە دی، کاتێك ئاماژەی بەوەکردووە کە: حەز و ئارەزووی پیاوی سپی مەیلی بەوەیە هەموو زەوی حەپەلووش بکات تاوەك بیابانێکی وشك و ڕووتەڵەی لێ دێت))، ئەوەش لەکاتێکدا چینی ئۆزۆن تەواو دەبێت و ئەو کونەی تێ دەکەوێت کە بووەتە هۆی گۆڕانی کەش و هەوای جیهانیی و دیاردەی بە بیابانبوون و چەندین جۆری تری بۆن و بەرامەی تری هەواو ماتۆڕە نوێیەکانی تری ئەتلانتیکی بەدوای خۆیدا هێناوە.

دەتوانین بگەڕێین بەدوای سەرچاوە فەلسەفییەکانی چەمکی ڕۆژئاوایی، بەرامبەر بە سروشت هەروەك مارکس (١٨٧٦: ٨٢٠) دەڵێت: هەروەك مرۆڤی سەرەتایی چی کردووە کاتێك ململانێی کردووە لەگەڵ سروشت بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی خۆی و بۆ ئەوەی بژی و زۆر ببێت، پێویستە لەسەر مرۆڤی شارستانی نوێ هەمان شت بکات، بەڵکو پێویستە لەسەری درێغی نەکات لە کردنی

هەموو شێوازە کۆمەڵایەتییەکان، لە ژێر هەر هەلومەرجێکدا بێت. لەگەڵ پێشکەوتنی مرۆڤدا چوارچێوەی پێداویستییە مادديیەکانی فراوانتر دەبێت بە ئەندازەی فراوانبوونی پێداویستییەکانی خۆی، بەڵام لە هەمانکاتدا، هێزەکانی بەرهەمهێنان ئەوانەی کە هەڵدەستن بە تێرکردنی پێویستییەکانی، بەردەوام لە زیادبووندا دەبن. لەم بوارەدا ئازادی لەسەر جۆری پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوە ڕادەوەستێت، کە بەبێ زاڵبوون بەسەر سروشتدا نایەتە دی، لە بری ئەوەی مرۆڤ لە ژێر کۆنترۆڵی سروشت و یاسا کوێرەکانی گەردووندا بێت، ئەو کاتە لە توانایدا دەبێت زاڵ بوون بەسەر سروشتدا بهێنێتە دی بە کەمترین وزەی بەکارهێنراو لە باشترین هەلومەرجێك دا کە شیاوی سروشتی مرۆڤایەتی بێت)).

کەواتە دوو فۆرمی پەرگیری بەرامبەر یەك هەیە بۆ پەیوەندی مرۆڤ بە ژینگەوە، کە لە میانەی ئەم پێشەکیەوە ڕەچاو دەکرێت ئەوانەش:

یان ملکەچبوون بۆ یاساکوێرەکانی گەردوون، یان هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی سروشت و ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژی هەموو ڕێیازە لیبراڵیزمە سەرمایەدارییی و مارکسیزمەکان، کە پێکەوە بەشدارن لە نموونەی مۆدێرنێتەدا لەم تێڕوانینەدا، پێکەوەگونجان لەگەڵ سروشت، هەروەك لە گوتاری پێشەوای هیندییە سوورەکاندا هاتووە و چەندین نموونەی تر هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ شارستانێتییە تەقلیدییەکان، ئەو پێکەوەگونجانە لە لایەن نوخبەی فیکری و سیاسییەوە فەرامۆشکراوە، ئەوەش هێزی پاڵنەری شارستانێتی ڕۆژئاوایە، بەهۆی ئارەزووی مرۆڤ بۆ زاڵبوون بەسەر سروشتدا. لەو میانەدا ڕووداوی (چیر نۆبل) تەنها دەرەنجامێکی خراپی ئیدارەی یەکێتی سۆڤیەت نەبوو بۆ چۆنێتی سەرپەرشتیکردنی دامەزراوە ئەتۆمییەکان، یان کەمتوانایی تەکنۆلۆژیا و بەس، چونکە ڕوودانی ئەو جۆرە کارەساتە ژینگەییانە لەو دەوڵەتە پێشکەوتووانەدا بە بەراورد لەگەڵ توانای تەکنۆلۆژی و ڕێکخستنی ئیداریان، ئەوە دەسەلمێنێت کە پرسیارکردن لە بارەی تێکچوونی هاوسەنگی ژینگەیی پێویستی بەوەیە بە دوای وەڵامدا بگەڕێیت بۆی لە

میانەی وێنای جیهان لە ڕوانگەی شارستانێتی ڕۆژئاواوە، نەك تەنها لە ڕوانگەی لێهاتن، یان نەبوونی لێهاتنی ئیدارییەوە، لەبەرئەو هۆیە، کێشەی تێکچونی هاوسەنگی ژینگەیی وەك ڕەهەندێك لە ڕەهەندەکانی قەیرانە ژیارییەکە ناتوانرێت بە تەنها لە ڕێگای هەیکەلە بونیادی و دامەزراوەییەکانەوە چارەسەری بۆ دابنرێت، یان تەنها ئامادەکردنی ڕاپۆرتی ڕێك و ڕازاوەی شارەزایانەوە، ئاشکرایە کە بە هۆی زۆربوونی دانیشتوانەوە، ڕەگەزی مرۆڤایەتی لە توانایدا نابێت قوربانی بدات بە پەرەسەندنی تەکنۆلۆژیی، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ گومان لەوەدا نییە کە شێوەی باوی تەکنۆلۆژیا و ڕەفتاری مرۆڤی هاوچەرخ بەو پێیەی تەواوکەرە بۆ ڕەهەندەکانی کێشەکە، بە مسۆگەری دەبنە هۆی خراپ کەڵەکەبوونی ئەو کێشە ژینگەییە، کە بێگومان کارەساتێکی ژینگەیی بە دوایدا دێت.

لێرەوە دووبارە داڕشتنەوەی فەلسەفییانە دەبێتە مەسەلەیەکی حەتمی لەو بوارەدا کە پەیوەستە بە پەیوەندی مرۆڤ بە ژینگەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە شارستانێتی ڕۆژئاوایە کە پێویستی بە فۆرمێکی ڕەخنەیی ڕاستەقینە هەیە بۆ سیستمی بەهاکان و دووبارە داڕشتنەوەی فەلسەفییانە بە گەڕانەوە بۆ شارستانێتییەکانی تر، بەڵام نابێ مل بەوە بدرێ کە ئەو کێشەیە تەنها کێشەیەك، یان دیاردەیەکی ناوخۆیی تایبەت بە شارستانێتی ڕۆژئاوایە بەبێ ئەوانی تر، سەرباری ئەوەش گرێیەکی تر لەم قۆناغەدا دەردەکەوێت کە ئەویش کێشەی ڕووکەشی بوون و لاوازی شارستانێتییە ڕەسەنەکانە، کە لە ئەنجامی کۆنترۆڵی قۆرخکارییە هەیکەلییەکانی شارستانێتی ڕۆژئاواوە هاتووەتە کایەوە.

**ھ: قۆرخکردنی فەرهەنگی ئینسانی، یان کۆتایی فرەیی:**

ئەو قەیرانە ژیارییەی پێشتر قسەمان لەبارەوە کردووە، یەکەمین نییە و دوایەمینیش نابێت کە بە درێژایی مێژوو ڕوو بدات، بەڵام جیاکارییەکەی لەو تایبەتمەندییە قۆرخکارییەدایە کە تاقانەیە تیایدا، لە ڕابردوودا چەندین قەیرانی ژیاریی تر چارەسەر کراوە بە سوودوەرگرتن لە بنەما و پێوەری ئەخلاقی نوێ، کە

لە ژیارەکانی ترەوە وەردەگیرا. تێکەڵکردن لە نێوان بیروبارەڕەکاندا لە ڕێگای چەندین خاڵی بە یەکگەیشتن لە نێوان دوو شارستانێتیدا، یان زیاتر یارمەتیدەر بووە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری سەرکەوتوو بۆ ئەو کێشە و گرفتانە لە میانەی هاوپیتاندنی فیکری بۆ بەها و ئەخلاقییاتی نوێی کاریگەر، ئەمڕۆ ئێمە ئەو جۆرە بەدیلانەمان نییە بەهۆی ناکۆکی دۆخی ئێستامان لەگەڵ شارستانێتییەکانی تردا.

شارستانێتییە ڕەسەنەکان بەهۆی ئاگری هەیمەنەی تازەگەری شارستانێتی ڕۆژئاواوە ژیان و پێکەوەژیانیان لە توانادا نییە، لەبەر ئەوە هەڵسانەوەی ئەو شارستانێتییە ڕەسەنانە لە بەرامبەر سیاسەتی هەیمەنەی قۆرخکاری کە شارستانێتی ڕۆژئاوا گرتوویەتەبەر، یەکێکە لە دژوارترین تەنگژە کە لەم سەردەمەدا ڕووبەڕووی دەبینەوە، چونکە بەرەنگاربوونەوەی ئاشکرای ڕۆژئاوا پەراوێزخستنی ئەو کولتوور و فەرهەنگە ڕەسەنانەی مەبەستە و کار دەکات بۆ جێگیرکردنی سیستمێکی یەکگرتوو لە بیروڕاو شێوازەکانی ژیان لە هەموو دونیادا، ئەو سیستمە یەکگرتووەش هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە دروست دەکات کە زیان بە فرەیی کەڵەکەبووی فەرهەنگ و کولتووره مێژووییەکانە لە ژیانی مرۆڤایەتییدا.

ئارنۆڵد توینبی لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا ڕوونیکردۆتەوە کە لە میانەی بیست و شەش شارستانێتیدا بەلای کەمەوە شانزەیان لەناوچوون و لەبیر چوونەتەوە. لەوانەش شارستانێتی میسری کۆن، شارستانێتی ئیندیز، شارستانێتی چینی، شارستانێتی کریتی و شارستانێتی سۆمەری، شارستانێتی مای یان هیندی، شارستانێتی ئەنادۆڵ، شارستانێتی سریانی، شارستانێتی گریك، شارستانێتی بابلی، شارستانێتی مەکسیکی، شارستانێتی عەرەبی، شارستانێتی هیندوراسی کۆن، شارستانێتی ئیسپارتە، شارستانێتی عوسمانی و دانی بەوەداناوە کە دە شارستانێتییەکەی تر کە ئەمانەن: شارستانێتی ڕۆژهەڵاتی نزیکی مەسیحی، شارستانێتی ئیسلامیی، شارستانێتی مەسیحی ڕوسی، شارستانێتی هیندۆسی، شارستانێتی ڕۆژهەڵاتی دووری چینی، شارستانێتی ژاپۆنی، شارستانێتی

دوورگەکانی ناوەڕاست و باشووری ئۆقیانووسی هێمن، شارستانێتی ئەسکیمۆ و شارستانێتی دەشتەکی، هەموو ئەمانە ئێستا لە سەرەمەرگدان لە ژێر کاریگەریی لەناوبردن، یان لەخۆگرتن لەلایەن شارستانێتی ڕۆژئاواوە. ئەو گرفتارییەی تەواو زۆری هێناوە لە ژێر فشاری گەشەپێدانی تێکڕا خێرادا لە بوارەکانی تەکنۆلۆژیای پەیوەندیکردندا، ئەوەی مایەی گاڵتەجاڕییە ئەوەیە کە شارستانێتی ڕۆژئاوا خۆی و بەهۆی داخوازی بنەما و خودیی و مەعریفی و بەهاکانیەوە، کە باڵادەستی تەکنۆلۆژیای ماددی لەبەردەمیدا دەستەوسان ڕادەوەستێت، خۆیشی گرفتاری قەیرانێکی دژوارە، بەڵام (توینبی) بیرتیژ نەبووە بەشێوەیەکی تەواو کە بتوانێت بەڵگە شاراوەکانی پشت ئەم قەیرانە ڕۆشن بکاتەوە.

لە هەموو ئەوەی لە پێشەوە باسکرا دەگەینە ئەوەی کە سەپاندنی سیستمێکی یەکگرتووی جیهانیی هاوشێوەی شێوازی ژیانی ڕۆژئاواییانە و تێکدانی کولتوورە خاوەن ڕەسەنایەتی و پێشینەکان، سەرەنجامێکی کۆتایی پشتبەستنی کولتوور و سیاسەتە بە ڕەهەندی ئابووری ئەو بیروباوەڕە بنەڕەتییەی کە عەقڵیەتی ئابووری ڕۆژئاوایی لەسەر ڕادەوەستێت، ئەوەیە کە هەموو ئەوەی کە بەرهەم دەهێنرێت پێویستە بەکاربهێنرێ و تەواو بکرێت، ئەو عەقڵیەتە بووەتە هۆی دروستبوونی حاڵەتێك لە شێتۆکەیی گەڕان بەدوای پێویستییەکاندا تا کۆتایی هاتووە بە جێگیرکردنی کولتووری بەکاربردن، هەروەها مەرجێکی تری ئابووری هەیە کە لە پشت ئەو فرەییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوەیە، بووەتە هۆی دروستکردنی حاڵەتێك لە تاك کولتووری، ئەوەش ئەو دیواربەندییەیە لە نێوان زانستی ئابووری معیاری و زانستی ئابووری سلوکی، بارودۆخ خراپتریش دەبێت ئەگەر مامەڵەی دروست لەگەڵ مەسەلەی زیندووکردنەوەی کولتوورە ڕەسەنەکاندا نەکرێت لە چوارچێوەیەکی تیۆری و پراکتیکی گشتگیردا، ئەگەر ئەوە ڕوونەدات ئەوا مرۆڤ یادەوەریە ڕۆشنبیری و ژیارییەکەی خۆی بۆ هەمیشە بزر دەکات، ئەوکاتە کۆمپانیا کیشوەربەزێنەکان

کۆنترۆڵی نرخ و بەهاکانی شێوازی ژیانی مرۆڤ دەکەن بە مەبستی سەپاندنی کولتوورێکی بەکاربردنی یەکگرتوو.

بەم شێوەیە ئێستا جیهانەکەمان گۆڕاوە بۆ مۆزەخانەیەکی گەورە بۆ نمایشکردنی چەندین شارستانێتی و کولتوور کە لەناوبراون، بەڵام خۆمان لە واقیعێکی بەئازاردا دەژین کە بیروباوەڕەکان لە قالب دەدرێن کە پێشتر بۆیان ساز و ئامادە کراوە، لەلایەن چەند هێزێکی ئابووری گواستراوەی تازەگەری زەبەلاحەوە و دواتر تۆڕێکی فراوان لە تەکنۆلۆژیای پەیوەندییەکان بۆ هەموو جیهانی ئاوەدانی پەخش دەکاتەوە، ئەم ڕەوتە قۆرخکارییەی کە زلهێزەکان دەیگرنەبەر بە مەبەستی پەراوێزخستنی کولتوورەکانی تر، لە سایەی سیاسەتێکی بەجیهانیکردنی ئابوورییدایە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی، وەك یەكێك لە سیما بنەڕەتییەکانی، ئەم تێبینیە لە ڕوانگەی قەیرانە ژیارییەکەوە بایەخێکی گەورەی هەیە، چونکە ڕێگرە لەبەردەم بڵاوکردنەوەی هەر بەها و پێوەرێکی تری ئەخلاقیی، کە لە کانیاوی هەر شارستانێتییەکی ترەوە سەرچاوە بگرێت.

لە کۆتاییدا و زۆربەکورتی دەڵێم کە شارستانێتی ئەوروپا ـ لە هەوڵە بێوچانەکانیدا بۆ بەجیهانیکردن و سەپاندنی نموونە زۆرکارییەکەی ـ بەشێوەیەکی زۆر کارا سەرکەوتوو بووە لە پەراوێزخستنی کولتوورەکانی تردا، ئەگەربێتو ئەم پرۆسەیە ڕانەگیرێت، ڕەنگە شتارستانێتی و کولتوورەکانی تر کە تا ئێستاش لەبەرچاو ماون لەناو بچن.

**أ- ڕیفۆرمەکانی عەلمانیەتی زانستی:**

ڕیفۆرمەکانی ((عەلمانیەتی زانستی)) بەگرنگترین ئەو هەوڵانە دادەنرێت کە لە چوارچێوەی نموونەی مۆدێرنیزم خۆیدا دەرکەوتن لەپێناو زاڵبوون بەسەر قەیرانە ژیارییەکەدا، ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر لە بیرمەندان کاریان کرد بۆ ئەوەی لە قەیرانەکە تێبگەن و چارەسەرێکی بۆ پەیدا بکەن بەسوود وەرگرتن لە نموونەی عەلمانیەتی زانستیانە خۆی، لە نێوان ئەوانەدا هەروەك نموونە ئەمانە ناودەبەین:

* ل.مامفورد، خاوەنی کتێبی (ڕێگەی مرۆڤ/١٩٤٤- The condition of Man) و (کتێبی ئەفسانەی ئامێر/١٩٦٦- The Myth of Machine).

* هربرت مارکیوز و کتێبە ناودارەکەی (مرۆڤی تاکڕەهەند- One Dimensional Man).

* کتێبی ت.رۆزاك (بەرەو هێنانەکایەی کولتوورێکی دژ /١٩٧٢- Making of counter culture).

* کتێبی هیلبرونر (بێبازاڕی شارستانێتی بازرگانی /١٩٧٦- Business Civilization In Decline).

* کتێبی شومیکر (بچوکتر جوانترە/١٩٧٣- Small is Beautiful)

* کتێبی کامیلیری (شارستانێتییەکە لە قەیراندایە/١٩٧٦- Civilization In Crisis).

هەموو ئەو کتێبانە دەتوانرێت ڕیزبەند بکرێن لە چوارچێوەی هەوڵەکانی شیکردنەوەی قەیرانی شارستانێتی ڕۆژئاوایی هەمەلایەنە و کارکردن بۆ دۆزینەوەی چارەسەرییەکانی.

ئەو نووسینانە و هاوشێوەکانیان، ڕەوتێکی ڕەخنەییان لە ناوخۆی نموونەی مۆدێرنیزمە ڕۆژئاواییەکەدا پێکهێنا لە ڕەخنەگرتنیان بۆ ئەو بنەما فەلسەفیانەی کە نموونە مۆدێرنێتەکەی دروستکردووە و گەیاندوویەتی بەم قەیرانەی ئێستای، لەو سۆنگەیەوە دەکرێ وەسفی ئەو هەوڵانە بکەین بەوەی کە هەوڵی ڕیفۆرمخوازین،

چونکه له هەمان ژینگەی فیکری خۆیدا گەشەیانکردووە، که له سەر چەمکه ماددییەکانی سروشت دامەزراوە، له پێشەوەی هەموویان تیۆری مەعریفه، که مرۆڤ به چەقی گەردوون دادەنێت، جگه له فەلسەفەی پۆزەتیڤیزمی میتۆدی و فەلسەفەی عەلمانیەتی بەهاکان، لەگەڵ ئەوەشدا دەرکیان بەوەکردوەو جەخت دەکەنەوە لەسەر پێویستی نوێکردنەوەی بنەما فەلسەفییه گشتییەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوایی.

ئامانجی گشتی فەلسەفەی بوونگەرایی هەوڵدانه بۆ دروستکردنی هۆشیارییەکی نوێ بۆ تاك و پەیوەستکردنی ئەو هۆشیارییه به بوونی خودی خۆیەوە، ئەم فەلسەفەیەش وەك کاردانەوەیەك بۆ لێکدانەوەی بوونی مرۆڤ به لێکدانەوەیەکی ڕواڵەتی و ڕووکەش هات، پاشان گۆڕا بۆ گەڕان له دوای مەبدەئی (نەزانینگەرایی) و مەبدەئی ڕەشبینینی، ئەوەش وەك هەوڵێك بۆ پەیداکردنی لێکدانەوەیەك بۆ ئەو گرفتانه به بەکارهێنانی هەمان ئاوازە مەعریفییەکانی تایبەت به ئەو ئاڕاسته فەلسەفییەی که فەلسەفەی بوونگەرایی له بنەڕەتدا هات بۆ ڕەخنه لێگرتنی. هەرچەنده ئەوکێشەو گرفتانه ڕەوتێکی دەروونی یاخیبوونی بەرهەمهێنا، بەڵام نەیتوانی تێڕوانینێك بۆ دەرکپێکردنی خودی نوێ بۆ مرۆڤی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ بێنێتەکایەوە، بەو سیفەتەی که یەکەمین پێکهاتەیه له کۆشکی هێنانەدی زیندوێتی ژیارییدا. لەسەر ئەو بنەمایه ئەو ئاڕاستەیه قبوڵکرا بەو پێیەی که دەنگێکه له دەنگەکانی نوخبەی فیکریی له بری ئەوەی به تێڕوانینێکی ڕەنگدانەوەی قەیرانه هەمەلایەنەکه دابنرێت.. له لایەکی ترەوە زۆربوونی تێکڕای گرفته دەروونیەکان له کۆمەڵگه پیشەسازییه پێشکەوتووەکاندا ئاسەواری فراوانی لێکەوتۆتەوە، که پەیوەسته بەو تێکچوونەی که مۆرکێکی دەروونی بوونگەرایی هەیه له نێوان تاك و کۆمەڵگەدا له ڕوانگەی ئیدراکی خودییەوە. ئەو مەسەلەی که ئەو تێکچوونه (دەروون ـ بوونگەراییه)یەی گەیاند به زۆرکردن له تاك لەسەر گەڕان به دوای هۆشیارییەکی بەدیل دا. ئاڕاستەی گەشەکردووی بزاڤی ژنان نموونەیەکی ناوازەی

ئەو هەولآنەیە کە لەو بوارەدا کاری بۆ کراوە، هەروەها دەکرێ هەوڵەکان بۆ پەیداکردنی هوشیارییەکی بەدیل بەوە وەسف بکرێت کە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هەستکردن بە نەبوونی ئاسایش و لێسەندنەوەی ئازادی. مارکیوز ئەوە بە شێوەیەکی کاریگەر وەسف دەکات کە دەڵێت: ((لە دەوڵەتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا ئێستا ئاڕاستەیەکی کەشخەی ناسك و عاقڵانەی دیموکراتییەتی زۆرکاری باوە وەك هێمایەکی بەڵگەدار لەسەر پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا)) (١٩٧٢: ١٦).

بەڵام ئەو چارەسەرەی کە مارکیوز پێشکەشی دەکات لە ڕێگای شۆڕشێکی توندوتیژەوە دژ بە زۆرکاری لە دەوڵەتە خەفەکراوەکاندا کە لە ڕووی پیشەسازییەوە پێشکەوتوون، ئەو چارەسەرە وەك بەشێك لە نموونە تازەگەرییەکە خۆیەتی، لەو ڕووەوە کە پشت بەستووە بە تەکنۆلۆژیا.

لە ڕاستیدا هەرەسهێنانی ئیدراکی خودی سۆشیالیزم بێتوانایی چارەسەری چەپڕەوە تازە پەیدابووەکانی خستەڕوو، ئەگەرچی لە وەسفکردنی نیشانەکانی قەیرانەکەدا سەرکەوتووبوو.

توێژینەوە مەعریفییەکان لە قۆناغی پێش مۆدێرنێتەدا هەندێ پرسیاری خستەڕوو لە بارەی ئەوەی کە ئایا جەدەلیاتی تاکمانا کە لە سەردەمی مۆدێنیزمدا دەرکەوتن، بە ڕێگایەك دەگەنەوە بە تێڕوانینەکانی پەیوەست بە حەقیقەت و واقیعەوە یان نا؟ دووبارە گەڕان بەسەرچاوە مەعریفیەکانی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوایی دا، توانی گورزێکی پشتشکێن ئاڕاستەی نەگۆڕە فەلسەفییە کورتکراوەکانی تیۆری حەقیقەتی خودی بکات، کە هەبوونی کۆمەڵێك لە پێوەری باڵا گریمانە دەکات، کە دانراوە مەعریفیی و قییەمیەکان لەسەری ڕادەوەستێن. هەروەك داڕشتنەوەی حەقیقەتی تیۆری نێوەندیی بەوسیفەتەی کە بەدیلە بۆ حەقیقەتی تیۆری ناوخۆیی، بنەمایەکی مەعریفیی و میتۆدی بۆ دەستەبەر دەکات بۆ بیروباوەڕەکانی قۆناغی پۆستمۆدێرنیزم کە پەیوەستن بە فەرهەنگی ڕێژەیی پلورالیزمەوە. لەوانەشە

نموونەی ئەم ئاڕاستە فەلسەفییەی خودیی ببیێتە هۆی خێراییدانی پرۆسەی تایبەتکردنەوەی ئازادی و پەیوەستکردنی بە تاکەوە، ئەوەش لە میانەی هێنانەکایەی وێناکردنێك بۆ ڕاستییەکانی پلۆرالیزم کە دەکرێ ببنە هۆی دروستکردنی هەستکردنێك بە لێبوردەیی ئاڵوگۆڕ لەناو نموونەیەکی کۆمەڵگەیی بچوککراوەدا، کە تاکەکانی کۆمەڵگە لە توانایاندا دەبێت هاوسەنگییەك لە نێوان خۆیاندا بەدیبهێنن، بەڵکو گەڕاندنەوەی جارێکی تری ئەو هاوسەنگییە بۆ بوارە تایبەتەکەی ئازادی. بەڵام هێنانەکایەی سیستمێکی ئاسایشی جیهانیی پشت بەستوو بە نموونەی ئەم چەمکە خودییانەی ئازادی بووەتە ئەستەم، چونکە ئەوە دانانی هەندێ بەهای کرداری بێلایەن دەخوازێت بۆ ئەوەی بەردەوام بتوانرێت پێداچوونەوە بە سنوورەکانی ئازادی ئینسانی و دووبارە هاوسەنگکردنەوەی ئەنجام بدرێت.

بەڵام لە لایەکی ترەوە ئەگەر بانگەشە بکەین بۆ ئەوەی کە وێنەی ئەو ئەو ڕێژەییە کولتوورییە لەوانەیە پلورالیزمێکی جیهانیی بەرهەم بهێنێت لە ڕوانگەی دووبارە زیندووکردنەوەی کولتووورە ڕەسەنەکانەوە، ئەوە جیاوازییەکی سەیر دەبێت، چونکە زۆربوونی ژمارەی چێشتخانە چینییەکان لە پایتەختەکانی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکاندا و بزاڤی مۆدەکاری ئاشکرا لە پاریس بە جلوبەرگی ڕۆژهەڵاتییانەوە و بایەخدانی گەشەکردوو بە (ڕێبازی تێڕامانی بووزایی) لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا، هەرهەموو ئەوانە ئاماژەگەلێکن کە مەرج نییە ڕەنگدانەوەی بوونی پلورالیزمی جیهانیی بن. بەڵام ئاماژەی ڕاستەقینە کە ڕەنگدانەوەی بوونی پلورالیزمی جیهانیی بێت، لەوەدا دەر دەکەوێت کە ئەو کولتووورە ڕەسەنانە بتوانن چەمکەکانی خۆیان گەشە پێ بدەن لە چوارچێوەی ئازادی ژیاندا کە دینامیکیەتێکی بەردەوامی هەیە، لەو سۆنگەیەوە دڵنیا دەبین کە کولتووورە ڕەسەنەکان تەنها بابەتی کات بەسەربردن و دڵدانەوە نین. گەشەکردنی چەمکەکانی کولتووورە ڕەسەنەکان جێبەجێ نابێت لە چوارچێوەی دروسبوونی شوناسێکی کولتووری جۆرییەوە نەبێت، ئەو شوناسەی کە

له مێژه لەسەر دەستی بەجیهانیکردنی چەمکەکانی بەکاربردنی چەندێتییەوە زیندەبەچاڵ کراوە، کەلەگەڵ شوناسە کولتوورییەکاندا بەپێی ئاستی بەکاربردنیان مامەڵە دەکات.

لەگەڵ ڕۆڵی کارای بزاڤەکانی پاراستنی ژینگە لە میانەی پرۆسەی ڕیفۆرمی عەلمانیەتی زانستی دا، بە هەوڵدانیان بۆ چاکترکردنی پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوە، بەڵام ئەو بزاڤانە ڕووبەڕووی هەمان کێشە دەبنەوە، چونکە ئەوچارەسەرانەی کە پێشکەشی دەکەن، هێشتا هەر لە ناو چوارچێوەی نموونە تازەگەرییەکەدا دەجوولێنەوە. ڕاستە کارلێککردنی بابەتییانەی لەسەر ئاستی خۆماڵی بەرامبەر مەسەلەکانی ژینگە، وەك خۆپیشاندانەکانی گرووپەکانی ئاشتی سەوز بۆ نموونە، هاوسۆزییەکی گشتی بەرامبەر ژینگە دروست دەکات.

بەڵام توانای ئەو بزاڤانە بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی نوێ لە نێوان مرۆڤ و ژینگەدا، هەمیشە جێگای گومان دەبێت. هۆکاریش ئەوەیە کە ئەو جۆرە بزاڤە ڕیفۆرمخوازانە لەسەریانە بە شێوەیەکی گشتگیر بەرەنگاری چەمکی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ بەرامبەر ژینگە ببنەوە، کە بۆ چەندین سەدەیە ڕەگی داکوتاوە. لەوانەیە لە توانای ئەو هەوڵە ئاڕاستە کراوانەدا بێت کە ماهیەتی کێشەکە دیاری بکەن، بەڵام لەتوانایاندا نابێت تێڕوانینێکی بەدیل پێشکەش بکەن کە پاراستنی ژینگە زامن بکات بۆ مەودایەکی دوور، مادامەکی فەلسەفەکەی لە هەمان نموونەی تازەگەری هاوچەرخەوە سەرچاوە بگرێت، جگە لەوەش نوخبە سیاسیی و ئابوورییەکە دەتوانێت ئەو هەوڵانە چەواشە بکەن بەو سیفەتەی کە ئەو بزاڤە نوێیانەی پێی هەڵدەسن بانگەشە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاژاوەگێڕی دەکەن، بە تایبەتی ئەو نوخبانە لە ڕووی ماددییەوە سودمەندن لە تێکدانی سروشت.

سەرەنجام لەگەڵ گرنگی ئەو سەرکەوتنەی کە هەوڵەکانی عەلمانیەتی زانستی بەدەستی هێناوە بۆ زاڵبوون بەسەر قەیرانە ژیارییەکەدا، سەرباری ئەوەش کە ئەو سەرکەوتنە ناتوانێت وەسفی تەواوی قەیرانەکە بکات و جەخت بکات لەسەر

پێویستی ئەنجامدانی گۆڕانکاریی ژیاریی، چونکە پشت بەستنی فیکرییان بە نموونە تازەگەرییەکەی ئێستا، ڕێگرە لەبەردەم داڕشتنی بەرەنگاربوونەوەیەکی گشتگیر بۆ ڕەخنەکردنی ئەو نموونە تازەگەرییە، ڕاستە کە هەندێ کاردانەوەیان بە شۆڕشگێڕیبوون وەسف دەکرێت، بەڵام لە میانەی ئەو تێڕوانینەی کە پێشتر باسکرا، هێشتا چەند هەوڵێکی ڕیفۆرمخوازانەی ڕووتە کە زۆر لە چوارچێوەی نموونە تازەگەرییەکەی ئێستاوە دوور ناکەوێتەوە.

چەندین هەوڵی تریش هەیە کە دوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانیی دەرکەوتن بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو قەیرانە ژیارییەدا و بانگەوازیان دەکرد بۆ دووبارە داڕشتنەوەی نموونەیەکی تری عەلمانی زانستییانەی نوێ. قۆناغی دوای جەنگ بە زۆریی مشتومڕی وروژێنەر دەناسرا کە چەندین فەیلەسوفی وجودی و ڕەخنەگری لەخۆدەگرت، لەوانەی توێژینەوەیان لە بارەی گۆشەگیربوونی کۆمەڵگەی دیموکراسی دەکرد لە ماوەی شەستەکاندا و فەیلەسوفەکانی پۆستمۆدێرنێتەش لە هەشتاکاندا، بەڵام ئەو پرسیارەی کە بە بێ وەڵام دەمێنێتەوە ئەوەیە: ئایا ئەو هەوڵانە سەرکەوتووبوون لە دەستەبەرکردنی ژینگەیەکی گونجاو بۆ بنیاتنانی شارستانێتییەکی نوێ یان نا؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەمەودوا دەردەکەوێت.

**ب ـ چارەسەرێکی جیاوازی مەسیحیەتی نوێ.**

پرۆسەی نوێکردنەوەی مەسیحیەت هەوڵێکی تری گرنگ بوو لە هەوڵەکانی زاڵبوون بەسەر ئەو کێشە و گرفتانەدا کە تێکچوونەکانی دەروونی– وجوودی، و ئەخلاقییەتە ماددییە ژینگەییەکە بەجێییان هێشتووە. ئەو هەوڵەی کە دەربڕین بوو لە بارەی ئاڕاستەیەکی نوێوە کە بۆ ئاوڕدانەوە بەرەو ڕۆحانیەت، دوای ئەوەی متمانە بە توانای پێشکەوتنی ماددی کەمبووەوە لەبەدیهێنانی خەونی بەهەشتی سەرزەوییدا، کاتێك ئەوە ڕوویدا کە ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی لاهوت لەگەڵ هەندێ بیرمەندی عەلمانیدا، دەرکیان بەوەکرد کە گریمانەکانی جیاکردنەوەی دوانەیی کە نموونە مۆدێرنێتەکە خۆی دروستیکرد لەبارەی ئەو بیروباوەڕانەی پەیوەستن بە

زاتی خودا و سروشت، عەقڵ و وەحی، ئەخلاقییات و ڕژێمە کۆمەڵایەتییەکان، هەموو ئەو دوانەییانە شکستیانخوارد لە تێرکردنی لایەنە زۆرەکانی دەروونی مرۆڤایەتی، ئەو جیاکردنەوەیە لە نێوان ئەو بوارانەدا بووە هۆی ڕوودانی تێکچوون لەسەرئاستی تاك و کۆمەڵگە لەیەك کاتدا، بۆ نموونە بینیمان کە ڕاگەیاندنی نیتشە لە بارەی مردنی خوداوە بەو پێیەی تێڕوانینێکی تازەگەرییە جارێکی تر خرایەوە ژێر پرسیارکردن لە بارەیەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی ڕوون بووەوە کە خودای زانست لە مێژووی شاراستانێتی ڕۆژئاوادا لە هەموو خوداکانی تر چاوچنۆکترە، ئەو خودایەی کە هەموو تێڕوانینەکانی تری بەتاڵ کردەوە کە پەیوەستن بە میتافیزیکا و ڕۆحانیەت و لاهوتەوە. مۆدێرنێتە هەموو شێوەکانی خوایەتی پوچەڵکردەوە لە پێناو هێنانەدی ئازادیی ڕەها بۆ مرۆڤەکان، ئەوەش بە دروستکردنی چەندین خودا و ئایین کە لە هەموو لایەکەوە چواردەوری مرۆڤیانداوە، وەك عەلمانیەت و فەلسەفەی زانستی، کەچی بۆی دەرکەوت کە هەموو ئەمانە بەربەستن و ڕێگری لێ دەکەن بۆ گەیشتن بە ئازادی ڕاستەقینە.

لە لایەکی ترەوە دەبینین ئەوجیاکردنەوەیە لە نێوان بواری پیرۆز و بواری پیس (ناپیرۆز)دا ـ بە تایبەتی لە سەردەمی نوێدا ـ بووەتە هۆی ڕیزبەندییەکی وەزیفی لە نێوان بیرمەندە عەلمانییە بێباوەڕەکان (بێئایینەکان ئەوانەی کە بە لانی کەم خۆیان لە ئایین ڕووتکردۆتەوە) لەگەڵ پیاوانی ئایینیی نازانستیدا. گرفتارە ژیارییەکە ـ بەو ڕواڵەتانەی کە باس کران و هیچ گومانێك هەڵناگرن ـ سەری کێشا بۆ ناچارکردنی ئەو دوو گرووپە لە نوخبەی شارستانێتی ڕۆژئاوا بۆ خۆ دوورگرتن لە ئاڵوگۆڕکردنی تۆمەتەکان لە نێوان هەردوو لادا، بە تایبەتی لە دوای دەیەی شەستەکانەوە، تا ئەو ئاڕاستەیە گەیشت بە چڵەپۆپەکەی لە دوایین دەیەی سەدەی بیستەمدا، کاتێك مەرجەعیەتە ئایینییەکان دەستیانکرد بە گەڕان بە دوای لاهوتێکی تری نەرمتردا. لەکاتێکدا تیۆریستەکانی تێزی عەلمانیەت دەستیانکرد بە زیادکردنی پشتگیرییکردنیان بۆ چالاکییە ئایینییەکان بە مەبەستی لەبندەرهێنانی ڕەگ و

ڕیشەی کێشە کۆمەڵایەتیی و دەروونییەکان کە بە خراپی کەڵەکە بووبوون لە ئەنجامی ئەو بۆشاییەی کە بە هۆی فەراغی ڕۆحییەوە دروست بووە.

ئەمەش لە ڕاستیدا مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئایینی مەسیحیەت پەیامێکی نوێی بۆ پەیدا بووە کە دەخوازێت گۆڕانکاریی لە چەمکەکانی مەسیحیەتی تەقلیدیدا ئەنجام بدات، ئەو ئەرکە مێژووییەی ئەوساو تائێستاشی لەگەڵدابێت، مەسیحییەت لە زۆرێك لە دووریانە ژیارییەکانی جیهانی ڕۆژئاوادا پێی هەڵدەستێت، دارشتنەوەی فیکری و دامەزراوەیی مەزهەبی کاسۆلیکیی، کە دوای پرۆسەی گۆڕانکاریی لە مەسیحیەتی تەبشیرییدا ڕوویدا، کە لە بنەچە سامیەکانەوە هەڵقوڵابوو، پاشان گۆڕا بۆ تێکەڵەیەکی گشتگیر بۆ هەموو ڕژێمە عەقائیدییەکان لە ژێر چەتری ئاشتی ڕۆمانییدا (Pax Romana)، بنەمایەکی ڕۆحانیی و ئەخلاقیی ئامادەکرد بۆ شەرعییەتدان بە گواستنەوەی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسیی لە حوکمی ڕۆمانییەوە بۆ قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست کە سیستمی فیودالیزم تیایدا سەروەربوو.

پرۆسەی ڕیفۆرمخوازی پرۆتستانتی لە سەرەتای سەردەمی نوێدا پرۆسەیەکی تری گۆڕان بوو لە مەسیحیەتدا، ئەو پرۆسەیە بوو کە هاوکات بوو لەگەڵ ڕوودانی گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە سیستمە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەکاندا لە میانەی پەرەسەندنی ئەو سیستەمانە بەرەو سەرمایەداریی. ئەمڕۆ دەتوانین ڕەچاوی هەندێ لە سیما جیاکەرەوەکانی گۆڕانە نوێکانی ئایینیی مەسیحیەت بکەین، کە خۆی لەو بزاڤە ڕیفۆرمخوازەدا دەنوێنێت کە کڵێسا کلاسیکییە سەرەکییەکان دەیگرنەبەر، لەپاڵ دامەزراندنی ژمارەیەکی زۆر لە دەستە و تاقمی نوێ و سەربەخۆ، دواتر نەك دواین ئەو ئاڕاستە فەلسەفییە بەگوڕ دەڕوات بەرەو دارشتنەوەی ئەوەی دەتوانین ناوی لێبنێین (لاهوت)ی پۆست مۆدێرنیزم. ئەو هەوڵانە لە سێ بواری سەرەکییدا دەردەکەون:

**١ـ کڵێسا کلاسیکییە سەرەکییەکان:**

پاش کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانیی، دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش لەو گفتوگۆیانەدا پەیدا بوو کە لە بارەی پێویستبوونی ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە کلێسا تەقلیدییە سەرەکییەکاندا ڕێکخرا بوو، بەتایبەتیش کلێسا کاسۆلیکییەکان، ئەوەش لە لایەنەکانی تیۆری میتۆدی و دەزگاییەوە. گرێدانی کۆڕبەندی ڤاتیکانی دووەم خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ بوو لە پەیوەندییدا بە گۆڕانکارییە ژیارییەکان و دەرەنجامە سیاسییەکانییەوە. ئەو کۆڕە کە لە ١١/ئۆکتۆبەر/١٩٦٢ دەستی پێکرد و لەلایەن پاپ جونی سیانزەهەمەوە کرایەوە و لە ٨/دیسەمبەر/١٩٦٥دا و لە سەردەمی پاپ پوڵسی شەشەم کۆتایی بە چالاکییەکانی هێنا، ئەو کۆڕە بەوە وەسف کرا کە زۆرترین پرۆسەی ڕیفۆرمی هەمەلایەنەی گرتەوە لە هەموو مێژووی کلێسادا، لەبارەی زۆری ژمارەی بەشداربووەکان و فرەچەشنی ئەو بابەتانەی کە گفتوگۆیان لەبارەوە کرابوو، ئەوەبوو جارێکی تر توێژینەوە کرا بۆ زۆرێك لە مەسەلە جەدەلی و تیۆرییە هاوچەرخەکانی وەك تایبەتمەندێتییە ڕێکخستنەوەکانی ناوخۆی کلێسا، مەسەلەی وەحی و فێرکردنی ئایینیی و تایفە مەسیحییەکانی تر و پەیوەندی مەسیحیەت بە ئایینەکانی ترەوە و هۆکارەکان و شێوازە تازە پەیدابووەکانی بەیەکگەیشتنی کۆمەڵایەتی و ژیانی ڕەهبانیەت و چەندین مەسەلەی تر. ئەوەش لە هەوڵێکدا بۆ پێکەوە گرێدانەوەی ئەو درزەی لە نێوان ژیانی مۆدێرن و بیروباوەڕەکانی کاسۆلیکیدا دروست بووە، لەگەڵ هێورکردنەوەی گرژی نێوان کۆمەڵە سیکۆلاریزییەکان و پیاوانی ئایینیی و پێدانی گوڕێك بەکاریگەری کلێسا لەژیانی ڕۆژانەی جەماوەردا و بەشدارییکردن لە گەڵاڵەکردنی بارودۆخە سیاسییە نوێیەکاندا، بە تایبەتی دوای قۆناغی کۆلۆنیالیزم کە بڕیاردرا بە پێویستی دروستکردنی بزاڤە تەبشیرییەکان و زۆرکردنی ئامادەیی و چالاکییەکانیان، هەموو ئەو چاکسازییانەش پەیوەستکران بە ئامانجێکی ستراتیژییەوە، ئەوەش ئەوەیە کلێسا ڕۆڵی میحوەری خۆی لە ڕۆشنبیری و شارستانێتی ڕۆژئاواییدا بۆ بگەڕێتەوە. پێویستی بۆ ئەنجامدانی ئەو چاکسازییە هەمەلایەنانە زیاتر ڕۆشن بووەوە دوای ئەو

کۆڕ و کۆبوونەوەو گفتوگۆیانەی کە لە نێوان ساڵانی (١٩٤٥ – ١٩٦٠) دا ساز کران لە نێوان دەستە و تاقمە موحافیزکار و لیبرالیستەکانی ناوخۆی کلێسادا، لە ئەنجامی دەرکەوتنی ئەوەی کە پێیان دەوترا ((قەشە کرێکارەکان)). باڵی موحافیزکار توانی توانای خۆی بسەلمێنێت، کاتێك بڕیاری بێبەشکردنی کلێسا بۆ کۆمۆنیستەکان دەرچوو لە ساڵی ١٩٤٩دا، هەروەها کاتێك بەڵگەنامەی ئیسپانی لە ساڵی ١٩٥٣دا مۆر کرا، بۆ جاری سێیەمیش کاتێك چەند بڕیارێك درا بۆ تەمێکردن دژ بە ڕمووزە قیادییەکانی لیبراڵیزم وەك (دی لوباك و شینو دانیلیوك)، لەگەڵ ئەوەشدا نەتوانرا پێویستی ئەنجامدانی چاکسازیی لە کلێسادا لە پێش کردنەوەی کۆڕی دووەمی ڤاتیکان فەرامۆش بکرێت، زۆرێك لە خەڵکی سادە ئاگاداربوون لە ڕادەی ئەو پێویستییەی کلێسا بۆ وەڵامدانەوەیەکی گونجاو بۆ هەڵوێستێك کە بە شێوەیەك لە شێوەکان بە نامۆ سەیر دەکرا و پاشان لە دەیەکانی ڕابردوودا بە شێوەیەکی خێرا پەرەی سەند و بۆیان دەرکەوت کلێسا وای لێهاتووە کە زۆر پێویستە خۆی لەو گۆشەگیرییە دەرباز بکات بەهۆی ئەوترس و گومانانەوە کە بەرامبەر جیهانی نوێ بۆی پەیدابووە، باشتر وایە بۆ ئەوەی تەپوتۆزی سڕبوون لە خۆی بتەکێنێت و لە بەرامبەر هەر هەوڵێکی ڕاستگۆییانەدا بۆ گفتوگۆی کراوە ڕانەوەستێت، ئەو خەسڵەتانەی کە زۆرێك لە لاپەڕەکانی مێژووی کلێسای پێ دەناسرێتەوە. دوای دەیان ساڵ لە داپڵۆسین بەناوی مۆدێرنیزمەوە، ئەو بزاڤەی کە کاریگەر و ئیجابیە بێ هیچ دوودڵییەك بەلای هەندێکەوە، بەڵام بەلای هەندێکی ترەوە بزاڤێکی لایەندار و سەلبیە (مرتینا، ١٩٨٨: ٥)

لە دوای تەواوبوونی ئەنجومەنی دووەمی ڤاتیکان، سەرکردەکانی بزاڤی لیبرالیزم و ڕیفۆرمخوازەکان دەستیانکرد بە فراوانکردنی بازنەی بەشداربوونی خۆیان لە چوارچێوەی چالاکییەکانی کلێسادا کە بە دەوری خۆی هەڵسانەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، کە خۆی لە کارتێکردنی کلێسای کاسۆلیکی گەشەکردوودا دەنواند لە بوارەکانی ڕۆشنبیریی و سیاسیی ڕۆژئاوادا، بە تایبەتی بە هاوتەریب لە ئەو

سیاسەتە نەرمەی بە شێوەیەکی ڕێژەیی کە لە میانەی قوداسی حەبری پاپ جۆن پۆلی دووەمدا ڕاگەیەنرا.

لە ماوەی سێ دەیەی رابردوودا ئەو جوڵانەوەیە بوو بە هۆی ڕوودانی گۆڕانکاریی لە تێڕوانینی کڵێساییدا بۆ مۆدێرنیزم. قەشەکانی کڵێسا هەموو دەرفەتێکیان دەقۆستەوە بۆ خستنەڕووی بایەخدانیان بە کێشە و گرفتەکانی تازەگەری. پێشنیازی پاپا پۆڵسی شەشەم بۆ پێویستی دانانی یاسایەکی کاری نێودەوڵەتی بڕواپێکراو کە بتوانرێت بەسەر هەموو گەلاندا جێبەجێ بکرێت، بە دیارترین نموونە دادەنرێت کە ئەو گۆڕانکارییە ڕوون دەکاتەوە کە لای کڵێسا بەرامبەر کێشە و گرفتەکانی جیهانی نوێ پەیدابووە، ئەوەش لە چوارچێوەی ڕەتکردنەوەی تێڕوانینی مارکسیزم بۆ کێشە و گرفتەکانی کرێکاران لە جیهاندا، دوای ئەو گۆڕانە ڕیشەییەی کە بە سەر شێوازی کڵێسای کاسۆلیکدا هات لە چۆنێتی مامەڵەکردنیدا لەگەڵ ئەو گەلانەی سەربەئایینزای کاسۆلیکی نین، نموونەیەکی تری پرۆسەی گۆڕانکاریی لەناو ئایینیی مەسیحیەتدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانە ژیارییەکە. یەکەم نیشانەش لەسەر ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییەی پەیوەست بە پێکەوەژیانی ئاشتییانە و پلۆرالیزم بڵاوکراوەی (Materet Magistra)یە کە لە ساڵی (١٩٦٠)دا لە میانەی قوداسێکدا دەرچوو کە بۆ پاپ جونی سیانزەهەم ساز کرا بوو، کە تیایدا بۆ یەکەمجار لە مێژووی کڵێسادا باسی لە بنەمای هاوکاری لە نێوان کاسۆلیك و ئەو ئایینانەی تر کرا، ئەوانەی کە لە تێڕوانینیاندا بۆ ژیان هاوڕای کاسۆلییك نین، هەروەها بڵاوکراوەی (Nostra Aetate) کە لە ساڵی (١٩٦٥)دا بڵاو کرایەوە و جەختی کردەوە لەسەر هەمان بابەت لە میانەی گووتارێکی کاردینال (ف.کوینج) لە کۆنگرەی جیهانیی تەبشیریی لە ئۆکتۆبەری (١٩٧٥)دا کە تیایدا ڕایگەیاند کە هەموو ئایینێك تیشکێك لە ڕووناکی تێدایە، ئەو گووتارەی کە ئاماژەیەکی ترە بۆ ئەو ئاڕاستەیەی کە بەرامبەر لیبرالیزم و هاوکارییکردنە لەگەڵیدا لە لایەن کڵێسای کاسۆلیکییەوە، بەڵکو ئەو ئاڕاستەیە درێژ بووەتەوە تا بگاتە

کۆمەڵە بێباوەڕەکان. ئەو نەرمییەی کاسۆلیکییەت بۆتە هۆی زیادکردنی کاریگەریی کلێسا لەسەر بزاڤە جەماوەرییەکان لە وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتیدا لە دەیەی ڕابردوودا و بە دیارییکراوی لەو دەوڵەتانەی کە زۆرینەیان کاسۆلیکن وەك پۆڵەندا. دەتوانرێت بەدواداچوون بۆ ئەو ڕواڵەتانە بکرێت بەشێوەیەکی زیاتر ڕۆشن لە میانەی پرۆرسەکەدا بە تێکڕایی، هەر لە بڕیاری بێبەشکردنی کلێساوە دەرهەق بە کۆمۆنیستەکان لە ١٩٤٩دا دەست پێدەکات و دواجار بۆ سەردانی قەیسەری جیهانی بێباوەڕ (یەکێتی سۆڤیەت) سەرۆك گۆرباشۆڤ بۆ ڤاتیکان بۆ دیداری پاپا جون پۆڵسی دووەم دوایی دێت.

هەروەها دەتوانرێت سەرنجی ئەو ئاڕاستەی گۆڕانخوازییە بدرێت لای مەزهەبەکانی تری جگە لە کاسۆلیکییەتی سەرەکی، کارنامەی کۆمەڵەی گشتی پێنجەمی ئەنجومەنی کلێساکانی جیهانیی، کە ڕێکخراوێکە نزیکەی (٢٨٥) کلێسا لە خۆ دەگرێت کە لە هەموو ناوچەکانی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە، کە لە نایرۆبی لە ساڵی ١٩٧٥دا سازکرا، بەڵگە و نیشانەی مانادارمان لەبارەی ئەو ئاڕاستەیەوە دەدەنێ، وەك: پشتیوانیکردنی بانگەوازەکانی ئازادکردنی ئافرەت و هاوکاریکردنی گەلانی چەوساوە، کە داوای ئازادییە سیاسییەکان دەکەن و ئیدانەکردنی خراپ بەکارهێنانی لە سنووربەدەری سەروەت و سامانی نەتەوەیی لە لایەن حکومەتەکانەوە لە پێناو گەشەپێدانی تەکنۆلۆژیای سەربازی، کە بووەتە هۆی ناسەقامگیری لە سیستمی دارایی جیهانیدا و زۆربوونی بێحیسابی ژمارەی دانیشتوان و کێشە ژینگەییەکان و بۆشایی زیادی نێوان دەوڵەتە هەژار و دەوڵەمەندەکان.

هەروەها دەقی ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٧٥ تایبەت بەو ئەنجومەنە لە بارەی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی لە سەردەمی تەکنۆلۆژیادا کە دەڵێت: ((ئەو بەرپرسیارێتییەی کە دەکەوێتە سەرشانی مرۆڤایەتی کورت دەبێتەوە لە دۆزینەوەی گۆڕانێکی بەرنامەکراو بەرەو کۆمەڵگەیەکی جیهانیی سەقامگیر، کە پێویست دەکات زانست و تەکنۆلۆژیا کۆبکرێتەوە بۆ بەدەمەوەچوونی پێداویستییە مادی و ڕۆحانییە

بنەڕەتییەکان کە پێویستن بۆ مانەوەی ژیانی مرۆڤایەتی، ئەوەی کە گۆڕانکاریی ژیاریی ڕیشەیی و دۆزینەوەی تەکنۆلۆژیای نوێ و بەکارهێنانی نوێ دەخوازێت بۆ ئەو تەکنۆلۆژییانە، جگە لە سیستمی ئابووری و سیاسی جیهانیی نوێ)).

هەروەها لەو ڕاپۆرتەدا جەخت کراوەتەوە لەسەر ئەوەی کە لەسەر کلێساکان پێویستە کە هانی زانایان و تەکنیککاران بدەن بۆ پەرەپێدانی ئاڕاستەی نوێ لە خزمەتی کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا. ((لە کاتێکدا پێویستە لەسەر پیاوانی ئایینیی کە هەوڵەکانیان چڕبکەنەوە لەسەر ئەو مەسەلانەی کە پەیوەستن بە چەمکی زانست و چەمکی ئیمانەوە، هەروەها توێژینەوە بکەن لەبارەی ئەو چەمکە ئەخلاقییانەی کە تایبەتن بە چالاکییە زانستی و تەکنیکییەکانەوە)).

ئامانجیش لەو ڕاپۆرتە بریتیبوو لە باشترکردنی ئەو پەیوەندییەی کە پیاوانی ئایینیی و بیرمەندە عەلمانییەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە و هاوسەنگیدانەوە بەو تێکچوونە مەعریفی و بەهاییەی کە دووچاری بزاڤی مۆدێرنیزم هاتووە بە گشتی.

**٢ـ گرووپە سەربەخۆ نوێیەکان و بزاڤە ئایینییەکان:**

زیادبوونێکی بەردەوام هەیە بەرەو دروستکردنی کۆمەڵەی ئایینی نوێ کە بەڵگەیە لەسەر گەشەکردنی ڕەوتی ڕۆحانیەت لەسەر حسابی فیکری ئایینیی چەقبەستوو ـ لەوانەشە زۆربوونی ژمارەی ئەندام و لایەنگرانی بزاڤە ئایینییە نوێکان بەوە لێك بدرێتەوە کە کاردانەوەیەکی سروشتییە دژ بە ماددیگەرایی لە سنووربەدەری مۆدێرنیزم. هەرکامیان بێت ئەوا ئەو بزاڤە ڕۆحانییە ژینگەیەکی گونجاویان ئامادە کردووە بۆ بەدیهێنانی ئاسوودەیی دەروونی بەبێ قوربانیدان بە دەستکەوتەکانی تازەگەریی. ئەو بزاڤانەش تایبەتمەندییەکی گرنگیان هەیە، ئەویش خاسیەتی دەستبژێریکردنە کە ڕێنماییەکانی خۆی لە قوتابخانە ڕۆحیە ڕۆژهەڵاتییەکانی مەسیحیەتەوە خۆلاسە کردۆتەوە. ئەو خاسیەتی دەستبژێریکردنە (الخاصية الانتقائية)یە کە وای لە بزاڤە ڕیفۆرمخوازەکان کردووە ژیانی سەرنجڕاکێش و کاریگەربن لەسەر دەرونی مرۆڤی ئەم سەردەمە، کە لە ڕووی ماددییەوە هەست بە

تێربوون دەكات، هەرئەوەشە هانیداوە بۆ گەڕان لە دووی سەرچڵییەكی ڕۆحی كە دەییات بۆ دوورتر لەوەی غەریزە ماددییەكان دەیبرد بۆی.

هۆكارەكە هەرچییەك بێت، بەڵام ئاراستەی گەشەكردوو بەرەو هێنانە كایەی ئەو بزاڤە ئایینییانەی كە زیاتر لیبرالیزم تر و لێبوردەترین، ڕەنگدانەوەی گرنگترین دوونیشانەی بێزاربوونی مرۆڤی سەردەمە لە ناو حەتمیبوونی مۆدێرنێتەی وەڕسكەر لە لایەكەوە و مۆركی دەسەڵاتخوازی ڕێبازە سەرەكییەكانی مەسیحیەت لە لایەكی ترەوە، هەروەها نهێنی شاراوە لە پشت سەرنجڕاكێشبوونی ئایینە ڕۆژهەڵاتییەكان، پەیوەستە بە مەسەلەی تێركردنی دەرونی و جەختكردنەوەیان لەسەر گرنگی دەرك پێكردنی زاتی و كۆنترۆڵكردنی دەروون. ئەو هەست و سۆزەی كە پێشتر مرۆڤ لێی بێئاگابوو بە هۆی تێكچوونی پەیوەندی (دەروون - وجودی) كە بە یەكێك لەو ئاماژانە دادەنرێت كە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شارستانێتی ڕۆژئاوایی كەوتۆتە قەیرانەكەی ئێستایەوە.

بایەخپێدانی ڕوو لەزیادبوون بەو بزاڤە ئایینییانە دەتوانرێت بەوە لێك بدرێتەوە كە كاردانەوەن دژ بەجیاكردنەوە لە نێوان جەستەو ژیری و ڕۆح لەلایەن نموونە تازەگەرییەكەوە. جگە لەوەش جەختكردنەوە لەسەرگرتنەبەری شێوازی ژیانێكی زیاتر پیرۆز و تێر و تەواوتر، بەدیلێكە بۆ جیاكاری عەلمانیەت لە نێوان بەها ماددی و ڕووحییەكاندا، دەتوانرێت ڕەچاوی ئەو كاردانەوەیە بكرێت لە میانەی ڕێبازی زۆرێك لە كڵێسا ناتایفی و تەبشیرییەكان و جووڵانەوەكانی سەردەمی نوێدا، ڕەنگە ئەم ئاراستەیە هاندەربێت بۆ پرۆسەی گۆڕانی مەسیحیەت بۆ ڕۆح و شێواز و شێوەیەكی نوێ، لە دووڕیانێكی مێژوویی جیاكەرەوە بۆ ئەو قەیرانە ژیارییەی ئێستا، هەروەها سەركەوتنی ئەو جوڵانەوانە لەسەر ڕادەی سادەیی چەمكەكانی و توانای لەسەر دروستكردنی دینامیكیەتێك دەوەستێت كە پشت دەبەستێت بە ئەخلاقییاتێكی نوێ و هاوشێوە بۆ سادەكردنی ئەخلاقیاتی مەزهەبی پرۆتستانتی كە لە دوای مەزهەبی پیۆریتانی، یان خاوێنكارییەوە دەركەوت، بەڵام ئەو جوڵانەوانە

تائێستاش ـ لەگەڵ زیادبوونی خێرای ژمارەکانی لە دەیەی ڕابردوودا ـ تەنها وەك پەناگەیەکی ڕۆحی ڕووت دەردەکەوێت بۆ ژمارەیەکی دیارییکراو لەو خەڵکەی کە لە دۆزەخی مۆدێرنیزم ماددییەوە هەڵاتوون.

**٣ـ لاهوتی پۆست مۆدێرنیزم:**

قۆناغی پۆست مۆدێرنیزم ـ بەوپێیەی شەپۆلێکی ڕەخنەییە دژی چەمکە نێگەتیڤ و بەردبووەکانی مۆدێنیزم– چەندین ئاڕاستەی دژ بەیەك لە نێوان یەکتردا دەگرێتەوە، گرنگترینی ئەو ئاراستانەش بریتیین لە: گردبوونەوە لە دەوری مێینەو لادانی سێکسی و لاهوت و فەلسەفە و... تاد. نموونەی ئەم ئاڕاستانە لەناو یەك بۆتەی ڕەخنەیی و فیکرییدا پێکەوە دەتوێنەوە و کارلەیەکتر دەکەن. ئەو ئاراستانە ئەگەر توانیبێتیان لە ڕەخنە تێپەڕبن، بۆ ئەوەی نموونەیەکی نوێ دروست بکەن و چەند سیمایەکی ئیجابی نوێ لە خۆبگرن یان نا، یەکێکە لە گرنگترین ئەو فاکتەرانەی کە ئایندەی گۆڕانکارییە ژیارییەکان دیاری دەکات.

وادیارە لاهوتی پۆست مۆدێنیزم بە ڕۆڵێکی بنەڕەتی بەشداردەبێت لە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لە نێوان فەلسەفە و ئایین و لە نێوان زانست و ڕوح و لە نێوان پەروەردگار و سروشت و لە نێوان عەقڵ و وەحییدایە، ئەوەش لە میانەی پرۆسەیەکی گۆڕینی مەسیحیەت بۆ سیستمێکی لاهوتی نەرمتر و دامەزراو لەسەر چەمکێکی سنووردار و کەمترکردنەوەی دەسەڵاتی زاتی خودا بەشێوەیەکی ڕێژەیی. (جریفن) وا گریمانە دەکات کە ((لاهوتی قۆناغی دوای تازە گەری تێڕوانینێکی ئایینیی ڕۆشن بۆ جیهان پێشکەش دەکات، بە پێچەوانەی لاهوتی لیبرالیزمی نوێگەریەوە، لاهوتی پۆست مۆدێرنیزم، هەڵوێستێکی دژی بەرامبەر زانست و ژیری وەرنەگرتووە، لەوەدا بە تەواوەتی جیاوازە لە لاهوتی ئوسوڵیەتی موحافیزکارەکانی خاوەن ئاڕاستەیەکی تازەگەری)) (جریفن، ١٩٨٩: ٣)، هەروەها جەختیش دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە لاهوتی پۆست مۆدێرنیزم بڕوای بە بوونی خودا هەیە و بە شێوەیەکی هاوتا جیاکاریی دەکات لە نێوان بیرۆکەی خوایەتی لە ڕاددەبەدەری

سروشت كه پەیوەستە بە سەردەمی پێش مۆدێرنیزم و قۆناغە سەرەتاییەکانی مۆدێرنیزم لە ڕوویەکەوە و لە نێوان تیۆری ڕیالیزمی ئیلحادیی کە پەیوەستە بە ڕوانگەی جیهانیی مۆدێرنیزمی ئێستاوە لە ڕوویەکی ترەوە.

وێنەی ئەو هەوڵە گۆڕانخوازییانە هێنانە کایەی بزاڤێکی ڕیفۆرمخوازی دەخوازێت کە گرنگی بدات بە چوارچێوە کلاسیکییەکانی بوونگەرایی و مەعریفەناسی و فەنا خوازی. چونکە بەپێی بۆچوونی جریفن: ((لە توانای خودا نییە کە یەکتا خاوەنی هێزە بەدیهێنەرەکان بێت، هەروەك لە توانایدا نییە کە یەکلایەنە ڕێگری بکات، یان دەست وەربدات لە هێز و تواناکانی ئەم جیهانەدا)) (جریفن، ١٩٨٩: ٥)، هەروەها بانگەشەکردن بۆ ناسینی حەقیقەت لەسەر هەندێ تێڕوانینی ڕاگەیەنراوی ناوبزاڤە ڕیفۆرمخوازەکە ناکرێ. لەوانەیە ئەم وێناگرتنە وەك ڕێکەوتنێك دەرکەوێت لە نێوان پەروەردگاری تاقانەی بیروباوەڕکانی کاسۆلیکی و خودای زانستی ڕەها لە سەردەمی نوێ دا. ئەوەبوو هەوڵێك درا بۆ پێشکەشکردنی چەمکێك بۆ خودا، جیاواز لە وێناکردنی خودا بەو شێوەی کە مۆدێرنیزم ڕەتیکردۆتەوە، بەڵام چەمکی نوێ هێشتا لە هەناویدا هەندێ نیشانەی بنەڕەتی هەڵدەگرێ کە لە سیناریۆی مێژوویی بیروباوەڕەکانی مەسیحیەتەوە دەردەچێت، کە هەر لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا سەردەمی نوێ باوبووە. لەسەر ئاستی وجودی دەکرێ بوترێ کە بنەماکانی ئەم ئاڕاستەی ڕیفۆرمخوازییە، لە کتێبەکەی (میل)دا هەبووە لە بارەی ((خوایەتییەکی ڕەها، یان دەستبەسەرکراو)) هەروەها لە هەردوو تیۆرەکەی (جیمس)دا هاتووە لە بارەی ((خوایەتی دەست بەسراو)) و ((ئەزموونگەرایی ڕادیکالیزم))، کە پشت بە تێڕوانینی مەعریفەناسی دەبەستن.

لەبەر ئەوە ناکرێ وەسفی ئەو ئاڕاستەیە بکرێت بەوەی کە هەوڵێکی ڕیشییە بۆ گەیشتن بە نموونەیەکی نوێ، چونکە - زیاتر لەوە دەچێت - بە ڕێکەوتنێکی ڕیفۆرمخوازی دانرابێت بۆ هێنانەدی هەندێ ئامانجی پراگماتیکی بۆ گەڕاندنەوەی هاوسەنگی بۆ بیروباوەڕە تاکی و کۆمەڵگەییەکان و دروستکردنی ژینگەیەکی

ڕووحانی فیکری بۆ ڕێگا خۆشکردن لەبەردەم گرووپە جیاجیاکاندا، بۆ ئەوەی پێکەوە بژین بەبێ ئەوەی هیچ هەڕەشەیەك هەبێ دژ بەپێکەوە گونجانی کۆمەڵایەتی.

تاکێتی ئەم ئاڕاستەیە پشت بە پەرەپێدانی دەستبژێرییەکی نوێ دەبەستێت لە ئەنجامی پرۆسەی بەجیهانیکردنی ڕۆشنبیری لە جیاتی هاندانی لەبەریەکگرتنەوە (کۆپیکردن)ی لاهوت بە گەڕانەوەبۆ مەسیحیەتی کلاسیکی. بەجیهانیکردنی ڕۆشنبیری ژینگەیەکی دەستبژێری هاوشێوەی ئەوەی کە لە سەردەمی ئاشتی ڕۆمانیدا هەبوو دەستەبەر دەکات، کە لە میانەیدا گۆڕانکاریی مەسیحیەتی کاسۆلیکی هاتەدی، هەروەك توانرا بونیادێکی لاهوتی ئەخلاقی فۆرمۆلە بکرێت بۆ پاساودانی واقیعی ژیاریی نوێ، ڕاستە کە لاهوتی مەسیحی لەوانەیە دووچاری قۆناغێکی ڕاگوزەری نوێ ببێت لە سەرەڕێی ئەو ژینگە تێکەڵکراوە دەستبژێرییەدا، بەڵام باشترە بۆمان کە ئاگاداریی بدەین لەوەی کە ئارەزووە قۆرخکارییەکەی شارستانێتی ڕۆژئاوایی، کە ڕووەکەی تری دراوی چەمکی بەکاربردن دەنوێنێت، بەردەوام ڕێگر دەبێت لە بەردەم دەوڵەمەندبوون و زۆربوونی ئەو ئاڕاستەی یەکگرتنە لە نێوان ڕێبازە ئایینیی و فەلسەفییەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، ئەوەش بەتێکدانی ڕێگاکانی پرۆسەی ژیاندنەوەی کولتوورە ڕەسەنەکان، لەم ڕوانگەشەوە نوسخە تازەگەرییەکەی شارستانێتی ڕۆژئاوا کەمتر لێبوردەییان دەبێت وەك ئەوەی کە لە سایەی ئاشتی ڕۆمانی دابوو لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا، لەگەڵ دەرکەوتنی ئاڕاستەی بەیەککردنیش لە ناوچەی ئۆقیانووسی هێمن دا، کە چەمکە ئەمریکییەکان و چەمکەکانی دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی دوور توانیان لەگەڵ یەکتر بتوێنەوە و پێکهاتەیەکی ئایینیی ئەخلاقیی دروست بکەن کە بگونجێت لەگەڵ چەمکەکانی سەرمایەداری سەردەم و هەروەها لەگەڵ لاهوتی پۆست مۆدێرنیزمدا، کە هێشتا خۆگری دەکات بۆ ئەوەی درێژکراوەی ڕێنماییەکانی مەسیحییەت بنوێنێت

لە چوارچێوەی سیستمی ئەمریکی ـ ئەتڵەسییدا، لەگەڵ ئەو قازانجەی کە بەدەستی هێناوە لە سوودوەرگرتنی لە ڕێنماییە ڕوحانییەکانی سەر بە کولتورەکانی تر.

**ج ـ گواستنەوەی ناوەندی شارستانییەت:**

بەدیلێکی تر هەیە کە دەکرێ بەشدار بێت لە زاڵبوون بە سەر قەیرانە ژیارییەکەدا، ئەوەش بە گواستنەوەی ناوەندی شارستانییەت بۆ شوێنێکی تر. بە پێی ئەم تێڕوانینە، ئەو قەیرانەی ئێستا بە قەیرانێکی ژیاریی بە مانا گشتگیرەکەی دانانرێت، بەڵکو قەیرانی ناوەندی شارستانێتییەکی دیاریکراوە، خۆ ئەگەر گواستنەوەیەك، یان گۆڕانێك بەسەر ئەو ناوەندەدا بێت، ئەوا ڕەنگە ژینگەییەکی گونجاوتر دروست ببێت بۆ دووبارە هاوسەنگکردنەوەی توخمە ناوخۆییە چالاکەکانی ناو شارستانێتییەکەی ئێستا، بەڵام پێش ئەوەی تاوتوێی ناوەندە بەدیلەکان و کێشە و گرژییەکانی دەوروبەریان بکەن، باشتر وایە بزانین مەبەست لە (ناوەندی شارستانییەت)) چییە؟

لە مێژووی شاستانێتییەکاندا مەسەلەیەکی بنەڕەتی هەیە کە پەیوەستە بە سەرچاوەی ئەو چالاکی و کاراییەی ڕۆڵی هەیە لە دەرکەوتنی ئەستێرەی شارستانێتییەك لە ژینگەیەکی دیاریکراودا و درێژبوونەوەی لە دوای ئەوە بۆ ناوچەکانی تر. ئەو فراوانبوونە، یان ئەو درێژبوونەوەیە بە دوو ڕێگا ڕوو دەدات: یەکەمیان بەفراوانبوونی ئەو توانا و کاریگەرییەی کە لە ناوەندی هەر شارستانێتییەکەوە دروست دەبێت و ئاڕاستەبوونی بەرەو دەوروبەری بازنەکەی لە ڕێگای سەپاندنی سەروەری سیاسیی و ئابوورییەوە. دووەمیان: ئەوەیە کە ناوەندی شارستانێتییەکە بگوێزرێتەوە بۆ ژینگەیەکی نوێ لە ڕێگای چەندین هۆکارەوە، وەك: کۆچکردن و ڕوودانی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکەدا، مەبەست لە ناوەندی شارستانێتییەکە لێرەدا ئەو شوێنەیە کە دروستبوونی نیشانە بنەڕەتی و جیاکەرەوەکانی هەر شارستانێتییەك دەبینێت و ئەو شوێنە دەبێتە بنکە و نیشتمانی بنەڕەتی ئەو شارستانێتییە، ناوەندی شارستانێتی

بەو مانایە ژینگەیەکی ئیستاتیکی ڕاوەستاوی چەقبەستوو نییە، بەڵکو ژینگەیەکی زیندووە شەپۆل دەدات بە جووڵە لە ئەنجامی ڕوودانی کارلێککردن لە نێوان هێزەکانی ڕاکێشان بەرەو ناوەند و هێزەکانی دەرپەڕاندن دوور لە ناوەند بەرەو جیهانی دەرەوەی دەوروبەری خۆی، یان ئەوەی کە بە بەراورد لەگەڵ ناوەنددا بە پەراوێز و لاپەڕ دادەنرێت، ئەو کاتە ناوەندی شارستانێتییەکە خۆی دەست دەکات بە پووکانەوە، بە هۆی دووچاربوونی بە حاڵەتی ڕاوەستان، ئیتر ناتوانێت لە بەرامبەر هەر ناوەندێکی ترەوە خۆی ڕابگرێت کە دەستی کردبێت بەگرتنەبەری ڕێگای گەشەکردن و پێشکەوتن.

چەندین ئاماژەی فیکریی و سیاسیی هەن کە بەڵگەن لەسەر دەرکەوتنی ناوەندێکی شارستانێتی نوێ، لەوانە ئاماژەی فیکریی کە پرۆسەی بەرهەمهێنانەوەی ڕۆشنبیریی لە خۆدەگرێت، جگە لەوەی ئاڕاستەی هەڵقوڵانی فیکریی ڕوون دەکاتەوە کە دەربڕی ئاڕاستە بنەڕەتییەکانی ئەو شارستانێتییەیە، ناوەندی شارستانێتییەکەش تەعبیر لە سروشتی ئەو ژینگە فیکرییە دەکات کە ئاڕاستە فیکرییە بنەڕەتییەکانی تێدا گەشە دەکات، بەڵکو کارتێکرنی درێژ دەبێتەوە بەرەو ناوچەکانی پەراوێز و لاپەڕ لە ڕێگای سەپاندنی میتۆدی فێرکاری و دامەزراوەیی خۆیەوە، هەروەها ئاماژەی ئابوورییش هەیە کە تەعبیر لە ئاڕاستەی هەڵقوڵانی کەرەستەی خاو و بەرهەمهاتووەکان دەکات و زۆر وا دەبێت کەرەستەی خاو لە ناوچەکانی دوورە دەست و پەراوێزەوە بەرەو ناوەند دەگوێزرێتەوە، بەڵام مەوادە بەرهەمهاتووەکان بە ئاڕاستەی پێچەوانە لە ناوەندەوە بەرەو ناوچەکانی پەراوێز و دوورەدەست دەگوێزرێتەوە. ناوەندی شارستانێتییەکە میکانیزمەکانی بازاڕی خۆی بەسەر پەیکەرە ئابوورییەکانی ناوچە دوورەکان و لاپەڕ و دەوروبەری خۆیدا دەسەپێنێت، بۆ زامنکردنی سەروەریی ئابووریی خۆی بەسەریاندا و لەو چوارچێوەیەدا نیشاندەری سیاسی دێت بۆ دەربڕینی پەیکەری دابەشکردنی خێر بەسەر هەردوو ئاستی دەرەوەو ناوخۆی پەیوەندییە سیاسییەکاندا، بۆیە دەبینین

که دەسەڵاتی سیاسی ناوەندی شارستانێتییەکە هەمیشە خواستی یەکەمی بریتییە لە سەپاندنی ئەو سیستمە ئەمنییە نێودەوڵەتییە کە زیاتر گونجاوە لەگەڵ ئامانجە سیاسییەکانیدا. کاتێك هێزی سیاسی ناوەندەکە شکست دێنێت لە ئاڕاستەکردن و کۆنترۆڵکردنی سیستمی جیهانیدا، ئەوە دەبێتە نیشانەیەك لەسەر دەستپێکردنی گواستنەوەی ناوەندی شارستانێتییەکە بۆ جێگایەکی تر، لەو ڕوانگەیەوە ئەدائی سیاسەتی ئەمریکی لە دوای شەڕی ساردەوە ئاماژەیەکی ماناداره کە شیاوی دیراسەکردنە.

ئەورووپای ڕۆژئاوایی ناوەندی بنەڕەتی شارستانێتی نوێ بوو، ئەوەبوو سەدەی نۆزدەهەم چڵەپۆپەی گەشەکردنی ئەو ناوەندە بوو، ئاماژە فیکری و ڕرشنبیری و سیاسییەکانیش ڕادەی زاڵبوونی سەروەری هێزە ڕاکێشەرەکانی دەرخست بەرەو ئەورووپای ڕۆژئاوایی. لەو ڕۆژگارەدا ئەورووپا لانکەی ڕێبازە فیکرییە باوەکان بوو وەك فەلسەفەی (کانتیزم و هیگڵیزم و مارکسیزم) بەو سیفەتەی ئاڕاستە و بۆچوونی پوخت ئەورووپایی بوون، هەر ئەو بۆچوون و ئاڕاستانەش بوون کە نەك تەنها عەقڵیەتی ئەورووپاییان دروستکرد، بەڵکو ڕوخسارە فیکرییە گشتییەکانی سەدەی نۆزدەهەمی بە تەواوەتی پێکهێنا، ئەوەبوو تیۆری پەیدابوون و پەرەسەندن و تیۆری (داروینیزم) باڵادەستی ڕەگەزی ئەورووپایی و ڕۆشنبیری ئەورووپایی گریمانە کرد و هاوزەمان زانکۆکانی ئەڵمانیا بوون بە سەرچاوەی ڕاکێشانی بەشی زۆری عەقڵە بلیمەت و هەڵکەوتووەکانی دەوڵەتە جیاجیاکان، لەوانەش: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو عەقڵیەتە هەڵکەوتوانە ـ کە ماددەی سەرەتایین بۆ بەرهەمهێنانی فیکریی ـ دەستیانکرد بە کۆچکردن بەرەو ئەورووپا و لە هەمان کاتیشدا ئەورووپا دەستی کرد بە هەناردنی بۆچوونە فەلسەفی و ئایدۆلۆژییەکانی خۆی بۆ جیهانی دەرەوە.

خۆ ئەگەر سەیری ئاماژە ئابورییەکان بکەین کە نیشان لەسەر پرۆسەی گواستنەوەی (ناوەندی شارستانیەت)، دەبینی کە هەمان ئاڕاستەی ئاماژە

فیکرییەکانی هەیە، بۆ نموونە ڕێژەی بەرهەمهێنانی کیشوەری ئەورووپا بە ٦٠٪ی تێکڕای بەرهەمهێنانی پیشەسازی جیهانیی دەخەملێنرا: (ئینگلتەرا بە ڕێژەی ٣١,٨٪، ئەڵمانیا بە ڕێژەی ١٣,٢٪، بەلجیکا بە ڕێژەی ٢,٩٪ و ئیتالیا بە ڕێژەی ٢,٤٪ بەشداربوون تیایدا) ئەوەش لە ساڵی ١٨٧٠، لە کاتێکدا بەشی کیشوەری ئەمریکای باکوور لە ڕێژەی ٢٣,٣٪ تێنەدەپەڕی و بە تێکڕای (٢٣,٣٪ بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان و ١٪ بۆ کەنەدا)، هەروەك ڕووسیا بە ڕێژەی ٣,٧٪ بەشدار بوو، لەهەمان کاتدا هەموو دەوڵەتەکانی تر (بە ژاپۆن و هیندستان و..تاد) بە ڕێژەی ١١٪کەی تری بەشداربوون. ڕواڵەتە بنەڕەتییەکانی سیستمی جیهانیی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بە پێی دابەشکردنی هێز و دەسەڵاتی ئەورووپایی پێکهاتبوو، کە ئاماژەیەکی سیاسییە لەسەر پێگەی ناوەندی شارستانێتی جیهانیی، ئەورووپا لەو ماوەیەدا جەنگەکانی ناپلیۆنی بینی و پاشان هاوسەنگی هێزە سیاسییەکانی دوای سەردەمی ناپلیۆن و یەکبوونی هەریەك لە ئەڵمانیا و ئیتالیا، ئەوانە هەموو فاکتەری بنەڕەتی بوون بۆ پێکهێنانی سیستمی جیهانیی لە سەدەی نۆزدەهەمدا، دوای ئەوە سەردەمی ئیستیعماری هات بەوپێیەی سیستمێکی جیهانیی بوو، کە توانی باڵادەستی ئەورووپا بەو سیفەتەی کە ناوەندی شارستانێتییە بەبێ ڕکابەر جێگیر بکات.

بەڵام ڕۆڵی ناوەندێتیی ئەورووپا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەرەنگاربوونەوەیەکی دژوار ڕووی تێکرد، دوای ئەوەی ناوەندی شارستانییەت دەستیکرد بە گواستنەوە لە ئەورووپاوە و لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسیی پەڕییەوە بۆ ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جێگیر ببێت، ئەو پرۆسەی گواستنەوەیە خێراتربوو دوای هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانیی، تا گەیشتە حاڵەتی کاملبوون، لە دوای ئەوەی جەنگی دووەمی جیهانیی کۆتایی هات. ئەوەبوو دامەزراوە زانستییەکانی ئەمریکا دەستیانکرد بە جێپێلێژکردنی زانکۆکانی ئەورووپا و

جێگرتنەوەیان وەك ناوەندی پێشەنگ، بە تایبەتی دوای پرۆسەی چاکسازی سیستمی خوێندنی باڵا لە ئەمریکا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا.

لە لایەکی ترەوە گۆڕانکاریی هاوشێوە کە پەیوەستبوو بە مەسەلە ئابوورییەکان دەرکەوتن، ئەوەبوو بەشی میحوەری ئەتڵەسیی لە بەرهەمهێنانی جیهانیی دەستی بە زیادبوون کرد لە ڕێژەی ٢٤,٣٪ لە ساڵی ١٨٧٠دا بۆ ٣١,٥٪ لە ساڵی ١٩٠٠دا، هەروەها لە ڕێژەی ٣٨,١٪ لە ساڵی ١٩١٣دا بۆ ڕێژەی ٤٤,٦٪ لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٩دا، لە کاتێکدا بەشی ئەوروپا لە ڕێژەی ٦١٪ لە ساڵی ١٨٧٠دا نزم بوویەوە بۆ ڕێژەی ٤٩,٢٪ لە ساڵی ١٩٠٠دا و لە ڕێژەی ٤٢,٢٪ لە ساڵی ١٩١٣ بۆ ڕێژەی ٣٤٪ لە ساڵی ١٩٢٩دا. گۆڕانکارییە فیکریی و ئابوورییەکان ڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر ئاڕاستە سیاسییە جیهانییەکان لە دوو شەپۆلی یەك لەدوای یەکدا، یەکەمیان لە شێوەی پێشەکییەکی زەمینەسازییدا بوو لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەمدا، کاتێك چالاکی ڕۆڵی ئەمریکا لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتی جیهانیی دەرکەوت و کۆمەڵەی گەلان وەك ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی جیهانیی پێکهات کە ٦٣ دەوڵەت بوون بە ئەندام تیایدا، ئەمریکا ڕۆڵی میانگیری بینی لەو قۆناغە ڕاگوزەرەدا، شەپۆلی دووەمیان: لەگەڵ سیاسەتی فراوانخوازی (هیتلەر)دا بوو کە هەوڵی دا بۆ پارێزگارییکردن لە سەروەری سیاسی ئەوروپا لە ڕێگای یەکخستنی لە ژێر چەتری هەیمەنەی ئەڵمانیدا، ئەوەبوو (هیتلەر) بەکردەیی هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا، تا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە قورسایی خۆی بەشداری جەنگەکەی کرد و بە پشتیوانی ژێرخانێکی ئابووری زەبەلاح، توانی لە لایەنی لوجستیکییەوە باری گرانی ئەو هەڵمەتە سەربازییە هەڵبگرێت، هەروەك دەنگدانەوەی هەلومەرجی دوای جەنگ لەسەر دەرهاویشتە سیاسییەکان دەرەنجامی گۆڕانکارییە فیکریی و ئابوورییەکانی پەیوەندیداربوو بە ناوەندی شارستانێتییەوە، کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانی پایەکانی سیستمی نوێی جیهانیی دابمەزرێنێت بە ئامادەبوونێکی مامناوەندی ئەوروپی، تەنانەت ئەو ناوەی کە نرا لە

ڕێکخراوە ئەمنییە ڕۆژئاواییەکەی کە لە دوای تەواوبوونی جەنگ دامەزرا بەشێوەیەك بوو کە ڕەنگدانەوەی پرۆسەی گواستنەوەی ناوەندی شارستانیەت بوو، ئەوەبوو ناوی (ناتۆ: ڕێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی)ی لێ نرا.

دوای ئەوە بەدیل بۆ ناوەندێتی ئەمریکا لە ئەوروپای ڕۆژئاوایی دەرنەکەوت، لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی و بە تایبەتی لە یەکێتی سۆڤیەت بەهۆی قورسایی ئایدۆلۆژیی و بونیادی ئابووریی و هێزە سەربازییەکەیەوە بووە بەدیل و ڕکابەر بۆ هەیمەنەی ناوەندی ئەتڵەسیی، ئەو ئایدۆلۆژیا نوێیەی کە یەکێتی سۆڤیەت گرتییەبەر، بە چەمکە تایبەتییەکانی تێڕوانینە شیکارییەکەی کە لە ناو چوارچێوەیەك لە ڕاستییە تیۆرییە ناوخۆییەکانی دامەزرابوو ژینگەیەکی فیکریی بەدیلی دەستەبەرکرد، ئەو ژینگە ئەلتەرناتیڤەی ژمارەیەکی زۆر لەو بیرمەندانەی بۆ خۆی ڕاکێشا کە ئەو خاڵە لاوازانەیان دەرککردبوو کە دووچاری کۆمەڵگە سەرمایەدارییەکان بووبوو، بەڵام ئەو کۆنترۆڵە فیکرییەی کە ئایدۆلۆژیای مارکسیزم سەپاندبووی، دەرفەتی دایە شارستانێتی ڕۆژئاوا بۆ ئەوەی جارێکی تر هاوسەنگی بۆ خۆی بگێڕێتەوە.

لە واقیعدا ئایدۆلۆژیای سۆشیالیستی توانی ئەلتەرناتیڤێك بۆ گەشەکردنی ئابووری پێشکەش بکات لە میانەی سیاسەتێکی پلاندانانی مەرکەزیی کە لە سەرەتاوە سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنا، خۆئەگەر نیشاندەرە ئابوورییەکان خۆیان بەکاربهێنن، دەبینن کە بەشی ڕووسیا لە بەرهەمهێنانی پیشەسازیی جیهانیی لە ڕێژەی ٣,٧٪ لە ساڵی ١٨٧٠ زیادی کرد و گەیشتە ٤,٣٪ لە ساڵی ١٩٢٩دا و پاشان گەیشتە ڕێژەی ١٨,٥٪ لە سایەی حوکمی سۆڤیەتدا، لە ئەنجامی ئەو چالاکییە فیکریی و ئابوورییەدا بوو کە یەکێتی سۆڤیەت بوو بە جەمسەرێك لە سیستمە دووجەمسەرییەکەی دوای جەنگی جیهانیی دووەم و بە درێژایی ماوەی شەڕی سارد بەردەوامبوو.

ئێستا سیستمی جیهانیی بە قەیرانێکی دژواردا تێدەپەڕێت بەهۆی چەند هۆکارێکەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە ئەزموونی سۆشیالیستیش شکستی هێنا و

نەیتوانی ئەلتەرناتیڤێکی ژیاریی ڕاستەقینە پێکبهێنێت، بە هۆی لەدەستدانی مروونەتی پێویست لە ڕووی فیکری و سیاسییەوە.

دووەمیان ئەوەیە کە هێزەکانی ڕاکێشانی فیکریی و ئابووریی کە لە ناوچەی ئەتڵەسییەوە دەردەچێت، دەستیان کردووە بە پاشەکشە بەهۆی پەیدابوونی ئەلتەرناتیڤی بەهێزتر و کاریگەرتر، پێشەوایانی بزاڤی ڕیفۆرمخوازیی شارستانێتی ڕۆژئاوایی بڕوایان وایە کە ئەو قەیرانەی ئێستا قەیرانێکی ژیاریی جیهانیی هەمەلایەنە نییە، بەڵکو قەیرانێکە تایبەتە بە ناوەندێکی شارستانێتی دیاریکراوەوە، کە ئەویش ناوەندی شارستانێتی ڕۆژئاوایە، هەروەها بڕواشیان وایە کە هێشتا دەرفەت لەبارە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو قەیرانەدا لە میانەی پرۆسەی گواستنەوەی ناوەندی شارستانێتییەکە بۆ ناوچەیەکی تر بە یەکێك لەم دوو ڕێکارەی خوارەوە:

١ـ گۆڕانکاری کلاسیکی/نوێی ناوەندی شارستانیەت) ئەوروپا و کۆمسیۆنی ئەوروپی).

ئەم هەوڵە ناودەبرێت بە هەوڵە تەقلیدییە تازەکە، چونکە ئامانجی زاڵبوونە بەسەر قەیرانە ژیارییەکەدا لە میانەی گواستنەوەی ناوەندی شارستانێتییە کە لە ئەمریکاوە، بۆ ئەوەی دووبارە لە ژینگە بنەڕەتییەکەی (ئەوروپا) جێگیر ببێتەوە، لە سەرەتای پەنجاکاندا مەبەست لە بزاڤی یەکێتی ئەوروپا، بریتی بوو لە بەدەستهێنانی هەندێ ئامانجی ئابووری سنووردار، بەڵام زۆری پێنەچوو کە ئەو تێڕوانینە فراوان بوو، بۆ نموونە سەرنج دەدەین کە هاوسۆزی بۆ دەستپێشخەرییەی گۆرباچۆڤ بۆ دامەزراندنی (نیشتمانێکی ئەوروپی یەکگرتوو) لە زیادبووندابوو وەك دەربڕینێکی ئەو هیوا و ئاواتەی ئەوروپییەکان لەوبارەیەوە، لێرەدا پێویستە ئاماژە بە دوو فاکتەری گرنگ بکەین کە پەیوەستە بە گەیشتن بە بەدیهێنانی ئەم تێڕوانینەوە، یەکەمیان: شاراوەیە لە مانا و مەبەستی سیاسی و ڕۆشنبیری لە پشت ئەو دەستکەوتە ئابوورییانەی کۆمسیۆنی ئابووری ئەوروپی بەدەستهێناوە، کە هاوزەمان بوون لەگەڵ گەشەکردنی ئابووری لە ئەڵمانیادا و بە تایبەتی لە نیوەی

دووەمی دەیەی حەفتاکاندا، ئەوە بۆیە کەمجار بوو لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بەشی ئەوروپا لە بزاڤی ئابووری جیهانییدا بە شێوەیەکی نەگۆڕ زیادی کرد، لە ئەنجامی پەرەپێدانی میکانیزمی بازاڕەوە بۆ شێوەیەك کە شیاوی، فراوانبوون بوو. دووەمیان: بێداری هۆشیاری ئەوروپی بوو بە تایبەتی دوای پەیماننامەی ئاسایش و هاوکاریی ئەوروپی کە لە هەلنسکی لە ساڵی ١٩٧٥دا دەرچوو، لە کاتێکدا فاکتەری یەکەم بەوە جیا دەکرێتەوە کە زیاتر چونیەك و کارایە، دەبینین فاکتەری دووەم زیاتر گشتگیر و جێگای قبوڵە.

بیرۆکەی یەکخستنی ئەوروپا لە سەدەی بیستەمدا دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی (ئارستیدبریان) وەزیری کاروباری دەرەوەی فەرەنسا کە لە میانەی وتارێکدا ڕایگەیاند کە لە کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ساڵی ١٩٢٩دا پێشکەشی کرد، لەوکاتەدا پێشنیازی کرد بە دامەزراندنی کۆمۆنویلسیکی ئەوروپایی کە دەوڵەتە سەربەخۆ و خاوەن سەروەرییەکان لە خۆبگرێت لەسەر بنەمای هاوکاری سیاسیی و ئابووری، بەڵام بیرۆکەکەی لەو ڕۆژگارەدا کۆسپ و تەگەرەی لەبەردەمدابوو، بەتایبەتی بەهۆی دژایەتیکردنی چەند هێزێکی دەسترۆیشتوو لە ئەوروپادا لە سەروویانەوەیە هەریەك لە بەریتانیا و ئەڵمانیا و ئیتاليا، چونکە ئەو دەوڵەتانە لەوکاتەدا لە ململانێیەکی گەرمدا بوون بۆ فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتی تایبەت بە خۆیان، ئامانجی سەرکردەکانی ئەو دەوڵەتانەش سەرکەوتنی هەریەکەیانبوو لە بینینی ڕۆڵێکی سیاسی بەهێزتر لە هاوشێوەکانی لەسەر گۆڕەپانی جیهان، بەڵام پرۆسەی پەراوێزخستنی ئەوروپا دوای جەنگی دووەمی جیهانیی ئەو هیوا و ئاواتانەی لە گۆڕنا، بە تایبەتی دوای وێرانبوونی ئەڵمانیا و ئیتاليا، فەرەنساش زۆر پێویستی بە یارمەتییە ئابوورییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، بەریتانیاش کە پێشەوای نائەوروپی ناوەندی شارستانێتی ئەتڵەسی بوو، خۆی ئامادە دەکرد بۆ چۆڵکردنی ناوچە داگیرکراوەکان کە سەرچاوەی باڵادەستی بەریتانیا بوون بەسەر گۆڕەپانی سیاسی نێو دەوڵەتیدا. بانگەوازەکەی (چەرچڵ) لە ساڵی ١٩٤٦دا بۆ

دووباره ڕێکخستنەوەی ناوماڵی ئەورووپی هەنگاوێك بوو كە لە ژێر ئەو هەلومەرجەدا مانای قووڵی لەخۆگرتبوو.

لاوازیی ڕێژەیی و تاکتیکەکانی هێز نێودەوڵەتییە پەرتەوازەکانی ناچارکرد لەسەر یەکخستنی تواناشاراوەکانیان، نیشانەکانی ئەم ئاڕاستەیە بە ڕۆشنی لە میانەی دامەزراندنی ڕێککەوتننامەی ئەورووپیدا بۆ خەڵووز و ئاسن لە ساڵی ١٩٥٠دا دەردەکەوێت کە بە کورتکراوەیی ناسراوە بە (ECSC)، ئەو ڕێککەوتننامەیەی کە بە ناوکی یەکەمی کۆمسیۆنی ئابووری ئەورووپی ئێستا دادەنرێت و مەبەست لە پشت ئەم تەواوکارییە ئابوورییەوە ئەوەبوو کە دەرفەتێك بدرێت بە فراوانبوونی بازاڕ لە پاڵ کۆنترۆڵکردنی پیشەسازی خەڵووز و ئاسنی ئەڵمانیدا، کە هێزی پاڵنەری پێك دەهێنا بۆ جبەخانەی چەکی ئەڵمانی لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانییدا. یاسای ڕێککەوتننامەی ئەورووپی کە شەش دەوڵەت تیایدا بەشداربوون، چەند بیرۆکەیەکی گرنگی لە خۆگرتبوو بۆ گرتنەبەری چەند هەنگاوێکی ئیجابی بەرەو یەکخستنی ئەورووپا، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەو لایەنانەی کە ئیمزای ڕێککەوتننامەکەیان کردبوو، بەوحاڵە پابەند بوون بە بەجێهێنانی ئەو ئامانجە بە بەراورد لەگەڵ ئەو حەماسەتەی کە لە قۆناغێکی دواتردا دەریان دەخست، بە تایبەتی لە دوای نیوەی دووەمی دەیەی حەفتاکانەوە. ئەو حەماسەتەش لە ژێر کاریگەری دوو فاکتەر پەیدابووبوو:

**یەکەم:** ئەو چالاکییە ڕوو لە زیادبوونەی کە ئابووری ئەورووپی بەدەستی هێنا.

**دووەم:** ڕاگەیاندنی پەیماننامەی هەلنسکی ساڵی ١٩٧٥ بوو، کە باسی لە بارەی بنەمای سیاسی و کولتووری ئەورووپای یەکگرتووەوە دەکرد. هەروەك گۆڕان لە بۆچوونی دەوڵەتە ئەورووپییەکاندا لە بارەی یەکگرتنی ئەورووپاوە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە دیاربوو، لە میانەی ڕاپۆرتی (تیندمان) کە ئاڕاستەی ئەندامانی ئەنجومەنی ئەورووپی کرابوو لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٦دا و تیایدا هاتبوو کە:

١ـ (یەکێتیی ئەورووپا) مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە بەرەیەکی یەکگرتووین لە بەرامبەر جیهانی دەرەوەدا، ئەوەش دەخاتە سەرمان کە لەو سۆنگەیەوە

هەڵسوکەوت بکەین لە گشت پەیوەندییەکانی دەرەوەماندا، ئەگەر پەیوەست بێت بە پەیوەندییە سیاسییەکانی دەرەوە، یان ئاسایش، یان پەیوەندییە ئابوورییەکان، یان یارمەتییەکانی بواری گەشەپێدان.

٢- یەکێتی ئەوروپا دان دەنێت بە سەربەخۆیی ناوخۆیی پەیوەست بە خۆشگوزەرانی و گەشەکردنی ئابووریی دەوڵەتانی ئەندام و ئەنجامەکانیش پەسەند دەکات، لەوانەش سیاسەتی ئابووری و دراو کە زامنی بەدیهێنانی گەشەکردن بێت.

٣- سەرکەوتنی یەکێتی ئەوروپا هاوکاری نێوان گەلان دەخوازێت بۆ ئەوەی کاراو دادگەرین.

٤- لەسەر یەکێتی ئەوروپایە کە ئامادەییەکی هەمیشەیی هەبێت لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵك دا و بەوەش مافەکانیان دەپارێزێت و کاردەکات بۆ پەرەپێدانی شێوازی ژیانیان.

٥- لە پێناو جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی کە لە ئەستۆی یەکێتی ئەوروپادایە، پێویستە هەموو دەزگاکانی بخرێتە بەردەست و دەسەڵاتی پێویستی پێ بدرێت بۆ دیاریکردنی وێنەیەکی سیاسی هاوبەش و توندو تۆڵ و هەمەلایەنە، هەروەها دەسەڵاتی تەواویشی هەبێ بۆ جووڵاندنی هەمیشەیی و بەشەرعیەتێکی پێویستەوە بۆ بەجێهێنانی سەروەری دیموکراسیەت.

٦- هەروەك کۆمەڵگە ئامانجی خۆی هەیە هەوڵ ئەدات بۆ ئەوەی پێیان بگات و بەرژەوەندیی خۆی هەیە و کار دەکات بۆ پاراستنیان، بەهەمان شێوەیش یەکێتی ئەوروپا بوونی خۆی بە شێوەیەکی پلەبەندی بەهێز دەکات (لاسزلو، ١٩٧٧: ٤٩)

هەستی ئەوروپییەکان بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو بەرامبەر جیهانی دەرەوە لە دوای ڕاگەیاندنی سیاسەتی خۆئاشکراکردن کە (گۆرباچۆڤ) پشتیوانی لێ دەکرد گەیشتە لوتکە، ئەو سیاسەتەی کە بووە هۆی دروستکردنی ژینگەیەکی ئارام و هاندەر بۆ کەمکردنەوەی بەشداربوونی ئەمریکی لە دابینکردنی ئاسایشی ئەوروپیدا بەو سیفەتەی هێزێکی ئەتڵەسییە، ئەو ئاڕاستەیە بە توندی ڕەچاو

دەکرێت لە بانگەوازەکەی (هـ.شمیدت) ڕاوێژکاری ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٨٧دا بۆ دامەزراندنی ئەوەی کە پێی دەوترا (ئاسایشی هاوبەشی)، ئەو هۆکارەی کە بەشداریی کرد لە فراوانکردنی ئاسۆکانی ئابووری و سیاسی لە دەوڵەتەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا، کە بە هۆیەوە ئارەزوو و پەرۆشی خۆیان دەربڕی بۆ بەشداربوون لە کێشانی نەخشەیەکی نوێ بۆ ئەورووپا.

لە لایەکی ترەوە یەکخستنی هەر دوو بەشەکەی ئەڵمانیا – بەوپێیەی کە میحوەری ئابووری ئەورووپای یەکگرتووە – دەربڕینێکبوو بۆ گواستنەوەی بە ناوەندکردنی ئابووری و سیاسی بۆ ئەورووپای ناوەڕاست، دوور لە بەریتانیا کە هاوپەیمانی نزیکی ناوەندی ئەتڵەسیی (ئەمریکا)یە و دوورترە لە مەرکەزی کیشوەری ئەورووپاوە، هەستکردن بە ژیانەوە لە ئەورووپا کاتێك پەیدابوو، کە دامەزراوە سیاسییە کلاسیکییەکان و تازەکانیان هەستیانکرد بە ڕادەی گرنگی خۆگونجاندن لەگەڵ هەلومەرج و گۆڕانکارییە نوێکاندا، هەموو ئەو هۆکارانەی کە لە ئەنجامی ڕاگەیاندنەکەی (گۆرباچۆڤ) لە بارەی سیاسەتی خۆئاشکراکردنەوە پەیدابوون، زۆر دوورتربوون لەوەی سەرکردەکانی کیشوەری ئەورووپایی چاوەڕێیان دەکرد، ئەوانەی کە ئامادەکارییان دەکرد بۆ جێبەجێکردنی تەواوکاری لە نێوان دوانزە ئەندامەکە و لە ساڵی ١٩٩٢دا.

لەسەر ئەو بنەمایە ئەو تەواوخوازی ئابووری سنووردارییە کە لە ئەورووپا هاتەدی لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا، گۆڕا بۆ دینامیکیەتێکی ڕۆشنبیریی و سیاسیی و ئابووریی هەمەلایەنە بە مەبەستی گەڕاندنەوەی ناوەندێتی هێزە ئەورووپییەکان لە سیاسەتی جیهاندا. ئەوەش وەك میحوەرێکی ژیاریی بەدیل دەردەکەوێت کە کیشوەری ئەورووپا لە بەرامبەر میحوەری ئەتڵەسی دا پێشکەشی دەکات، دەتوانین هەوڵی گواستنەوەی ناوەندی شارستانێتی بەوە وەسف بکەین کە هەوڵێکە لە پێناو زاڵبوون بەسەر قەیرانە ژیارییەکەدا، بەڵام ئاستی ئەو هەوڵە هەرچەندێك بێت، تەنها کاردانەوەیەکی کلاسیکییە نوێیەکانی ئەورووپایە لە هەوڵدانیان بۆ کردنەوەی ژیان بە

بەری پارچەکانی شارستانێتییە کۆنەکەی ئەوروپادا، بەڵام لە ڕوانگەی مێژووی شارستانێتییەکاندا، هەوڵەکانی ((کلاسیکییە نوێیەکان)) هەمیشە لەو دووڕیانە مێژوویانەدا پەیدا دەبن کە هێزەکانی داهێنان و ڕەسەنایەتی لە شارستانێتییەکدا دەست بە پووکانەوە دەکەن.

لە چوارچێوەی ئەوهەوڵە کلاسیکییە نوێیەدا، ڕەچاوی ئەوە دەکەین کە ناوەندی ئەوروپایی جەخت لەسەر ئەو نەگۆڕە ژیارییانە دەکاتەوە کە ناوەندی ئەتڵەسیی پێشتر دایناون، لەگەڵ هەندێ دەستکاریکردن لە پێکهاتەیەکی نوێ دا لە پێناو گەڕاندنەوەی ئەو دەرکپێکردنی زاتییەی کە مرۆڤی ڕۆژئاوایی لە دەستی داوە، هەروەها بۆ گەڕاندنەوەی هاوسەنگیی ئەو هۆکارە هەستیارانەی کە خراپ تێکچوون لە دوای پرۆسەی بە ئەمریکاییکردنی شارستانێتی ئەوروپی لە سایەی باڵادەستی ناوەندی ئەتڵەسییدا، بۆ نموونە هەستکردنی ڕوو لە زیادبوونی هۆشیاری ئەوروپی ژینگەیەکی دەروونی و فیکری گونجاوی دروستکردووە بۆ گێڕانەوەی دەرکپێکردنی زاتیی بە شوناسی نەتەوەیی ئەوروپایی و جێگرتنەوەی وەك بەدیلێك بۆ دەرکپێکردنی زاتیی ئەتڵەسی کە ناسراوە بە (ڕەگەزی سپی ئەنگلۆ ساکسۆنی پرۆتستانتی– WASP)، ئەوەی کاتێك قبوڵ دەکرێت کە وەك ئینتیمایەکی زاتی فەرعی سەر بەو ئینتیما بنەڕەتییە بێت کە خۆی لە هەستی نەتەوەیی ئەوروپیدا (Homo Occidentalism) دەنوێنێت.

(گالتنگ) (١٩٨٥: ١١) لیستێکی سەیر دەگێڕێتەوە سەبارەت بە هەست و دەمارگیری نەتەوەیی ئەوروپایی و دەڵێت: ((شوێن: مەبەست لێی ناوچەی ئەوروپای ڕۆژئاوا و ئەمریکای باکوورە، ئەوشوێنە ناوەندی جیهان پێك دێنێت، بەڵام ئەوەی کە دەمێنێتەوە چوارچێوەی دەرەکییە، یان پەراوێزەکانی ئەم ناوەندەیە، لەگەڵ ئەوەی وادەبینرێت کە ناوەند جووڵێنەری یەکەمە. کات: بەوپێیەی کە کارلێککردنە کۆمەڵایەتییەکان لەناو ئەم چوارچێوەیەدا ڕوودەدەن، هەموو هەمان یەك ئاڕاستەیان هەیە لەگەڵ بوونی پەرەسەندنی لە خوارەوە بۆ سەرەوە، هەروەها بەم شێوەیە،

بەڵام ئەو بوونی کێشەو قەیران ڕەت ناکاتەوە کە پێویستە چارەسەریان بۆ پەیدا بکرێت. لەوانەیە بە سەرەنجامێکی باش کۆتایی بێت بە گەیشتن بە مەعریفەیەکی ئیجابی، کە بتوانێت بە هۆیەوە لە جیهان تێبگەین لە سنووری ژمارەیەکی زۆرکەم لەو ڕەهەندانەی کە لە کۆتاییدا کورت دەکرێنەوە لە بڕواهێنان بە هەبوونی تێڕوانینێك بۆ جیهان لە میانەی ڕوانگەیەکی تاکڕەهەنددا وەك تیۆری ئەتۆمی، یان لە میانەی پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوە: بەوپێیەی کە مرۆڤ سەروەری سروشتە، یان لە میانەی پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە: کە دەڵێت خودا (یان هەندێ بنەمای ئایدۆلۆژی)، مافی دەستوەردانی هەیە لە توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤدا، یان پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ: کە دەڵێت بوارێك هەیە بۆ جیاکاری و پلەبەندی لە نێوان مرۆڤەکاندا لەسەر ئاستی تاك و چین و نەتەوە، هەروەها هەندێ مرۆڤ هەن کە پلەیەك لە یەکسانی و هاوتابوونیان هەیە زیاتر لە کەسانی تر)). گالتنگ هەوڵیداوە کە بیسەلمێنێت ئەو شەش مەرجە بوونیان پێویستە لەپێناو بەدیهێنانی ئیدراکی زاتیی لەو ڕوانگەی ئەورووپاییەوە کە ئاماژەی بۆ کرا.

سیستمی بەها ئەورووپییەکان، کە گریمانە دەکات بە دانانی چوارچێوەیەك بۆ بنەماکانی بەهاکان بە مەبەستی کۆنترۆڵی ئەخلاقی بەسەر ئاڕاستەی گەشەپێدانی ماددییدا، پێویستە پەیوەندی توندی هەبێت بەومەرجانەوە کە پێویستن بۆ بەدیهێنانی ئیدراکی زاتیی، ئەو مەرجانەی کە لە چوارچێوەی نەگۆڕە نموونەییە ناوخۆییەکاندا ڕیزبەند دەبن، بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە کە ببێتە هۆی ڕاگرتنی پەرەسەندنی ژیاریی تاکاتێك ئەورووپا سەروەری و ناوەندێتی خۆی بەسەر ئابووری جیهان و سیستەم و سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بۆ دەگەڕێتەوە، ئەوەش لەگەڵ ئەوەدا کە لە توانایدا نابێت زیندوێتییەکی پێویست لەناو شارستانێتی نوێدا دروست بکات، لە ڕوانگەی ڕەسەنایەتی شارستانێتی ئەورووپییەوە، وێنەی ئەو ئامانجە بەجێهێنانی لە تواناداا نابێت، جگە لە میانەی گۆڕینی ئەو نەگۆڕە بنەڕەتیانەوە نەبێت کە هەر

لەسەرتاوە ئەم شارستانێتییەی لەسەر بنیاتنراوە، ئەوەش بە ئەنجامدانی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە ئیدراکی زاتیی ئەوروپاییدا.

**٢ـ هەوڵدان بۆ بنیاتنانی سەنتەرێکی شارستانێتی لە باسفیکی دا:**

سەنتەری ئۆقیانووسی باسیفیکی وەك هێزێکی ڕاکێشەری گەورەی ناوەندی لەسەر گۆڕەپانی ئابووری جیهانیی، بە تایبەتی لە دوای گەشەکردنی ئابووری و دەسکەوتە تەکنۆلۆژیاکان کە ژاپۆن بەدەستی هێنا هاتەکایەوە، جگە لە دەرکەوتنی چوار پڵنگەکەی یەکەمی ئاسیا (کۆریای باشوور، تایوان، هۆنگ کۆنگ و سەنگافوورە) و دوای ئەوانیش دەرکەوتنی چوار پڵنگەکەی تری ئاسیا (مالیزیا، تایلاند، ئەندونیسیا و فلیپین) لەم چەند دەیەی دواییدا، ئەوەش لەو هۆکارانەبوون کە ڕادەیی هێزی دێوەکەی باسفیکی خستەڕوو، باڵا دەستی ئابوورییە بەهێزەکانی باسفیکی بەسەر دەزگا داراییە نێودەوڵەتییەکان و بازرگانی ئازادەوە، بووە هۆی کەڵەکەبوونی گەورەترین یەدەکی پارەی بیانی لە جیهاندا لەو ناوچەیەدا، هەروەها پەرەسەندنی فراوانی پیشەسازییە تەکنۆلۆژییەکان بووە هۆی دروستکردنی سەنتەرێکی ڕاکێشان بۆ بەرهەمهێنانە نێودەوڵەتییەکان، وەك ئەوەی پێشتر لە ناوچەی دەریای ناوەڕاست ڕووی دا پێش دەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی. ئەوەش– تاڕادەیەکی زۆر– لەو ڕۆڵە دەچێت کە ئەورووپای ڕۆژئاوا بینی لە ساتەوەختی شۆڕی پیشەسازییدا و ئەو ڕۆڵەش کە دەوڵەتەکانی پەیمانی ئەتڵەسی بینیان لە قۆناغی بەجیهانیکردنی ئابوورییەکانی جیهاندا. ئەو ناوچانە خاڵی جەمسەرگیری ئابوورییەکانی جیهان دەنوێنن لەو قۆناغانەدا کە گۆڕانکاری جومگەیی و مێژوویی دەبینن. بۆ نموونە لە لیستی دوانزە بانقەکەی یەکەمی جیهاندا، تەنها یەك بانقی ژاپۆنی تێدابوو لە دەیەی حەفتاکاندا، بەڵام بەهاتنی ساڵی ١٩٨٩ دوانزە بانقی ژاپۆنی لە ڕیزبەندیی یەکەمدا بوون، هەروەك حەڤدە مەرکەزیان لەکۆی بیست و پێنج بانق لەسەر ئاستی جیهان داگیرکرد، هەروەها چوار پڵنگەکەی یەکەمی ئاسیاش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە بەرزکردنەوەی پشکی خۆیان لە

تێکڕای هەناردە پیشەسازییەکانی جیهان لە ٤٪ بۆ ١١٪ لە ماوەی نێوان ساڵی ١٩٧٥ تا ساڵی ١٩٨٨، لە کاتێکدا توانییان پشکی خۆیان لە هەناردەی دەزگا بەکاربەرە ئەلیکترۆنییەکان زیاد بکەن لە ڕێژەی ١٥٪ بۆ ڕێژەی ٣٠٪ لەماوەی نێوان ساڵی ١٩٨٥ تا ساڵی ١٩٨٧ (نایسبت، ابوردین،١٩٩٠: ١٨٦) و هەموو نیشانەکانیش بەهێز بوونی ئەو ناوچە پیشەسازییە چالاکەیان سەلماند.

هەروەها هەموو بەڵگەکان جەختی ئەوەیان دەکرد کە ئەو دەستکەوتە ئابوورییانەی ئەم سەنتەرەی ئاسیا بەدیهێناوە، لە ئایندەشدا بەردەوام دەبێت و ئەو ناوچەیەش دەبێتە یەکێك لە گرنگترین بازاڕە گەرمەکانی جیهان، بەهۆی تایبەتمەندییە جوگرافی و دیموگرافییەکانیەوە، جگە لە چەندین فاکتەری بنەڕەتی تری وەك بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و خوێندن بۆ داهاتە مرۆییەکانیان، ئەگەرچی هەندێ مەوادی خامی گرنگ وەك پەترۆلیان نییە.

بەڵام پرسیاری بنەڕەتی و زیاتر گرنگ لێرەدا لە بارەی ئایندەی ئەم سەنتەرە ئابوورییە سەرسوڕهێنەرەوەیە، کە ئایا ئەو گۆڕانە گەورەیەی کە لە سیستمی ئابووریی جیهانیدا ڕویداوە، دەکرێ بگۆڕێت بۆ ئەوەی ببێت بە گواستنەوەیەکی ڕاستەقینەی سەنتەری شارستانێتی لە میانەی دینامیکیەتێکی عەقائیدی و فیکریی و سیاسی هاوشێوە بۆ ئەو سەرکەوتنە ئابوورییە یان نا؟ لەگەڵ کۆتایی شەڕی سارددا دەرفەت گونجاوبوو بۆ هێزە سیاسییەکانی ئەم سەنتەرە بۆ ئەوەی بڕۆن بەرەو ئاسۆیەکی نوێ بەبەکارهێنانی هەموو دەرفەتە گونجاوەکان بە مەبەستی گۆڕینی سەرکەوتنە ئابوورییەکە بۆ ڕۆڵێکی کاریگەرتر لەسەر گۆڕەپانی سیاسی جیهانیی، ئەو ڕۆڵەی کە دەکرێ بەدی بهێنرێت لە میانەی بەکارهێنانی میکانیزمێکی شۆڕشگێڕانەدا لە بەڕێکردنی دانوستان و سەودا گەرییەکان لەگەڵ ناوەندی هێزە کۆنەکان. بەهەر حاڵ نیشانەی زۆر ئاشکرا کە ئەو ئارەزووە دەخاتە سەرمەحەك، لە پشت سروشتی ئەو بنەما فەلسەفیی و ئایینیی و فیکرییانەوەیە کە ئەم سەنتەرە ژیارییە کە تازە سەرهەڵدەدات و لەو میانەدا دەتوانرێت ئەوە دەستنیشان بکرێت کە

داخۆ لە توانایدا دەبێت چارەسەری قەیرانە ژیارییەکەی ئێستا بکات، یان نا؟ چونکە ڕەسەنایەتی و نەژادزادەیی ئەم سەنتەرە لەوەدایە ئەو ئارەزووە بکات بە هەوڵێکی ڕیفۆرمخوازی نوێ، نەك تەنها هەوڵێکی کلاسیکی دووبارەبووەوە. سەرکەوتنی ئابووری و چالاکی سیاسی هەرچەند بێت، بنەما فەلسەفی و ئایینییەکان هۆکاری یەکلاکەرەوەن، کە دەتوانن ڕەهەندێ بۆ میکانیزمە ڕۆژئاواییەکان بهێننە کایەوە لەسەر ئاستی ئابووری و ژینگەیی و سیاسی، دەکرێ وەسفی ئەم سەنتەرە ئاسیاییە بکرێت بەوەی کە نوێخوازە، بەهۆی ئەو هەموو سەرکەوتنانەوە کە بەدەستی هێناون لە دانانی بینای سەرمایەداریدا شان بەشان لەگەڵ کولتوورە کلاسیکییەکەیدا، ئەوەش لەگەڵ ئەوەی کە بنەما مێژووییەکانی ئەو کولتوورانە نە لە دوور و نە لە نزیکەوە هیچ پەیوەندییەکیان بەو نەگۆڕە مێژوویی و شارستانیانەوە نییە، کە هەر لە بنەڕەتەوە لە ناوەندە ئەوروپی و ئەتڵەسییەکانەوە هەڵقوڵاون، ئەوانەی کە بونیادە سەرمایەدارییەکان لە ئامێزیدا گەشەی کردووە، پرسیاری بنەڕەتیش لێرەدا ئەوەیە: ئایا بۆ ئەم پێکهاتە ئاسیاییە دەلوێت کە گۆڕانێکی ژیاریی هەمەلایەنە بهێنێتەدی؟ دەوڵەمەندی و فرە چەشنی پێوەرە مێژوویی و شارستانێتییەکان لەم ناوچەیەدا، دەکرێ ئاسۆی نوێ بکەنەوە کە ڕێگاچارەی تازەداهێنراو بخەنەڕوو بۆ زاڵبوون بەسەر قەیرانە ژیارییەکەی ئێستادا لە دوای ڕۆحانییەت و ئیدراکی زاتیی بەهاکانەوە.

دەڵێین: ئەو بوارانە لەوانەیە ببن بە سەرچاوە دینامیکییەکانی بزواندنی ئەو سەنتەرە شارستانییە ئاسیاییەی کە تازە سەریهەڵداوە، لە دوای پرۆسەی گۆڕانکاریی شارستانییەت کە پشت دەبەستێت بە سروشتی ئاوێتەی ئەو شارستانییەتە چالاکە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو فرەییە ڕەنگە ببێتە کۆسپ لە بەردەم پەرەسەندنی بنچینەی تایبەتمەند و پێکەوە گونجاوی پێویست بۆ تەواوکردنی گۆڕانکارییە ژیارییەکە، ئەمەش بە تەواوی ئەو گرێ ئاڵۆزەیە کە ئەو کولتوورە ئاوێتەییانە لەبار دەبات، وەك کولتووری (شەنتۆ) لە ژاپۆن، کە خاوەنی

فەزڵە لە دروستکردنی ئەو سەنتەرە ئاسیاییەدا، هەروەها تەقالیدی ڕووسیای سۆڤیەتی لە ناوچەی باکووری باسفیك دا و باکگراوندی کولتووری کۆنفۆشی سۆشیالیستی لە چین، بەو سیفەتەی کە فاکتەری دیمۆگرافی ئاشکرا و بەهێزی کاریگەرە لە ناوچەی ڕۆژئاوای باسفیك دا، هەروەها ئەزموونی شارستانێتی ئیسلامیی لە دوورگەکانی مەلایۆی هیندی لە باشووری ڕۆژئاوای باسفیك دا و باکگراوندی کولتووری کۆلۆنیالیزمی ئەوروپای مەسیحی لە ئوسترالیا لە باشووری باسفیك و کولتووری ئەمریکای باو لە ناوچەی ڕۆهەڵاتی باسفیك و هەندێ کولتووری ڕەسەن لە ناوچەی ئۆقیانووس دا، چونکە ئەو کولتوورە جیاوازانە هەموو پێکەوە نموونەیەك پێك دەهێنن کە ڕەنگدانەوەیەك بێت بۆ ئەو کێشە و گرفتانەی ئەو جۆرە فرەچەشنیە دەیوروژێنن لە بەرامبەر ئەو کۆمەڵگایانەوە کە خاوەنی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزن.

بۆ ئەوەی نموونەیەك بۆ ئەو کێشە و گرفتانە بخەینە ڕوو، لەسەرمانە کە لە مەسەلەی ئیدراکی زاتیی بکۆڵینەوە بەو سیفەتەی کە ڕەنگدانەوەیەکی بنەڕەتییە بۆ هەر تێڕوانینێکی شارستانێتی، بۆ نموونە دەبینین کۆدی نهێنی لە پشت دینامیکیەتی سەربازی و ئابوورییەوە کە لە ژاپۆن سەری هەڵدا لە سەدەی بیستەمدا، شاراوەیە لە ئیدراکی زاتی بەهێز و هوشیاری سایکۆلۆژی گەشەکردووی گەلی ژاپۆنیەوە کە هەر لە بنەڕەتەوە لەو ئایدۆلۆژییەوە پەیدابووە کە پێی دەڵێن (ژاپۆنیزم) و (موعجیزەی ژاپۆنیزم)، کە هەردووکیان بەرهەمی پرۆسەیەکی تا ئەوپەڕی کارابوون لە چڕکردنەوەی وزە و لێهاتنە مرۆییەکاندا، لە ئەنجامی ئەوەدا ئەگەرچی ژاپۆن لە مادده سەرەتاییە بنەڕەتییەکاندا هەژاربوو، بەڵام توانی لە بەرامبەر دژوارترین هێزی سیاسی و ئابووری جیهاندا ڕابووەستێت. ئەو چڕکردنەوەی وزە و توانا مرۆییانە نەهاتنەدی جگە لە ڕێگای پرۆسەیەکی گەشەپێدانی هەمەلایەنە و کاراوە نەبێت بۆ ئیدراکی زاتیی تاکی ژاپۆنی، مێژووی شارستانێتییەکان پڕیەتی لە چەندین نموونە کە پەیوەندی جەوهەری نێوان

دینامیکیەتی سەرمایە مرۆییەکان لە ڕوانگەی چالاکی ژیارییەوە و لە نێوان چەمکی ئیدراکی هەستیدا ڕوون دەکاتەوە، شارستانێتی هیندی تەنها لە ڕێگای کۆکردنەوەی ئەو هۆزە ئارییانەوە سەری هەڵدا کە هەستێکی دیاریکراویان هەبوو بە جیاوازی و باڵادەستی خۆیان، هەرهەمان هەست بوو کە بەردەوامبوونی شارستانێتی چینی بۆ چەندین سەدە زامن کردبوو، بابووەستیٚ بیناکردنی شورای گەورەی چین، کە بە ڕاستی موعجیزەیەکی دیفاعیە، بیناکردنی ئەو شورایە لە پێچ و پەناکانیدا مانای جیایی نێوان ناوچەکانی ئەو خەڵکەی تێیدایە کە هەستێکی تایبەتییان هەیە لە ئیدراکی زاتیی، کە جیاوازە لە زەوییەکانی ئەو خەڵکەی ئەو جۆرە هەستەیان لا نییە.

جگە لەوەش فراوانبوونی بێپایانی شارستانێتی ئیسلامیی کە لە نێوان سیٚ کیشوەردا درێژ بووەوە و گەیشتە ئیسپانیا و ئاسیای ناوەڕاست لە ماوەیەکی کورتدا، ئەو فراوانبوونە ڕەنگدانەوەی موعجیزەیەکی سەربازیی نەبوو، بە قەدەر ئەوەی کە ڕەنگدانەوەی هوشیارییەکی وجودی و شۆڕشگێڕی نویٚ بوو، کە لە ئیدراکێکی زاتیی لە جیهانێتی پەیامی ئیسلامەوە هەڵقوڵابوو، گەلی جوولەکەش خۆگرییان لە بەرگرییکردندا بەهۆی پرژوبڵاوەبوون و کۆچکردنی هەمیشەییان بۆ چەندین سەدە پەیدا کردبوو، ئەو خۆگری و بەرخۆدانەیان تەنها لە میانەی نەگۆڕی ئیدراکی زاتیانەوە دەست کەوتبوو، لە دوای ئەوانەیشەوە ئەوەی کە شارستانێتی ڕۆژئاوا بەدەستیهێناوە لە باڵادەستی بەسەر جیهاندا، دەگەڕێتەوە بۆ تواناکیان لەسەر کۆکردنەوەو بەسیجکردنی توانا مرۆییەکانیان لە پیاوانی ئایینیی و پیاوانی کار و سەربازەکانیان لە سەردەمی ئیستیعمارییدا، ئەگەرچی پێکهاتە جەوهەرییەکانی هۆشیاریی زاتی بە تەواوی لە یەکتر جیاواز بوون، هەیانە ڕەگەزییە، هەیانە نەتەوەیی ناوچەییە، هەشیانە فەرمانبەرداری و ئایینییە...تاد. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە کە خاڵە جەوهەرییە هاوبەشەکانی نێوان ئیدراکە زاتییەکان بدۆزینەوە، بەڵکو ئامانجمان جەختکردنەوەیە لەسەر پێویستی دۆزینەوەی ئیدراکی

زاتیی بەهێز و بە توانا لەسەر کۆکردنەوەو بەسیجکردنی هێز و توانا مرۆییەکان بە مەبەستی ژیانکردنەوە بە بەری شارستانێتی ئینسانیدا جارێکی تر.

بە گەڕانەوە بۆ موعجیزەی ژاپۆنی لە سەدەی بیستەمدا و ئەوەی کە یەکەم لە مەیدانی سەربازییدا بە دەستی هێناوە پاشان لەسەر ئاستی ئابووری، دەبینین کە ئەو دەستکەوتانە بەبێ ئیدراکێکی زاتی بەهێز نەدەهاتە دی. ئەو ئیدراکە بە دەوری خۆی بوو بە هۆی درووستبوونی هێزێکی ڕاکێشەری مەرکەزی لە ناوچەی ئۆقیانووسی باسفیکدا، بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەوە تەنها ئیدراکێکی زاتی سەرچاوە ژاپۆنی بوو، مەرجەعیەتەکەی لە ناوچەی باسفیکییەوە وەرنەگرتبوو، بۆیە پێویستە فەزڵەکە لەمەدا ڕاستەوخۆ بگێڕینەوە بۆ کولتووری ژاپۆنی و باکگراوندی مێژووی ژاپۆنی، بەڵام بوونی چەند ئیدراکێکی زاتی تریش ڕەچاو دەکرێت لە ناوچەی باسفیك دا، دەکرێ وەك بەدیلە گریمانەییەکان حسابیان بکەین، ئەو بەدیلانەش هەندێ جار سیمەتی دژایەتیان هەڵگرتووە بەرامبەر ئیدراکی ژاپۆنی، بەڵام کێشە و گرفتە درێژخایەنەکان لە میحوەری باسفیکی دا کار دەکەنە سەر پێکەوە گونجاندن لە نێوان ئەو ئیدراکە زاتییانەدا، هەرچەندە هەندێ پێیان وایە کە دژە بەدیلی ئیدراکاتی زاتی لە ئەورووپاش هەبووە، وەك لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئیتالیا، یان تەنانەت ئاڕاستەی ئەنگلۆساکسۆنی لە ماوەی دوای سەدەی حەڤدە هەمدا، پێش ئەوەی ئەورووپا هەنگاو بەرەو پێشکەوتن بهاوێت، بەڵام پێویستە لەبیرمان نەچێت کە ئەو دەوڵەتە ئەورووپیانە هەموویان هاوبەشبوون لە باکگراوندی مێژوویی و ئایین و زمانەکانیان، کە یەك بنەچەیان هەیە و کولتووری هاوشێوەیان هەیە، لە کاتێکدا فرەکولتووریی لە باسفیکدا کێشەیەکی گشتگیرتر و ئاڵۆزترە، جگە لە کێشەی فرە کولتووری لە میحوەری باسفیکدا، کێشەیەکی تر لە گۆشەیەکی جیاوازەوە دەردەکەوێت، ئەویش کێشەی بە جیهانیکردنی چەمکەکانی بەکاربردنە، کە دەبێتە هۆی لێك هەڵوەشانەوەی هەموو شێوەکانی ئیدراکی زاتیی ڕەسەن لە ناوچەکەدا، کولتوورە ژاپۆنییە ڕەسەنەکان یارمەتیدەربوون لە

بەدەزگاییکردنی پەیکەرە سەرمایەدارییەکاندا لەسەر زەوییەکی نامۆ، ئەو پرۆسەیەی کە پێی وترا ((خەباتی سامۆرای ئابووری))، لەکاتێکدا کە هێشتا خەسڵەتە ڕووخێنەرەکان کە پەیکەرە سەرمایەدارییەکان جیادەکاتەوە، هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە بوون کە زیانی بە دینامیکییەتی ئەو کولتوورە ڕەسەنانە دەگەیاند، بۆیە چاوەڕوان دەکرێ گرفتاری سەنتەری باسفیکی لە نێوان سندانی بەجیهانیکردن و چەکوشی ناسیۆنالیزمدا بەردەوامبێت.

بەکورتی دەکرێ بوترێت کە ئەگەری ئەوە هەیە ناوچەی باسفیکی ڕۆڵێکی شارستانی میحوەری ببینێت لە ماوەی سەدەی بیست و یەکەمدا و ئەوەی کە یارمەتی دەدات لەوەدا ئەوەیە کە ژینگەیەکی پێکهاتەیی چاکسازی هەیە کە توخمەکانی ڕۆحانیەت و ئاینیی و فەلسەفیی و کولتووری پێویستی بۆ دابین دەکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی تێکچوونە ژینگەییەکان و ئەخلاقییە/ ماددییەکان و نەفسییە/ وجودییەکان، کە قەیرانە ژیارییەکە بەجێی هێشتووە لە ئەنجامی بەزەحمەت گونجانی نێوان توخمەکانی، کە لە هەڵوێستێکی شێواودایە بەهۆی بەریەککەوتنی دوو ئاڕاستەی فیکری: تایبەتمەندێتی و جیهانێتی. بەڵام هێشتا زوویەتی بووترێت کە ئەم سەنتەری باسفیکیە لە زاڵبوون بەسەر قەیرانە ژیارییەکەی ئێستادا سەرکەوتوو دەبێت.

**أ- گۆڕانی ژیاریی و سیستمی جیهانیی:**

یەکێك لە گریمانەکانی نموونەی مۆدێرنیزم کە پەیوەستە بە سیاسەتی نێودەوڵەتییەوە دەڵێت: سیستمی جیهانیی نویٚ بەو سیفەتەی کە لەدایکبووی شارستانێتی ڕۆژئاوایە بە یەکەم سیستمی جیهانیی دادەنرێت، یان یەکەمین سیستمی جیهانییە کە بە لای کەم زۆرترین پێشەکەوتنی بەخۆوە دیوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گریمانەیە بە تەواوەتی لەگەڵ بیرۆکەی بەرەو پێشچوونی مێژوویی تاك ئاڕاستەدا دەگونجێت و لەوانەشە لە ڕوانگەی بە جیهانیبوونەوە بە مانا جوگرافیاکەی، بەم شێوەیە بەردەوام بێت، بەڵام پێش دەرکەوتنی سیستمی ونیستیڤاڵی کە یەکەم خشت بوو لە بینای سیستمی ئەوروپی هاوچەرخدا، ئەستەمە دان بەوەدا بنرێت کە مرۆڤ پێگەیشتنی فیکری و سیاسیی و روحانی پێویستی نەبووە بۆ پێکهێنانی سیستمێکی جیهانیی بێگومان لە نێوان سیستمی جیهانیی و نموونە ژیارییەکەدا پەیوەندییەکی ڕۆشن هەیە، هەموو شارستانییەك هەڵدەستیٚ بە دامەزراندنی سیستمێکی جیهانیی کە لەو چوارچێوەیەدا هەڵدەستیٚ بە دیاریکردنی پەیوەندییە نێوەندییەکان و پەیوەندییە نەتەوەییە ناوخۆییەکان، خاڵی لووتکەی مێژوویی بۆ باڵادەستبوونی هەرشارستانێتییەك لە مەودای سەقامگیربوونی سیستمە جیهانییەکەیدا خۆی دەنوێنێت، کە هەر لە - بنەڕەتدا - لە هۆکارەکانی بەدیهێنانی ئاسایش و ئەکتیڤکردنی لایەنە ئابوورییەکانی ئەو سیستمە جیهانیەدا بەدیار دەکەوێت. هەر ئەوەش ڕێگا بەو هێزە سیاسییە دەدات کە باڵادەستە بەسەر سەنتەری شارستانێتییەکەدا، بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتی تەواو بۆ سەپاندنی ڕیزبەندی بەها و کردارییەکانی بەسەر دەوڵەتەکانی تردا وەك ئەنجامێکی نکوڵی لێنەکراوی سەروەری سیستمە جیهانییەکەی، بە پێچەوانەشەوە بۆ شێوازەکانی تری ناهاوسەنگی لە پێوەرەکانی شارستانێتییە باڵادەستەکەدا، چونکە لە ماوەی قەیرانە ژیارییەکەدا لەسەر ئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتی بەڵگەیە لەسەر نەبوونی سەقامگیری و نەبوونی ئاسایش لە سیستمە جیهانییەکەدا، بۆیە هەموو گۆڕانکارییە

ژیارییەکان دووبارە دارشتنەوەی سیستمی جیهانیی دەخوازێت لە لایەنی چوارچێوە بەهایی و یاسایی و دەزگاییەکانەوە.

بۆ نموونە ئەگەر سەرنج بدەین لە تێروانینی رۆمانیی لە بارەی دەریای سپی ناوەراستەوە، دەبینین کە ئەو (ئاشتی رۆمانی)یەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی گرتبوویەبەر، ئامانج لێی دانانی سیستمێکی جیهانیی بوو کە پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگەکانی ناوخۆی سنووری ئیمپراتۆریەت جارێکی تر رێك بخاتەوە، بەڵام کاتێك پایەکانی شارستانێتی رۆمانی دەستیکرد بە لەرزین لە ئاکامی کەڵەکەبوونی قەیرانە ژیارییە گشتگیرەکەی، سیستمی رۆمانی بەتەواوی گۆراو سیستمێکی نوێ شوێنی گرتەوە کە تێروانینی کۆمنوێڵسی مەسیحی دروستیکرد.

کاتێکیش شارستانێتی ئیسلامیی دروست بوو، کە پەیوەندییەکانی لە رووی ئابووری و سیاسییەوە لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا فراوان کرد، ئەمیش چوارچێوەی بەهایی نوێی دانا کە بگونجێت لەگەڵ تێروانینی تایبەت بەخۆی بۆ بونیادنانی سیستمێکی جیهانیی نوێ بۆ چەند سەدە بەردەوام بوو. لەگەڵ هێرشەکانی مەغۆل و خاچهەڵگرەکانیشدا، بەڵام چالاکیی ئابووری گەشەکردوو کە لە ئیسپانیا لە رۆژئاواوە درێژ دەبووەوە بۆ چین لە رۆژهەڵاتەوە، هەروەها لە ئاسیای بچووك لە باکوورەوە تا باکووری ئەفریقیا، لە باشوورەوە و بە رۆژهەڵاتی ئەفریقیادا تێدەپەری تادەگاتە هیندستان و ئەرخەبیلی مەلایۆ، ئەوە لە ئەنجامی ئەو ئاسایش و لێهاتنە ئیدارییەوە بەدەست هاتبوو کە سیستمی جیهانیی ئیسلامیی پایەکانی دامەزراندبوو. هەروەك بەدیهێنانی ژینگەیەکی رۆحی و فیکری توندوتۆڵ لە هیندستانەوە تادەگاتە ئیسپانیا تەنها لەسایەی چەتری سیستمی جیهانی ئیسلامیدا بەدی هاتبوو. هەروەها سیستمی میللەتان (Millet System) کە لە سایەی (ئاشتی عوسمانی ـ Pax Ottomana) سیستمێکی کۆمەڵگەیی و نەتەوەیی و ناوخۆیی بوو، کە هەموو ناوچەکانی ئەوروئاسیا و باکووری ئەفریقیای بۆ سەردەمانێکی دوورودرێژ داپۆشی بوو بە سەردەمی ویستیڤالیشەوە. سیستمی

عوسمانی بە بەراورد لەگەڵ سیستمی ویستیڤالیدا شێوەیەکی سەرەتایی سیستمی جیهانیی نەبوو، بەڵکو دەربڕینێك بوو بۆ نموونەیەکی بەدیل کە پێکەوەژیانی ئاشتییانەی بۆ چەندین سەدە دابینکردبوو لە نێوان زیاتر لە سی کۆمەڵدا ـ کە بە لای کەم ـ خاوەن بنەچەی جیاوازبوون لە بارەی زمان و ئایین و دابونەریتەوە. بەڵام ئەو سیستمە ڕووبەڕووی قەیرانێکی دژواربووەوە لە سەدەی نۆزدەهەمدا کاتێك سیستمی جیهانیی ئەوروپی، کە پشت بەستوو بە تێڕوانینی نە تەوایەتی دەستیکرد بە دەرکەوتن، کە یەکێك لە دەرەنجامە سیاسییەکانی ئەوەبوو سەنتەری شارستانیەت گوازرایەوە بۆ ئەوروپا، کە لەو کاتەدا لە ڕازاوەترین سەردەمی خۆیدا دەژیا.

بیناکردن لەسەر ئەوەی پێشەوە گۆڕانی نەگۆڕە ژیارییەکان گرنگترین فاکتەر پێکدێنێت لە دیاریکردنی بنەما بەهاییەکان و خاسیەتە دەزگایی و کردارییەکانی کە سیستمی جیهانیی باو جیادەکاتەوە. هەر هەمان مەسەلەش دەکرێ ڕەچاو بکرێ لە حاڵەتی پەرەسەندنی سیستمی جیهانی ڕۆژئاوایی دا، چونکە دەبینین ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر سەنتەرە ژیارییەکەدا هاتووە، بەسەر سیاسەتی نێو دەوڵەتیدا ڕەنگی داوەتەوە لە میانەی دوو دەیەی یەك لە دوای یەکی سەرەتای دەرکەتنی ئەو سەنتەرەدا.

هەروەها پەیوەندییەکی هۆکاریی گرنگ هەیە کە گۆڕانکارییە ژیارییەکان و سیستمە ئابووری و سیاسییە جیهانیەکان لەلایەکەوە، لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگە جیهانییەکان لە لایەکی ترەوە پێکەوە کۆدەکاتەوە. ئەو ئاکامە سیاسییانەی کە لە گۆڕانکارییە ژیارییەکانەوە دێنە کایەوە، بەهۆی دووبارە پێکهێنانەوەی سیستمی ئابووریی و سیاسیی جیهانیی لە ڕووی یاسایی و دامەزراوەییەوە ناچێتە بواری جێبەجێکردنەوە، تا دوای ئەوەی هەڵگیرسانی جەنگێك کە دەبێتە هۆی تێکدانی بونیادی جیهانیی تایبەت بە تێڕوانینە ژیارییە کۆنەکە، هەروەك لە میانەی ئەو گۆڕانکارییە ژیارییانەی کە لە ئەوروپادا لە دوای سەردەمی ڕێنیسانەوە ڕوویان دا

جەنگی سی ساڵەی لێکەوتەوە کە بوویە هۆی پارچە پارچە بوونی جەستەی کیشوەری ئەوروپا بۆ ماوەی زیاتر لە سەد ساڵ. ئەوەبوو سیستمی ویستیڤاڵی هاتەکایەو دوای ئەو جەنگە یاساکان فۆرمۆلەکران و (پەیماننامەی ویستیڤالیا) لە ساڵی ١٦٤٨دا مۆرکرا وەك هەوڵێك بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی ئەوروپا لە ڕوانگەی هێزە باڵادەستەکانی ئەوڕژگارەوە کە هۆکارێك بوون لەو گۆڕانکارییە ژیارییەدا. هەر ئەوەش بوو کە بووە هۆی دانانی سیستمی ((دەوڵەتی نەتەوە)) وەك سیستمێکی سیاسی جیهانیی نوێی گونجاو لەگەڵ بۆچوونە باوەکانی ئابووری ئەو سەردەمەدا لەوانە بۆچوونە بازرگانییە سەرمایەدارییەکان، یان ئەوەی بە (مرکانتیلیزم) دەناسرێت. جگە لەوانەش (کۆنگرەی ڤییەنا) کە لە ساڵی ١٨١٥دا دوای تەواوبوونی جەنگەکانی ناپلیۆن لە ئەوروپادا گرێدرا، بە مەبەستی دانانی تێڕوانینێکی نوێ بۆ سیستمە ئابووری و سیاسییە جیهانییەکان، بەپێی پێداویستییەکانی گۆڕانکارییە ژیارییە نوێیەکان کە لە دوای ئەو بازدانە فیکرییە سەری هەڵدا، کە هاوکات بوو لەگەڵ شۆڕشی فەرەنسی و ئەو جووڵە ئابوورییە چالاکەی شۆڕشی پیشەسازی ئینگلیزی هێنایە کایەوە. دوای ئەوە میکانیزمی کارکردنی سیستمە ئابوورییەکان گونجاو بوون لەگەڵ داخوازییە پەیکەرییەکانی چەمکەکانی پیشەسازی سەرمایەداری لە بارەی دەرپەڕینی بە لێشاوی مەوادی خام و ڕێککەوتننامەکانی بازرگانی ئازادەوە، ئەوەش بە مەبەستی خستنە بازاڕی بەرهەمەکان، هەروەك چەندین سیستمی سیاسی نوێ دەرکەوتن بۆ ئەوەی بە چاکی سەرپەرشتی ئەو چالاکییانە بکەن لە چوارچێوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییە بەیەکاچووەکانداو لە میانەی سیستمی هاوسەنگی هێزەکان لە ناوخۆی کیشوەری ئەوروپادا و هەروەها لە چوارچێوەی جێگیرکردنی بنەما ئیستیعمارییەکان لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

چەمکە ئیستیعمارییەکان سیستمێکی جیهانییان پێکهێنا و ئەوروپا سەپاندی بەسەر هەموو جیهاندا بەو پێیەی کە سەنتەری شارستانیەتی باڵادەستە بەسەر جیهاندا لە سەدەی نۆزدەهەمدا. هەر بۆیە هەمووارکردنی هاوسەنگی هێزەکان کە

کۆنگرەی (ڤییەننا) دانی پێدانا، ڕاستەوخۆ بەسەر شێوەی سیستمی جیهانیدا ڕەنگیدایەوە. ئەو سیستمەی کە هەموو کارێکی بریتیی بوو لە خۆگونجاندن لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیادا بەو سیفەتەی کە ئەولایەنەیە هاوسەنگی هێزەکانی لە سیستمی جیهانیی ئەو ڕۆژگارەدا داڕشتووە. داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن هێزەکانی ئەڵمانیاوە هەولێك بوو بۆ گۆڕینی سیستمی دابەشکردنی هێزەکان لەناو سەنتەری شارستانێتییەکەدا، بۆ دووبارە پێکهێنانەوەی پەیوەندییەکانی نێوان زلهێزەکان لەسەر ئاستی جیهانیی، وەك پێشەکییەك بۆ فراوانکردنی باڵادەستی ئەڵمانیا بەسەر کیشوەری ئەوروپادا و بەرزکردنەوەی بۆ ڕیزی دەوڵەتە گەورەکان لە ماوەی نێوان ١٨٧٠ و ١٩١٤دا. سەرباری هەوڵدانی ئەڵمانیا بۆ هێنانە کایەی چوارچێوەیەك بۆ دابەشکردنی دەسەڵات لە ناو سەنتەری شارستانێتییەکە و نێوان ئەو یاسا جیهانییانەی کە سیستمی (دەوڵەتی نەتەوە)یان توندوتۆڵکردبوو. ئەوەبوو لە کۆتاییدا چاوتێبڕینە ئیستیعمارییەکانی ئەڵمانیا بووە هۆی هەڵگیرسانی ناهەموارترینی ئەو جەنگانەی کە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا ڕوویاندا بێت.

هیچ ئامرازێك نەبوو بۆ ڕێگرتن لەو چاو تێبڕینە فراوانخوازییانە جگە لە ڕێگای پشتگیریکردنی یەکتر لە نێوان هێزە سیاسییەکانی تردا کە هیچ پەیوەندییەکیان بەوسەنتەرە شارستانیەوە نەبوو، لەوانەش بە تایبەتی ئەودەوڵەتانەی کەوتبوونە پەراوێزی سەنتەرەکە لە سەدەی نۆزدەهەمدا وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دەوڵەتەکانی ئەمریکای لاتینی و ئوسترالیا و ئەوانیتر.

ئەو دەوڵەتانە لەسەر ساحەی جیهانیی وەك ڕەنگدانەوەی هەوڵەکانی دابەشکردنی دەسەڵات بەسەر پاشماوەی دەوڵەتەکانی تری جیهاندا دەرکەوتن، هەروەك هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانیی دەرکەوتنی سیستمێکی جیهانیی نوێی تۆمارکرد لە ڕوانگەی سەنتەرێکی نوێی تری شارستانییەوە، کە خۆی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەنواند، لە لایەنی فیکری و ئابوورییەوە لە دوای

بیست ساڵەی سەدەی نۆزدەهەمدا و لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا گەیشتە چڵەپۆپە. ئەوەبوو سەنتەری شارستانی– خۆبەخۆ– گوازرایەوە لە لەندەنەوە بۆ نیویۆرك لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا و شێوازی بیرکردنەوەی ئەمریکی دەستی کرد بە دەربڕینی ئاڕاستەو بۆچوونە فیکرییەکانی شارستانێتی نوێ. هیتلەر هەوڵیدا سیستمی جیهانیی بە دەوری سەنتەری ئەوروپیدا ڕێك بخاتەوە، بەڵام نەیتوانی بەرەنگاری باڵادەستی دینامیکیەتی سەنتەری شارستانێتی ئەمریکی بێتەوە. ئەگەرچی لە دوو ساڵی یەکەمی جەنگی دووەمی جیهانییدا توانی هێزە ئەوروپییەکان تێك بشکێنێت، بەڵام داگیرکردنی (نورماندی) لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە سەرەتایەك بوو تەنها نەك بۆ ڕزگارکردنی ئەوروپا لە چنگ نازییەکان، بەڵکو ئاماژەبوو بۆ یەکەم هەنگاو لە ڕێگای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بۆ جێگیرکردنی سیستمی نوێی جیهانیی.

لە جەنگی جیهانیی دووەمی دوادیمەنی هەوڵەکانی گەڕاندنەوەی مەرکەزیەتی جیهانیان بە دەوری سیستمی جیهانیی ئەوروپیدا بینی و لە ئەنجامی ئەو جەنگەدا سیستمە کۆنەکەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان کۆتایی هات، هەروەك چەمکە ئیستیعمارییە کلاسیکییەکانیش کۆتاییان هات بەو پێیەی بەشێك بوو لە سیستمی جیهانیی هەڵوەشاوە. ئەو سەرەنجامە ڕێگای کردەوە لە بەردەم گۆڕانکارییە ژیارییە تازەکاندا بۆ خولانەوە لە خولگەی تازەپەیدابووی ئەمریکییدا کە سەرکەوتووبوو لە پەراوێزخستنی ڕۆڵی ئەوروپی لە دەرەنجامی فشاری ئەمریکی لە ڕۆژئاواوە و فشاری یەکێتی سۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتەوە، سیستمی دووقۆڵی وێنەی واقیعی دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان هەردوو سەنتەرە ژیارییە بەدیلەکەدا ئاشکرا کرد، کە توانییان خۆیان لە سیستمی پێشووی هاوسەنگی هێزەکان لە ئەوروپا دەرباز بکەن، ئەوەش لەکاتێکدا ڕوویدا کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ناو چوارچێوەی سیستمی نوێ جیهانیدا وێنایەکی ساختەی یەکسانبوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی کێشا.

له ڕاستیدا نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆڵی میانگیری بینی لە بەرژەوەندیی سیاسەتە ئیستیعمارییەکان کە خاوەنی پەیوەندییەکی ڕەگەزپەرستانەی لایەنگربوون و مەودای پێکەوەڕێکەوتن لە نێوان سیستمی سیاسی جیهانیی و تێڕوانینە ئابوورییە نوێیەکان ڕۆشن بووەوە، کە هاتبوو بۆ جێگیرکردنی چەمکەکانی کۆمپانیا فرەڕەگەزییەکان و بە جیهانیکردنی میکانیزمەکانی سەرمایەداریی و کولتووریی بەکاربردن. لەدوای ئەوەش باڵادەستبوونی ئەمریکی هات بەوپێیەی کە سەنتەری شارستانی ئەتڵەسییە کە پاڵی داوە بەو گۆڕانکارییەی لە سیستمی جیهانیدا ڕوویداوەو لەلایەن ئەو دامەزراوە نێودەوڵەتییانەوە پشتیوانی لێدەکرێت کە ئاڕاستەی سیاسی و ئابووری هاوشێوەی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانقی نێودەوڵەتی و ڕێککەوتننامە گشتییەکانی تەعریفەی گومرگی و بازرگانییان هەیە، هەیمەنەی ئەمریکیش هات بۆ لەناوبردنی هەر دەرفەتێك لە بەردەم ئارەزووی یەکێتیی سۆڤیەتدا بۆ پێکهێنانی بەدیلێکی سیاسی و ئابووری، لە ئەنجامی شکستهێنانی لەخۆگونجاندن لەگەڵ ئەو عەقڵیەتە ئابوورییە ڕاگوزەرەی کە هانی ئاڕاستەبوونی دا بەرەو بە جیهانیکردنی میکانیزمەکانی ئابووری سەرمایەداریی.

لەگەڵ دەسپێکی دەیەی دوایی سەدەی بیستەمدا، سەرەتای پرۆسەیەکی نوێمان بینی بۆ دووبارە پێکهێنانەوەی سیستمی جیهانیی لە ڕووی ئابووری و سیاسییەوە، لەسەر دەستی چەند هێزێکی ئابوورییدا کە لە ماوەی دوایین دوو دەیەدا لەسەر ساحەی جیهانیی دەرکەوتن، ئەوەبوو کە سیستمی دووجەمسەری پێش ئەوە سەرکەوتووبوون لە ڕێگرتن لە ڕەنگدانەوەی ئەو گۆڕانکارییانەدا لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی جیهان، بەڵام ئەزموونەکانی مێژوو دەریدەخەن کە ڕەنگدانەوەکانی گۆڕانکارییە ژیارییەکان لە سەرەتای سەرهەڵدانی سیستمێکی جیهانییدا ڕێڕەوی خۆیان لەسەر ساحەی جیهانیی وەرناگرن تا دوای هەڵگیرسانی جەنگێك کە نەگۆڕەکانی سیستمی جیهانیی کۆن تێك بدات، ڕووداوەکان بە دڵنیاییەوە ڕاستیی ئەوانەیان سەلماند بە هەڵگیرسانی قەیرانی کەنداو، کە بوو بە

پێشەکییەکی ڕێخۆشکەر بۆ ئەو جەنگە. هەربەهەمان شێوە کە پێشتر ڕوویدا، کشانی هێزە بیانییەکان بۆ کەنارەکانی کەنداو، ئامانج لێی ڕزگارکردنی کوەیت و گەڕانەوەیان نەبوو بۆ شوێنەکانی خۆیان، بەڵکو ئامانجی بنەڕەتی دارشتنەوەی سیستمێکی جیهانیی نوێ بوو کە سیستمی دووجەمسەری کەنار بخات، بەهۆی شکستهێنانی لە بەجێهێنانی دابەشکردنێکی ڕاستەقینەی هێزە سیاسی و ئابوورییەکان دا. خۆ ئەگەر بەراورد لە نێوان ڕزگارکردنی کوەیت و داگیرکردنی نۆرماندی دا بکەین، ئەو داگیرکردنەی کە خاڵی دەستپێکی هەڵاتنی سەنتەرێکی ژیاریی نوێ بوو، بۆمان دەردەکەوێت ئەوەی لە کوەیت ڕوویدا لە پرۆسە سەربازییەکان، زیاتر بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی سیستمێکی بەرگری جیهانیی بوو، کە مەبەست لێی هێشتنەوەی جیهان بوو بەو شێوەیەی خۆی لە ژێر سەرکردایەتی میحوەری ئەتڵەسیدا، کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشەوایەتی دەکات، بۆیە ناکرێ بڵێین جەنگی کەنداو تەنها قەیرانێك بوو لە نێوان دوو دراوسێی موسڵماندا ڕوویدا، بەڵکو سەرباری ئەوە، جەنگێك بوو زلهێزەکان هاندانیان بۆ کرد بە مەبەستی هەموارکردنی ڕەوشی سیستمی جیهانیی. لەسەر ئەوە هەندێ لێکدانەوە هەیە کە پێویستە جارێکی تر بە وردی پێداچوونەوەی بۆ بکرێ، لەوانە ئەو لێکدانەوەی کە دەڵێت جەنگی عێراق نیشانەیەك بوو بۆ ڕوودانی گۆڕانی ڕیشەیی لە سیستمی جیهانیدا، هەروەها گۆڕانکارییە سیاسییەکانی کە لە ساڵانی شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا ڕوویاندا وەك بزاڤی تەواوخوازی ئەورووپی و ئەو گەشەکردنی ئابوورییەی کە ناوچەی ئۆقیانووسی باسفیك بینی و ئەو چالاکییە بەرچاوەی جیهانی ئیسلامیی دەیبینێت و دوای ئەوانەش ئەو هەڵوەشاندنەوەی کە دووچاری بلۆکی سۆشیالیستی بووەوە.

ئێستا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ڕۆڵێکی زۆر گرنگ هەڵدەسێ لە پرۆسەی دووبارە دارشتنەوەی سیستمی جیهانیی دا لەوەتەی جەنگی کەنداو کۆتایی هاتووە، خۆ ئەگەر دارێژەرانی سیاسەتەکانی ئەمریکا سووربوون لە

بەرگریکردن لە بایەخی سەنتەرە ئەتڵەسییەکەیان لە بری ئەوەی دان بنێن بە ڕادەی گرنگی بەشداربوونی هێزەکانی تردا لە دارشتنەوەی سیستمی جیهانیدا لە ڕێگای دانوستانەکانی ئاشتی بە مەبەستی پێکهێنانی سیستمێکی نوێی دادپەروەرتر و شیاوتر بۆ جێگرتنەوەی ئەو ڕۆڵە ساختەکارییەی کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەیبینێت – ئەوا مسۆگەرە کە جەنگێکی تر هەڵدەگیرسێت، ئیتر ئەو جەنگە هەمەلایەنەبێت، یان سنوردار بێت، لێرەوەیە کە دەکرێ دەرك بە مەودای کارتێکردنی گۆڕانکارییە ژیارییەکان بکرێت، بە هۆی ئەو سروشتە دینامیکیەی کە ڕەنگدانەوە سیاسییەکانی بەسەر سیستمی جیهانیدا دەسەپێنێت.

**ب ـ فۆرمە گریمانەکراوەکانی پێکهێنانی سیستمێکی نوێی جیهانیی:**

گۆڕانکارییە یەك لەدوای یەکەکان لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا دوای ڕاگەیەنراوەکەی (گۆرباچۆڤ) لە بارەی پشتگیریکردنی بۆ سیاسەتێکی نوێی دەرەوە ڕوویاندا، بوو بە هۆی سەرهەڵدانی چەندین سەرلێتێکچوون لە سیستمی جیهانیی و پەیکەری داهاتوویدا. هەردوای کۆتاییهاتنی شەڕی سارد هەندێ لەو شیکەرەوانەی کە ئاڕاستە و بۆچوونی گەشبینانە و خەیاڵییان هەبوو، کۆتایی ئەو بارگرژییەیان ڕاگەیاند کە بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا زاڵ بووبوو. (کلارك، ١٩٨٩: ٦) وەسفی ئەو بۆچوونە دەکات بەوەی کە وێناکردنێکی شۆڕشگێڕانەیە بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ئەوەگریمانە دەکات کە ((ئامانج مودێرنیزمە، ئێمە هەڵدەسین بە دیراسەکردنی مێژوو، بەس بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکە پێشکەوتنخوازەکان تێ بگەین کە لە نموونە ڕەگداکوتراوەکەی ناو پرۆسە مێژووییەکە خۆیدا دەردەکەوێت)). ئەم دەقەی (کلارك) لە کتێبی (کون) ڕاستەوخۆ، پێش دامەزراندنی سیستمی جیهانیی لە ماوەی دوای جەنگ دا وەری گرتووە. ئەوەش نموونەیەکی ڕۆشنکەرەوەیە لەسەر ئەو تێڕوانینەی کە دەڵێت مرۆڤی ئازاد لەم ڕۆژەی ئێمەدا لە هەلومەرجێکدایە کە ئیرەیی پێ نابرێت، چونکە جگە لە نەتەوە یەکگرتووەکان هیچ پەناگە و حەشارگەیەکی تری نییە، ئەو هەڵوێستە دژوارەش بەرهەمی پەرەسەندنی مێژوویی

دینامیکیەتی هێزە دیموکراسییەکان و تەکنۆلۆژیای پیشەسازی و چەمکەکانی ناسیۆنالیزمە کە پەیوەندییەکانیان بەردەوام لە گۆڕاندایە لە نێوان هاوکاری و بەریەك کەوتندا، ئەو پەیوەندییانەی کە باکگراوندی ئەو قەیرانە پێك دێنن کە بە شێوەیەکی ترسناك خراپ کەڵەکە بووە، بەڵام چوونە قووڵاییەکانی بونیادی ئەو هێزە مێژووییانە ئەوە دەردەخات کە چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە پێشتر ئامادە کراوە، دیموکراسیەت و تەکنۆلۆژیا و ناسیۆنالیزم هەموویان بە ئاڕاستەی پێکەوەگونجان و لێك نزیکبوونەوە دەڕۆن لە ناو نەتەوە یەکگرتووەکاندا. (کون، ١٩٤٢م) بەڵام کەمدەستی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کارایی و پابەندبوونی پێویست بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی لە سیستمی جیهانیدا لە ماوەی دوای جەنگ دا، سەلماندی کە ئەو ڕەوتە بەهۆی تێڕوانینی بۆ ئایندە بە گەشبینیەکی لە ڕادەبەدەرەوە شکست دێنێت، چونکە پشت ئەستوورە بەو بیرۆکە تازەگەرییانەوە کە خۆشیان گیرۆدەی هەمان قەیرانن، بەهۆی گریمانەکردنیان بۆ وێناکردنێك کە پاساودەری چوارچێوە سیاسییەکانی زلهێزەکانە، ئێمە ئەمڕۆ پێویستێکی تەواومان هەیە بۆ دانانی چەندین بنەمای بەهاداری نوێ بۆ سیستمی ئاسایشی بە کۆمەڵ، کە نەتەوە یەکگرتووەکان داوای دەکات و ڕۆڵی لە پاشەکشەدایە لە ژێر فشاری سیستمی دوو جەمسەریدا، کە تا سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم باڵادەست بوو.

لە کاتێکدا ئەو تێڕوانینەی ڕەوتە پارێزگارەکان داوای دەکەن جیاوازی دەبێت لەگەڵ تێڕوانینی گەشبینانە بۆ ئایندە بەرامبەر مۆدێرنیزم، چەندین ڕەوتی تر هەن کە بڕوایان وایە تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی ژیانی سیاسی جیهان، هێشتا هەمان تایبەتمەندین کە سەدەکانی ڕابردوویان پێ دەناسراو لەسەر پەیوەندی دوژمنکارانە لە نێوان ئیستاتیکیەت و دینامیکیەتی فیکری دا جەخت دەکەنەوە (کلارك، ١٩٨٩م: ٧). تێڕوانینەکەی فۆکۆ یاما بۆ ئایندەیەکی گەشبینانە کە لە کتێبی (کۆتایی مێژوو)دا هاتووە، لەگەڵ شیکردنەوەکەی کنتیری (١٩٨٨م) لە بارەی هۆکارەکانی

سەرهەڵدان و داڕوخانی هێزەگەورەکان وەك دوو نموونە کە دەکرێ پشتیان پێ ببەستین لە ڕاڤەکردنی ئەو بۆچوونانەدا کە گیرۆدەی چەندین تەنگژە بوون. تێڕوانینی ئایندەی گەشبینانە هەندێ پێشنیاز پێشکەش دەکات کە باس لە چوارچێوە بەهایی و دەزگاییەکانی سیستمی جیهانیی داهاتوو دەکەن، بەڵام لە خستنەڕووی ئەو هێزە ڕاستەقینانەوە شکست دێنێت کە لە پشت پەردەوە ڕاوەستاون. لە کاتێکدا ڕەوتە پارێزگارە واقعبینەکان شێوازێکی شیکاری زیاتر توند و تۆڵ پێشکەش دەکەن، ئەگەر چی مەبەستیان نییە کۆمەڵەیەك لە ئەخلاقیات و بەهاکان دابنێن لەپێناو دامەزراندنی سیستمێکی جیهانیی نوێ دا، پشت بەستوو بەگریمانەیەك کە دەڵێت ناتوانرێت فۆرمۆلەی ئەو سیستمە بکرێت جگە لە ڕێگای بنیاتنانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە کە دەچێتە ناو دۆخێکی جێگیر لە ژیانی سیاسی جیهانیدا.

دەکرێ فۆرمۆلە گریمانە کراوەکانی پێکهێنانی سیستمێکی نوێی جیهانیی لەبەر ڕۆشنایی چوار قۆناغی خوارەوەدا شیکار بکەین:

**قۆناغی یەکەم: قۆرخکاریی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:**

ئەنجامی ڕاستەوخۆی لێك هەڵوەشانەوەی سیستمی دووجەمسەری ئەوەبوو کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تاك بووەوە بۆ قۆرخکردنی سیاسەتە نێودەوڵەتییەکان، پەراوێزبوونی جەمسەری شکستخواردوو، ڕێگای لە بەردەم ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کردەوە بۆ هەڵسان بە چەندین مانۆڕی بایەخدار بەشێوەیەك بواری پێدا بۆ ڕیزبەندیکردنی سیاسەتە دەرەکییەکانی، بەڵگە لەسەر ئەوە دەستێوەردانی ڕاستەخۆبوو لە (پەنەما) و ژێربەژێریش لە (کۆڵۆمبیا و نیکاراگوا) لە ساڵی ١٩٨٩دا، جەنگی کەنداویش هات بۆ کۆتاییهێنان بە ژمارە دابەزینی ئەو قۆناغە، دوای ئەوەی ڕۆشن بووەوە کە ئەمریکا دەیەوێت چەترێکی قۆرخکاریی دابمەزرێنێت بۆ کۆنترۆڵکردنی کاروباری نێودەوڵەتی بە چڕکردنەوەی هێزە بنەڕەتییەکان و بەسیجکردنی سیستمەکانی بەرگریکردنی هاوبەش، لە

تەنیشت ئەو بڕیارانەوە کە لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە وەرگیران و بە زۆر بە شێوەیەکی کارا جێبەجێ کران لە کاتی ئەو قەیرانەدا لە ئەنجامی دامەزراندنی چەترێکی قۆرخکاری ئەمریکییەوە.

بەڵام سیاسەتمەدارانی ئەمریکایی وادەبینن کە ئەم چەترە هەندێ خاڵی نێگەتیڤی تێکەڵ بووە لەگەڵ هەموو لایەنە ئیجابیەکانیدا، بەڵام خاڵە ئیجابییەکانی بە تەواوی ئاشکران و لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت دەکرێنەوە:

١ـ توانای جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سیاسەتی دەرەوە و بەجێهێنانی ئامانجە ستراتیژی و تاکتیکییەکان.

٢ـ ئاڕاستەکردنی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و کیشوەربەزێنەکان بۆ پاساودانی سیاسەتە ناوخۆییەکان. ٣ـ گرتنەدەستی دەستپێشخەری لە پرۆسەی دووبارە داڕشتنەوەی سیستمی جیهانیی دا.

٤ـ ڕیزکردنی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لە ژێر سەقفی کۆنترۆڵی ئەمریکی دا بەتەنها.

٥ـ کۆنترۆڵکردنی چارەنووسی ناوەندەکانی هێزە ئەلتەرناتیڤەکان کە دەگونجێ لە دوورمەودا گۆڕانکاری لە سەنتەری شارستانێتییەکەدا بکەن.

بەڵام خاڵە سەلبییەکانی ئەو باڵادەستییە کورت دەکرێنەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا:

١ـ دروستکردنی ئاڕاستەیەك بەرەو زیادکردنی بارگرانی ئابووری لەسەرشانی ئابووری ئەمریکی لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنانی خاڵە ئیجابییەکانی کە پێشتر باسکران لە لایەن هەیمەنەی ئەمریکیەوە.

٢ـ زیادبوونی دوژمنایەتی دژ بە سیاسەتەکانی ئەمریکا بە تایبەتی لە قەیرانە هەرێمایەتییەکاندا، چونکە لەوانەیە گازاندە بخرێتە سەر سیاسەتەکانی ئەمریکا لە هەردوو لایەنە ململانێکارەکەوە، کە وای دادەنێن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

دەیتوانی ناکۆکی نێوانیان چارەسەری بکات بەشێوەیەك بەرژەوەندیی هەردوو لایەن دەستەبەرببێت.

٣- نەبوونی هێزی دوژمنکاری دژ بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێگر دەبێت لە بەردەم پاساودانی هەندێ لە سیاسەتەکانی، چونکە بوونی مەترسیی یارمەتی ئەمریکا دەدات لەسەر گەمەکردن بە ڕای گشتی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی.

ئامانجە تاکتیکییەکانی تری زلهێزەکان دەتوانرێت کورت بکرێنەوە لە چوارچێوەی ئەو قۆناغەدا بەوەی کە: هەوڵدانی یەکێتی سۆڤیەت بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی کاروباری ناوخۆیی و زیادکردنی توانای مانۆڕکردن لەسەر گۆڕەپانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە ڕێگای پێشنیازکردنی وێناکردنێکی ئاشتییانە – ئەو وێناکردنەی کە دوای داگیرکردنی ئەفغانستان لە لایەن سۆڤیەتەوە، ئەویش داڕووخا – گرنگترین ئامانج لە پشت ئەم گۆڕانە ڕیشەییە لە سیاسەتی دەرەوەی (گۆرباچۆڤ)دا، بریتی بوو لە هاوکاتکردن لە نێوان هێزە ئابوورییەکان و بەرپرسیارێتییە نێودەوڵەتییەکانی سەرشانی یەکێتی سۆڤیەت، لەگەڵ یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی پشت نیگەرانیبوونی داڕێژەرانی سیاسەتەکانی سۆڤیەت لەو قۆناغەدا، کە خۆی لە چۆنێتی پاراستنی داهاتە ئابوورییەکاندا دەنواند، بۆ ئەوەی ڕۆڵی لاوازبوونی یەکێتی سۆڤیەت لەسەر ساحەی جیهانیی کاری خراپی تێ نەکات، وەك پێشەکییەك بۆ دووبارە زیندووکردنەوەی ئابووری نەتەوەیی بەرتەسك بووەوەی، لە هەمان کاتدا سۆڤیەتییەکان هەوڵیان ئەدا بۆ کێشانی وێنەیەکی نوێی وڵاتەکەیان لە بەردەم ڕۆژئاوادا بە مەبەستی ڕاکێشانی سەرمایە.

بەڵام گرنگترین ئاستەنگ کە لەو قۆناغەدا دژ بە سیاسەتی سۆڤیەتی وەستایەوە، پەیوەندییە ناوخۆییەکان و ئەو بارگرژییانە بوون کە لە ئەنجامی پرۆسەی جێگیرکردنی دیموکراسییەوە پەیدابوون، ئەو بارگرژییانە ڕێگربوون لە ڕێگای بەدیهێنانی ئامانجەکانی سیاسەتی سۆڤیەتیدا و ڕوسیاش دواتر هەمان بۆچوونەکانی سیاسەتی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەتی پێشووی بە میرات بۆ مایەوە،

هەروەك كێشە و گرفتارییەکانیشی بە میرات بۆ مایەوە. ئەڵمانیاش بەو سیفەتەی کە ڕەمزێکی میحوەرییە لە ڕەمزەکانی سەنتەری شارستانێتی ئەوروپی بە ئاڕاستە و بۆچوونە کلاسیکییە نوێیەکانیەوە، لە هەوڵی ئەوەدا بوو یەکخستنی دووکەرتەکەی خۆی لەو قۆناغەدا تەواو بکات، نەك تەنها لە لایەنی یاساییەوە، بەڵکو لە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فیکرییشەوە. بەم شێوەیە دووبارە داڕشتنەوەی سیستمی جیهانیی بوو بە نەگۆڕێك لە نەگۆڕەکانی سیاسەتی ئەڵمانی، چونکە بەرژەوەندیی لەوەدابوو کە ئەو پڕۆسەیەی لەسەر دوورمەودا و مامناوەندی تەواو بکرێت، بەلانی کەم دوای دەرکەوتنی ڕەنگدانەوەکانی هێزە ئابوورییەکانی ئەڵمانیا لەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان کە ژێرخانێکی زیاتر گونجاوی بۆ سیاسەتی دەرەوەی ئەڵمانیا دەستەبەرکردبوو، بەریتانیاش بەردەوام بوو لە لایەنگیریکردنی خۆی بۆ سیاسەتی ئەمریکی لە هەوڵدانێك دا بۆ بەهێزکردنی ڕۆڵی خۆی وەك کەناڵێکی پەیوەست لە نێوان سەنتەری ئەتڵەسی و سەنتەری ئەوروپیدا.

لە لایەکی ترەوە فەرەنسا هەوڵی دا بۆ پەرەپێدانی سیاسەتێکی دەرەوەی فرەڕەهەند بۆ پشتگیریکردنی مەرکەزی خۆی لە ئەوروپادا بەو سیفەتەی کە تاکە دەوڵەتی ئەوروپییە کورسییەکی هەمیشەیی لە ئەنجومەنی ئاسایش دا هەیە، هەروەها بەهۆی ئەو کەلەپووری ڕەسەنەی وەك نیشتمانێك کە سەرچاوەی ئەوبەها ئەوروپیانەیە کە گوڕوتینی شۆڕشی فەرەنسی بوو. فەرەنساش پێویستی بەو سیاسەتە فرەڕەهەندەییە هەبوو بەهۆی تۆڕی پەیوەندییەکانیەوە. لەگەڵ هەریەك لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەڵمانیادا، سیاسەتمەدارانی فەرەنسایی پێویستییەکی زۆریان هەبوو بە توانا ئابوورییەکانی ئەڵمانیا بە مەبەستی دامەزراندنی سەنتەرێکی شارستانێتی نوێ لە ئەوروپا، کە فەرەنسا تیایدا پێگەی سەرکردایەتی سیاسی بۆخۆی دابین بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا تێبینی دەکەین کە فەرەنسا بەنیازبوو خۆی بخاتە ژێر چەتری ئاسایشی ئەمریکی لە بەرامبەر زەبروزەنگی هێزی ڕوو لە زیادبوونی ئەڵمانیاوە. ژاپۆنیش هەمان ڕێچکەی ئەڵمانیای

گرتەبەر بە دواخستنی دووبارە دارشتنەوەی سیستمی جیهانیی، تا بتوانێت بەرهەمی ژیانەوە ئابوورییەکەی و رەنگدانەوەکانی لەسەر پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان بچنێتەوە. ئەو لایەنانە هەموویان دەیانزانی کە رەهەندی زۆرگرنگ و هەستیاری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە رادەی کارتێکردنی ئابووری نەتەوەیی دایە لەسەر سیستمی ئابووری جیهانیی.

سەرباری ئەوەی پێشەوە، قەیرانی کەنداویش بووە پەرەخولاوەی بەدەوری خۆردا بۆ ئامانجە تاکتیکییەکانی تایبەت بە زلهێزەکان لە چوارچێوەی هەیمەنەی ئەمریکییدا، ئەوەبوو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانی زۆر بە وردی گەمە بە رێکخراوە سیاسییە جیهانییەکان بکات بۆ ئەوەی رۆڵی باڵادەستی خۆی لەسەر ساحەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بۆ جیهان دەربخات، لە هەمانکاتیشدا سیاسەتی دوژمنکارانەی سەرۆکی عێراقی (سەددام حسێن)ی بەکارهێنا بۆ پاساودان بە دووبارە دارشتنەوەی باروردۆخی جیهانیی بە شێوەیەك قسەی هەوەڵ و دوایی هەمیشە بۆ سەنتەری ئەتڵەسیی بێت بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەوەوە دەرکەوت کە ئەمریکا دەیویست پایەکانی سیستمی جیهانیی نوێ مەحکەم بکات، پێش ئەوەی نیشانەکانی گۆرانی سەنتەری شارستانی لە ئاسۆدا بەدیاربکەون. هەروەك کۆنترۆڵی خۆی بەسەر چاوگە نەوتییەکاندا مسۆگەر کرد کە هێزە ئابوورییەکانی دەوڵەتانی وەك ئەڵمانیا و ژاپۆن پشتی پێ دەبەستن، دوای ئەوەش جێگیرکردنی پایەکانی چەترە قۆرخکارییەکەی خۆی لەسەر ئاستی جیهانیی زامنکرد لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە دابەشکردنی کۆلۆبارە ئابوورییەکانی جەنگی کەنداوی بەسەر زلهێزەکان دا زامنکرد، بەوەش زاڵبوو بەسەر یەکێك لە گرنگترین خاڵە لاوازەکان کە هەرەشەبوو لەسەر چەترە قۆرخکارییەکەی کە بە هۆیەوە کۆنترۆڵی دەکرد بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توانی وێنای سەددام حسێن و هیتلەر و ستالین پێکەوە پەیوەست بکات و بەوەش لایەنگری رای گشتی بۆلای خۆی زامن بکات بە مەبەستی

دەستنیشانکردنی ئامانجە نێودەوڵەتییە دیاریکراوەکان، بۆ زاڵبوون بەسەر هەر خاڵێکی تری سەلبی دا کە بە هۆی بۆشایی داڕووخانی یەکێتی سۆڤیەتەوە بەجێ مابێت بۆ کۆتاییهێنان بە سیسەتمی دووجەمسەری.

لە ئاست هەموو ئەو پەرەسەندنانەدا یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو هیچ جووڵەی لێوە نەهات، بەڵکو پشتگیری بڕیارەکانی ئەمریکای دەکرد، ئەگەرچی لە سەرەتاوە خوازیاربوو قەیرانەکە بە ڕێگای ئاشتییانە چارەسەر بکرێت، پرۆژە بڕیارێکیشی بۆ پلانی ئاشتی لە پێش هەڵگیرسانی شەڕ پێشکەش کرد. ئەڵمانیاش حەماسەتی لە یەکێتی سۆڤیەت زیاتر نەبوو بۆ بەرپاکردنی جەنگی کەنداو، چونکە دامەزراوەکانی دروستکردنی بڕیاری سیاسی لە ئەڵمانیا دوودڵ بوون لە بڕیاردان و ئارەزوویان نەبوو پەیوەندییەکیان هەبێ بە سیستمێکی جیهانییەوە کە هێشتا پێنەگەیشتووەو لەوانەشە ڕێگر بێت لە بەردەم ئامادەبوونێکی ڕاستەقینەی دەسەڵاتی ئەڵمانیا لە سیستمە جیهانییەکەدا، لەبەر ئەوەی ئەڵمانیا تاکە دەوڵەتی ڕۆژ ئاوایی بوو کە هیچ شارەزابوونێکی ئیستیعمارییانەی نەبوو لە ناوچەی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست دا، ویستی هاوسۆزی گەلانی ناوچەکە لەو ماوەیەدا بەکار بهێنێت بۆ گۆڕینی سیاسەتە داخراوەکانی لە ناوخۆی ئەورووپادا بۆ سیاسەتێکی دەرەوەی هەمەلایەنە.

بەڵام بەریتانیا بەردەوام بوو لە پشتیوانیکردنی بێ مەرجی خۆی بۆ ئەمریکا لە کاتی پرۆسە سەربازییەکانی لە ناوچەکەدا، لە هەوڵێکدا بۆ کەشفکردنی گەمەی ئیستیعماری تازە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە ژێر چەتری هەیمەنەی ئەمریکی دا. سیاسەتی فەرەنسای فرەڕەهەندیش لە میانەی جەنگی کەنداودا نیشانەکانی بە تەواوی ڕۆشن بوون، هەروەها هەوڵەکانی سەرۆکی فەرەنسی (میتران) بۆ گەیشتن بەڕێگاچارەیەکی ئاشتییانە پێش هەڵگیرسانی شەڕ هەر لەو میانەدا بوو، لەگەڵ هەبوونی گومان بە دەوری هەوڵەکانی فەرەنسادا، تەنانەت بۆ ئەمریکییەکانیش. بەڵام دوای هەڵگیرسانی جەنگ نیازەکانی فەرەنسا بۆ هەموو لایەك ڕۆشن بووەوە، کاتێك هەوڵی دا ئەوە بگەیەنێت بە هەموو لایەك کە زیاتر لە هەموو دەوڵەتە

هاوپەیمانەکان چالاکتربووە، بۆ ئەوەی ڕۆڵێکی گەورەتری هەبێ لە دانوستانەکانی دوای جەنگ بۆ دیاریکردنی ئایندەی ناوچەکە.

**قۆناغی دووەم: سەرهەڵدانی هێزی نوێ لە ئەورووپا و ئاسیا:**

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیی دووجەمسەرێتی گرنگترین تایبەتمەندی سیستمی جیهانیی بوو، هەردوو جەمسەرە ڕکابەرەکە لە پێشەنگی هەموو هێزە ڕاستەقینەکانی ترەوە بوون کە هەڵدەسان بە گێڕانی ڕۆڵی دووەمین بە بەراورد لەگەڵ دوو هێزە زەبەلاحەکەدا، هەموو ناکۆکییە مێژوویی و کولتووری و سیاسی و ئابوورییەکان تێکەڵ بە سیستمی هەردوو جەمسەرەکە بوو، لە پشت ڕووکاری ئایدۆلۆژیا و پاساوی کردەیی پڕوپوچ دا، کە هەردوو جەمسەرە ڕکابەرەکە پشتیوانییان لێ دەکرد، حاڵەتە ناجۆرەکەی (ئەڵمانی - یەمەنی) نموونەیەکی ڕاست و ڕەوانی ئەو ڕواڵەتە ساختەییە پێشکەش دەکات، ئەوەبوو کۆماری یەمەنی باشوور بەو پێیەی ڕژێمێکی شموولی سۆشیالیستی خاوەن بونیادێکی ئابووری و سیاسی خێڵەکی بوو، هەڵسا بە پێکهێنانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆهەڵاتی دا، لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازییە کولتووری و ئابووری و سیاسییەی نێوانیان، لەکاتێکدا ئەڵمانیای ڕۆژئاوایی هاوپەیمانی بەستبوو لەگەڵ کۆماری یەمەنی باکووردا لە بەرەکەی بەرامبەرەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەو هاوپەیمانێتییانە ناکۆك بوون لەگەڵ ئایدۆلۆژیای سۆشیالیزم و پراگماتیزمی سەرمایەدارییدا، کەچی ئەو هەلومەرجە سەپێنراوەی سیستمی دووجەمسەری هێنابوویە کایەوە، ئەو دەوڵەتانەی ناچارکردبوو ڕێبازێکی لە بارەیەوە بگرنەبەر. هەموو لایەکیش بە ناچاری ملکەچی ئەو هاوپەیمانێتیانە بوون وەك دیاردەیەکی نامۆ لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، داڕووخانی بلۆکی سۆشیالیزمیش هات بۆ ئەوەی بنەما ئایدۆلۆژیاکانی بوونیادی دووجەمسەری لێك هەڵوەشێنێتەوە ئیتر لەوکاتەوە هێزە ڕاستەقینەکان دەستیانکرد بە چوونەسەر شانۆی سیاسەتی جیهانیی بە شێوەیەکی کارا بەپێی یاسایەکی نە نووسراوی هاوسەنگی بەهێز، خاڵە پێك ناکۆکەکانی نێوان ڕێبازە فیکرییەکانیش

دەستیانکرد بە هاتنە سەر ڕوو، لەوانە بۆ نموونە ململانێی نێوان تایبەتمەندیی ئەتنی و یەکێتیی نیشتیمانی، نەتەوەیی و جیهانیی جیابوونەوە و یەکبوون، بە تایبەت لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و کۆمارە ئاسیاییەکانی ناو یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا، ئەوەش گومانی زۆری هێنایەکایەوە بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، ئەوەبوو سێ ناوچەی زۆر هەستیار لە ناوچەی (ئەورۆ ـ ئاسیایی) لەو قۆناغەدا بەدەرکەتن، ئەوانەش نیوەدوورگەی بولقان و کۆمارەکانی قەفقاسیا و ناوچەی ئاسیای ناوەڕاست بوون. هەروەك کەشوهەوایەکی دەروونی بارگاویکراو بە سۆز پەیدابوو لە بارەی فراوانکردنی بازاڕی ئەوروپی و هەوڵە بەردەوامەکانیش بۆ گرێدانی چەندین کۆنگرە و کۆبوونەوەی جۆربەجۆر بە مەبەستی دامەزراندنی نیشتمانێکی ئەوروپی یەکگرتوو، ئەوانەش بوونە هۆی فەرامۆشکردنی ئەو گومانانە، یان کەمکردنەوەی مەترسییەکانی تا ڕادەیەکی زۆر، هەر لەسەر ئەو شێوەیەی کە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوویدا، ئەوروپای ڕۆژهەڵاتیش ئاشتییەکی درێژخایەنی بە خۆیەوە نەدی دوای بەرتەسکبوونەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە سیستمێکی جیهانیی تەواو جیاوازی دامەزراندبوو، پشت بەستوو بە سیستمێکی چەند میللەتی (Millet System)، بەڵام ئەو سیستمە لەسەردەستی بزاڤە نەتەوەییەکاندا تێکدرا، دوای سەرهەڵدانی سیستمی (دەوڵەتی نەتەوە) وەك بنەمایەك بۆ سیستمێکی جیهانیی ئەلتەرناتیڤ. هەروەها بیرۆکەی بە بەلقەنەکردن – دابەشکردنی ناوچەیەك بۆ چەند دەوڵەتێکی بچکۆلەی پێك ناکۆك– جێگیرکرا بە چەمکە سیاسییە پەرتکەرەکانیەوە، بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئاڕاستەی جیابوونەوەی ڕەگەزی لەو ناوچەیەی ئەوروپادا، جگە لەوەش تائیفیەت و ڕەگەزایەتی کە لەو ناوچەیەدا تەشەنەی کردبوو لە ساڵانی دەستپێکی سەدەی بیستەمدا هۆکارێك بوو بۆ هەڵگیرسانی جەنگێکی جیهانیی وێرانکەر.

ئەمڕۆ لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتیدا سێ ناسنامەی جیاجیا لە ململانێدان، کە ئەمانەن: ناسنامەی مێژوویی/ نەژادی، ناسنامەی هەرێمایەتی/ نەتەوەیی کە

دەرهاویشتەی ڕێککەوتننامەکانی دوای جەنگی جیهانیی دووەمە، لەگەڵ ناسنامەیەکی ئایندەیی/ گەشبینی بۆ ناسنامەیەکی ئەوروپایی یەکگرتوو. وێنەی کێشەکانی نێوان ئەو ناسنامانە لە زۆربەی زۆری دەوڵەتەکانی ناوچەکەدا بەدیار دەکەوێت، جگە لە یوگۆسلاڤیای پێشوو کە حاڵەتێکی نموونەیی پێشکەشکردووە شایانی دیراسەکردنە، قەیرانی یوگۆسلاڤیای پێشوو - بەو سیفەتەی کە هەستیارترین هەرێمەکانە لە پەیوەندییدا بەکارتێکردنی سیاسیی ئەو ناسنامە - بەڵگەیە لەسەر قۆناغی دووەم لە قۆناغەکانی دروستبوونی سیستەمی جیهانیی نوێ، ناسنامە ئایینییەکان ئەرسۆدۆکسی، یان کاسۆلیکی، یان ئیسلامیی، ناسنامە نەژادییەکانیش وەك: سربیا و کرواتیا و سلۆڤینیا و ئەلبانیا و بۆسنیایا بەو سیفەتەی کە پێکهاتەی واقعی ئەو ناوچەیەن، هەموویان هۆکار بوون لە تێکدانی بنەماکانی ئەو یەکێتییە سیاسییە دەستکردەی کە لە ژێر پەردەکانی چەتری سیستەمی دوو جەمسەری دا جێگیربووبوو، ئەوەبوو سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادی لە بۆسنیا دوایی هێنا بە خەونە گەشبینیەکانی فۆکۆ یاما لە تیۆری کۆتاییدا و پەردەی لادا لە ڕووی تێکچوونە نەژادییەکان و قەیرانەکانی کە شارستانێتی ڕۆژئاوایی لە سەردەمی دوای جەنگی بۆسنیادا پێیدا تێپەڕیکرد.

نیشاندەری ڕوون لەسەر گەڕانەوەی دەرکەوتنی هێزە سیاسییە ڕاستەقینەکان لە (بولقان) ئەو ئامادەباشییە سیاسییە بوو کە پشتی بە ناسنامە مێژووییە/ نەژادییەکان بەستبوو، کاریگەریی هەبوو لەسەر سەقامگیری ناوخۆیی و لەسەر پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان لەو ناوچەیەدا، ئەو نیشاندەرە دەستی بەدەرکەوتن کرد لە شێوەی ناکۆکی نەژادی دا لە نێوان دەوڵەتە دراوسێکاندا، بە تایبەتی لە نێوان ڕۆمانیا و مەجەڕ، تورکیا و بولگاریا، یەکێتی سۆڤیەت و ڕۆمانیا، هەروەها لە نێوان صربیا و دەوڵەتەکانی دراوسێی دا، هەروەك لە نێوان ئەلبانیا و یۆنان و دوایەمین لە نێوان تورکیا و یۆنان دا، هەتا هەڵگیرسانی قەیرانی بۆسنیا ئەو ناکۆکییانە بە ئاڕاستەیەکدا دەبران بەپێی ئەو گۆڕانکارییانەی لە کاروباری ناوخۆی

دەوڵەتانی ناوچەکەدا ڕوویان دەدا، ئەو ئیشکالیەتەش کە ڕووبەڕووی نوخبەی سیاسیی ئەو دەوڵەتانە دەبووەوە بریتیی بوو لە بەدیهێنانی داخوازییەکانی کەمینەکان، کە پەیوەستە بە ناسنامە مێژوویی/ نەژادییەکانیانەوە، بەبێ تێکدانی ناسنامە نەتەوەیی/ هەرێمییەکانیان کە وەك لقوپۆپێکی سیستمی دووجەمسەری درووست بووبوون، بەڵام ئەو ئیشکالیاتە دەستیکرد بە خراپ کەڵەکەبوون، کاتێك هێزە گەورەکان ویستیان ئەو ناسنامە پێك ناکۆکانە بەکار بهێنن بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان لە چوارچێوەی هاوسەنگی هێزەکاندا.

ئەوەش تێبینی دەکرێت کە ئەو پەرەسەندنانەی ناوچەی بولقان بە خۆیەوە بینی، تاڕادەیەکی زۆر لەوە دەچێت کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕوویدا، کاتێك زلهێزەکان لەناو سیستمێکی هاوسەنگی هێزەکاندا زۆرانبازییان دەکرد بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی هەمان ناوچە، ئەنجامی ئەوەش بەرپابوونی جەنگی جیهانیی بوو، بەڵام تاقە جیاوازی لە نێوان ئەو دوو قۆناغەدا لەو ئاڕاستەی تەواوکارییەدایە کە لە ئەوروپا پەیدابوو، لێرەوە تروسکایی هیوا لەبەردەم نوخبەی سیاسیی ئەو کۆمەڵگا فرەنەژادانەدا بەدیار دەکەوێت بۆ چاککردنەوەی ناکۆکییەکانی نێوانیان لەسەر بنەمای ئینتیمابوون بۆ پێکهاتەیەکی نەتەوەیی کە پێکهاتە نەژادییەکان و ئەتنیە بەرتەسکەکان تێپەڕێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێت ئەو هیوایە لە مەدای کورتدا بەدیبهێنرێت و هۆکارەکەشی ئەو ئاستەنگانەیە کە ڕووبەڕووی دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی دەبنەوە لە فراوانکردنی بازنەی یەکێتی ئەوروپا بۆ ئەوەی هەموو دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات بگرێتەوە، ئەستەمیشە ئەو ئارەزووە فراوانخوازییە لە ماوەی دوودەیە یان سێ دەیەی داهاتوودا بەدی بهێنرێت، لە ئەنجامی ئەو جیاوازییە هەیکەلی و سیاسیی و ئابوورییانەدا کە هەڕەشەن تەنانەت لەسەر سەقامگیریی ناوخۆیی لە چوارچێوەی سیستمی ئەوروپی خۆیدا، ئەگەرچی هەندێ لەو دەوڵەتانەی وەك مەجەڕ و چیکۆسلۆفاکیای (جاران) ئەو مەسەلانە لە گرنگترین ئەولەویاتی خۆیان دادەنێن، قەتڵ و عامەکانی پاکتاوی نەژادی کە

دووچاری بۆسنه و هەرسك بووەوە سەلماندی کە ئەو دروشمە گەشبینانەی بەها ئەوروپییەکان هیچ واقیعێکی هەستپێکراوی نییە بۆ چارەسەرکردنی قەیرانێك کە لەوانەیە لە نێوان ئەو هێزانەی کە باکگراوندی مێژوویی ناچوونیەکیان هەبێ.

سەرەنجام سیستمی (دەوڵەتی نەتەوە) لە ئەوروپا ڕووبەڕووی دوو تەحەدی گرنگ دەبێتەوە کە لە دوو ئاڕاستەی جیاوازەوە دێن، مەبەست لێرەدا ئەو چەمکە نەتەوەییانەن کە لە ئەوروپای ڕۆژئاواوە دێن، ئەوەش وەك هەوڵێك دەردەکەوێت بۆ گواستنەوەی سەنتەری شارستانیەت بۆ ئەوروپا، دووەمیش خۆی لە ناسیۆنالیزمی تازەی جیاخوازییدا دەنوێنێت کە لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتەوە دێت، کە هەڕەشەن لەسەر ئاڕاستە نەتەوەییە هەرێمایەتییەکان. بەهەرحاڵ قسەی یەکلاکەرەوە لە ڕوودانی پڕۆسەیەکی دینامیکیدا سەردەردێنێت، کە ئایا ئاڕاستەی فراوانخوازی ئەوروپی لە توانایدا دەبێت چارەسەر بۆ ئیشکالیەتەکانی ناسنامە لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا پێشکەش بکات لە میانەی دامەزراندنی سەنتەرێکی شارستانی یەکگرتوودا؟ یان ئەوەتا ئەو بۆشاییە سیاسییە ئابوورییەی لە دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدایە چەندین کێشە و دابەشبوون لە نێوان هێزە بنەڕەتییەکانی ناو ئەوروپای ڕۆژئاوادا دروست دەکات؟ ئەو هێزانە لە توانایاندا نییە هەڵسن بە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بە شێوەیەك لەوانەیە کاریگەری سەلبی هەبێت لەسەر بزاڤی تەواوخوازی لە چوارچێوەی یەکێتی ئەوروپادا، بەڵام دەزگا ئایینییەکان بە تایبەتی ڤاتیکان، کە ژیانی خۆی گونجاندووە لەگەڵ جیهاندا لە دوای ئەنجامدانی پڕۆسەکانی گۆڕانکاری بۆ دابینکردنی ئاوازێك بۆ چارەسەرکردنی قەیرانە ژیارییەکە، ڕەنگە ڕۆڵی لە ئەوروپادا گەورەتر بێت وەك فاکتەری میانگیر لە نێوان ئاڕاستە و بۆچوونە ناکۆکەکاندا، سوربوونی (پاپ)یش لە گوتارەکەیدا لەبارەی یەکێتی ئەوروپاوەو سوودوەرگرتنی لەهەر بۆنەیەك بۆ وروژاندنی مەسەلەکە، هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەرگرنگی پەیامی کڵێسا بەو سیفەتەی کە ئەو پەیوەندییە ڕۆحیەیە یەکێتی ئەوروپا بەهێز دەکات و هەروەك نەرمی دبلۆماسیەت و ئابووری هێزە

سیاسییە ئەوروپییەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا ئاڕاستەکانی و بۆچوونە بەریەککەوتووەکانی ناو کیشوەرە کۆنەکە دیاری دەکەن.

ناسیۆنالیزمی نوێ کە مەیلێکی جوداخوازی هەبوو - کە دەرەنجامی دابەشکردنی بەجێماوەکانی شەڕی ساردبوو - بووە هۆی هەڵگیرسانی ناکۆکی توندوتیژ لە نێوان کۆمارە ئاسیاییەکانی سەر بە یەکێتی سۆڤیەتی جاران، لە پێش هەموویانەوە ناوچەی قەفقاسیا کە هەستیارییەکەی لە ناوچەی نیوە دورگەی بولقان کەمتر نییە لە ڕوانگەی فرەنەژادییەوە، ڕاستە کە بارودۆخەکە تا ڕادەیەك لە ناوچەی ئاسیای ناوەڕاست جیاوازی هەیە لە ڕوانگەی نەژادی و سیاسییەوە، بەڵام کێشەی کۆمەڵگەکانی ناوچەی ئاسیای ناوەڕاست پەیوەست نییە بە هەوڵەکانی دووبارە پێکهێنانەوەی ناسنامەی نەژادی و بەس، بەڵکو لەوەش تێدەپەڕێت تا دەگاتە قەیرانی داڕشتنەوەی یەکێتی ئینتیمابوونێکی باڵاتر، هۆکاری ئەوەش ئەوەیە کە هاووڵاتییانی کۆمارەکانی وەك: ئۆزبەکستان، تورکمانستان، کازاخستان و قیرغیزستان کە پێکەوە هاوبەشن لە هەمان کولتوور و ئایین وبنەماکانی زمانەوانیدا، ئەو خەسڵەتە هاوبەشانە لەوانەیە یارمەتیان بدات بۆ زاڵبوون بەسەر ناسنامە دووەمینەکاندا کە کاتی خۆی سەرکردەکانی سەر بە سۆڤیەت ئاگریان بۆ خۆش دەکرد، بە مەبەستی هێنانە کایەی حاڵەتێکی دابەشبوون و پێکەوەناکۆك لە ناوچەکەدا، بۆ ڕێگرتن لە گەیشتن بە بنکەیەکی هاوبەش کە بتوانێت بەرەنگاری فەرهەنگی سۆشیالیستی شۆڕشگێڕی ببێتەوە، ناوچەی قەفقاسیا حاڵەتی سەقامگیری ڕاستەقینە نابینێت ئەگەر گۆڕانکاری دیموکراسییانە لە ڕژێمە سیاسییەکانی دەوڵەتەکانیدا ئەنجام نەدرێت، هەر ئەو گۆڕانکارییەش دەتوانێت دەرفەتی ڕاستەقینەی بۆ دابین بکات بۆ فۆرمۆلەکردنی ئینتیمایەکی باڵاتر لە ناسنامەی ناوچەیی بۆ هەر یەکەیان، کە یارمەتیان بدات بۆ بیناکردنی کۆمەڵگەکانیان بە شێوەیەکی زیاتر توندوتۆڵتر و مەحکەمتر.

وا دەردەکەوێت کە سەرهەڵدانی هێزە سیاسییە ڕاستەقینەکان لەو قۆناغەی دووەمدا لە قۆناغەکانی پێکهاتنی سیستمی جیهانیی نوێ، بە شێوەیەکی ئیجابی کاری کردۆتە سەر سەنتەری ئەتڵەسی، چونکە دەتوانرێت بگەنە ڕێککەوتنی سیاسی بۆ گرنگترین کێشە دوو قۆڵییەکان بەهۆی زەبر و زەنگی میکانیزمی دوو جەمسەرییەوە کە لە دوای جەنگی (جیهانیی دووەم)ەوە لەو ناوچەیەدا هاتە گۆڕێ، بە تایبەتی لە ناوچەی هیندی چینیدا. لەوانەشە هەڵوەشانەوەی میراتی سیستمی دووجەمسەری یارمەتیدەربێت لەسەر هاندانی پرۆسەی یەکخستنی هەردوو کۆریاکە، هەروەك هاندەربێت لە هەمانکاتدا لەسەر پڕۆسەی تەواوخوازی لە نێوان چین و هۆنگ کۆنگ و تایواندا، بە هاوتەریبی لەگەڵ پڕۆسەی جێگیرکردنی دیموکراسیەت لە چین و پڕۆسەی کەمکردنەوەی بارگرژی سەربازی سیاسی لە ناوچەی هیندی – چینی دا. چاوەڕوانیش دەکرا کە ئەوپەرەسەندنانە یارمەتی بدات بۆ دەرکەوتنی کاریگەری هێزە ئابوورییەکانی ئۆقیانووسی باسفیکی لەسەر گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتی، هەروەك یارمەتیدەر بێت بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ململانێ هەرێمی و نەتەوەییە ناوخۆییەکان، بە تایبەتی کێشە و ململانێکانی نێوان ژاپۆن و چین و کۆریا.

کەواتە ئاستەنگی پەیوەندی نێوان جیهانگیری و هەرێمایەتی و نەتەوایەتی نوێی خاوەن ئاڕاستەی جودا خوازی لە ناوچە کێشەدارەکانی ئەورۆئاسیاییدا لە قۆناغی دووەمی دروستبوونی سیتەمی نێودەوڵەتی نوێدا بەردەوام دەبێت، واش چاوەڕوان دەکرێ کە بۆ ماوەی داهاتوو بەردەوام بێت، ئەگەرچی بە دینامیکیەتێکی کەمتر و سەقامگیرتر بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی ئەوروپا لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە بینی.

**قۆناغی سێیەم: بنیاتنانی سیستمی هاوسەنگیی هێزەکان:**

پەیدابوونی چەند هێزێکی ڕاستەقینەی نوێ لەسەر شانۆی سیاسەتی نێودەوڵەتی بۆی هەیە سیستمی جیهانیی ڕاوەستاو لەسەر دوو جەمسەرێتی بگۆڕێت

بۆ سیستمێکی هاوسەنگی هێزەکان، ئەگەرچی ئەوە ئەنجامدانی مانۆڕێکی دبلۆماسییانەی زیاتر دینامیکی و نەرم دەخوازێت. سیستمی دوو جەمسەرێتی لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی دوو زلهێزە زەبەلاحەکە لە هێزە گەورەکانی تر ڕاوەستابوو، ئەو پێویستییەش بوو بە هۆی سنووردارکردنی هەوڵە دبلۆماسییەکانی دەوڵەتە گەورەکان، بۆ هەریەك لە دوو دەوڵەتە زلهێزەکەش پێویست بوو لەسەری کە چوارچێوەی سیاسەتەکانی بەپێی جموجوڵە گریمانکراوەکانی زلهێزەکەی بەرامبەری دیاری بکات، هەروەك ئەو پێویستییە کاریگەری هەبوو لە ئاڕاستەکردنی (خیارات)ی ئایدۆلۆژییانەیدا و ئەلتەرناتیڤە دبلۆماسی و سەربازییەکانی دەوڵەتەکاریگەرەکانی گۆڕەپانی نێودەوڵەتی پێوەند کردبوو، بەڵام داڕشتنەوەی سیستمێکی نوێی هاوسەنگی هێزەکانی بێگومان یارمەتیدەر دەبوو بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەلتەرناتیڤەکان، بەڵکو زیاتر لەوەش دەوڵەمەندکردنی (خیارات)ی هێزە ئیقلیمیەکان و دەوڵەتە بچووکەکانیش.

بەڵام ئەوەی کە تایبەتمەندێتی و تاکێتی دەبەخشی بە سیستمی هاوسەنگی هێزەکان و لە نموونە مێژووییە کۆنەکانی سیستمەکانی هاوسەنگی هێزەکانی جیادەکردەوە، لەوانەش ئەو سیستمەی کە لە دوای کۆنگرەی (ڤیەننا)ی ساڵی ١٨١٥دا درووست بوو، ئەوەیە کە بە هاوتەریبی لەگەڵ هەوڵەکانی تەواوخوازی و یەکگرتنی دا ڕوودەدات لە هەموو لایەکی جیهاندا، ئەو هەوڵانەی هەموو پێکەوە کۆدەبنەوە بۆ دروستکردنی میکانیزمێکی ئەمنی هاوبەش. لەوانەیە سیمای دبلۆماسیەتی سیستمی هاوسەنگی هێزەکان لە میانەی دانوستانەکاندا تەواو ڕوون ببێتەوە کە ڕێکخراوە ئیقلیمییەکان و ڕێکخراوە فرەڕەگەزەکان ئەنجامی ئەدەن، ئەوەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە قۆناغی دروستبووندا پشتیوانی لێدەکات، بریتییە لە میکانیزمی کۆتایی تایبەت بە سیستمی هاوسەنگی هێزەکان. ئەگەر ناوەندەکانی هێز لەناو نەتەوە یەکگرتووەکاندا ڕێك بکەون لەسەر ئەنجامدانی گواستنەوەیەك لە سیستمی دابەشکردنی هێز لە چوارچێوەی سیستمی هاوسەنگی

هێزەکاندا، ئەوە بەشداری دەکات لە بەهێزکردنی ڕۆڵی سیستمی بەرگری هاوبەش لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتی، لەوانەشە گواستنەوەکە لە سیستمی هاوسەنگی هێزەکانەوە ڕوودات بۆ سیستمێکی ئاسایشی بە کۆمەڵ.

بە دەربڕینێکی تر دەکرێ بڵێین ئەگەر چوارچێوەی یاسایی سیستمی بەرگری هاوبەش ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی ماوەی دوای جەنگ بێت و ڕێگر بووبێت لە بەردەم دەرکەوتنی گۆڕانکاری هێزە ڕاستەقینەکاندا، ئەوا سیستمی ئاسایشی بەکۆمەڵ ئەوکاتە تەنها بە ڕۆڵێکی سنووردار بەشداری دەکات و بەردەوام پێویستی بە توانایی دەبێت بۆ ئاڕاستەکردنی سیستمی جیهانیی و گەڕاندنەوەی هاوسەنگی بۆی، لە میانەی جەنگی کەنداودا دەنگانێکی زۆر بەرز بوونەوە کە داوای زیادکردنی ژمارەی ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشیان دەکرد، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییەدا بەرەو سیستمێکی هاوسەنگی نوێی هێزەکان. لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی (سۆشیالیستی نێودەوڵەتی)دا کە ڕاستەوخۆ دوای لێدانی عێراق لە لایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیەوە لە ئازاری ١٩٩١ گرێدرا، (ویلی برانت) جەختی کردەوە لەسەر پێویست بوون بە ((نوێنەرایەتییەکی ئیقلیمی زیاتر هاوسەنگ لە ئەنجومەنی ئاسایش و کۆڕبەندەکانی تردا)).

سیمەتی دینامیکی سیستمی هاوسەنگیی هێزەکان ژینگەیەکی سیاسی دابین دەکات کە گونجاوبێت لەگەڵ مانۆڕە دبلۆماسیەکاندا، کە لەوانەیە هاوپەیمانێتی و دژهاوپەیمانێتی بۆ ماوەیەکی کورت دروستبکات کە پشت بە بەرژەوەندییە هاوبەشەکان دەبەستێت، زیاتر لە پشت بەستنی بە بنەما و بۆچوونە ئایدۆلۆژییە هاوبەشەکان، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە ئەولەویەتە سیاسییەکان کە گرنگن لای یاریکەرە سیاسییەکانی سەرگۆڕەپانی نێودەوڵەتی، لەوانەیە بەشداریی بکات لە پێدانی ئەندازەیەکی گەورەتر لە دینامیەکیەت بەو پەیوەندییانە، هەروەك تێکڕای ئەولەویاتەکانی ئەو مانۆڕە سیاسییانە دەکرێ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەست بکرێت بە چۆنێتی کارتێکردن لە سەنتەری شارستانێتی ئایندەدا. لە بیریشمان بێت

که فۆرمۆلەکردنی سەنتەرێکی شارستانی نوێ لە ئەورووپادا و گۆڕینی بۆ ((سەنتەرێکی ئەتڵەسی)) ـ کە ئەوروپی نەبێت بە تەنها ـ تا دوای داڕووخانی سیستمی هاوسەنگی هێزەکانی ویستیڤالیا لە دەستپێکی سەدەی بیستەمدا ڕووی نەداوە، ئەوەبوو کە ئامانجی بنەڕەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەوسیفەتەی ڕۆڵی لووتکەی هەرەمی سیستمی هاوسەنگی هێزەکان دەبێنێت، بریتیی بوو لە پاراستنی باڵادەستی خۆی بەسەر میحوەری ئەتلەسیدا، بەو پێیەی کە سەنتەری شارستانێتییە نوێیەکەیە، ئەوەش بە مەبەستی دەستەبەرکردنی کۆنترۆڵکردنی خۆی بە شێوەیەکی کارا بەسەر سەروەت و سامانی جیهاندا، لەبەر ئەوەش ئەگەری ئەوە هەبوو کە سیاسەتی ئەمریکی لەو قۆناغەدا پشت ببەستێت بە سێ ئەولەویەتی بنەڕەتی بەم شێوەیە:

١ـ پاراستنی یەکگرتوویی سەنتەری ئەتڵەسی لە ڕێگای بەهێزکردنی توانا ئابوورییەکانی و فراوانکردنی پەیوەندییە سیاسییەکان و ئابوورییەکانی لەگەڵ ئەمریکای باکوور بەو سیفەتەی کە پێگەی بنەڕەتی سەنتەرەکەیە و هەروەها لەگەڵ ئەمریکای باشوور بەو سیفەتەی کە پەراوێزێکی پاشکۆی ئەم سەنتەرەیە.

٢ـ گەمەکردن بە بنەما ناوخۆییەکانی سەنتەرە ئەلتەرناتیڤەکان بە سوود وەرگرتن لە خاسیەتە دینامیکییەکانی سیستمی هاوسەنگی هێزەکان، بەوەش ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێت ڕۆڵی میانگیر لە نێوان دەوڵەتەکانی تردا ببینێت.

٣ـ دامەزراندنی میکانیزمی بەرگریکردن و هاوپەیمانێتی ئیقلیمی لە ناوچە جیاجیاکاندا کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەر بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبن.

نیشاندەرەکانی ئامانجی ستراتیژی لە سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵانی کەمی ڕابردوودا بە شێوەیەکی ڕوون بە دیار دەکەون، ئەوەبوو ڕێککەوتننامەی بازرگانی ئازادی باکووری ئەمریکا سەلماندی کە ئەمریکای یەکگرتوو توانای بەرەنگاربوونەوەی هەڵسانەوەی ئەورووپای یەکگرتووی

دەبێت، جگە لەوەش کارتێکردنی گەشەکردووی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ناوچەی ئەمریکای ناوەڕاست دوای دەستوەردانە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی لە (پەنەما و نیکاراگوا) و توانای فراوانکردنی سنوورەکانی ئەمریکای یەکگرتوو بەرەو باشوور، چاوەڕێش دەکرا کیشوەری ئەمریکای لاتینی ڕۆڵێکی میحوەری لەو قۆناغەدا ببینێت بەهۆی ئەو باکگراوندە ئیسپانیە کاسۆلیکییەی کە مەیلی بەرەو ئەورووپایە، ئەگەرچی پەیکەری ئێستای بەشێوەیەکی گشتی سەر بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە.

ئەولەویەتی دووەمی ستراتیژیەتی ئەمریکا خۆی لە درێژەپێدانی سیاسەتی باڵادەستی تاکلایەنە دا دەنوێنێت، لە سایەی ئەو سیاسەتەشدا ڕۆڵی ئەمریکا وەك دەوڵەتێکی میانگیر ڕوو لە زیاد بوونە. ئەمڕۆش هەوڵەکان بۆ گەڕاندنەوەی ڕێز و هەیبەت بۆ ڕووسیا و بیناکردنەوەی، لەوانەیە هاوکاربێت لە بەدیهێنانی هاوسەنگی هێزەکان لە نێوان ئەڵمانیا لە ئەورووپا و ژاپۆن لە ناوچەی باسفیکی دا، ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان هانی بۆ دەدات، چونکە حاڵەتی داتەپیوی ڕووسیا لەوانەیە ببێتە هۆی پەیدابوونی بۆشاییەك و هانی ئەڵمانیا بدات بۆ پڕکردنەوەی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی لەلای ڕۆژئاواوە، ژاپۆنیش لە لای ڕژهەڵاتەوە پڕی بکاتەوە، بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەرۆشی پیشان دەدات بۆ وەرگرتنی کورسی هەشتەم لەلایەن ڕووسیاوە لە کۆی حەوت دەوڵەتە پیشەسازییەکە، هەرئەوەش ڕوویدا و لەلایەکی ترەوە داڕێژەرەکانی سیاسەتی ئەمریکی پشتیوانی دەکەن لە ڕۆڵی گەشەکردنی بەریتانیا لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا لە پێناو فراوانکردنی سنوورەکانی سەنتەری ئەتڵەسی بەرەو ڕۆهەڵات، بۆ ئەوەی بتوانێت گەمە بە پەیوەندییەکانی دەوڵەتە گەورەکان لەناو یەکێتی ئەورووپادا بکات.

بۆ ئەولەویەتی سێیەمیش لە ستراتیژیەتی ئەمریکیدا، ئەکتیڤکردنی زۆر گرنگە بۆ پلانەکانی ئایندەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی و لەو چوارچێوەیەدا بیناکردنەوەی باڵادەستی قۆرخکاری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە قۆناغی

**هاوسەنگی هێزەکاندا ئاسان دەبێت، ئەو ناوچانەش کە مەوادی خام بەرهەم دەهێنن وەك دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە گرنگترینی ئەو هۆکارانە بوون کە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵسێت بە دامەزراندنی سیستمێکی بەرگری ئەقلیمی، چونکە ئەو هەیمەنە ناڕاستەوخۆیەی ئەمریکا بەسەر ئەو ناوچانەدا، دەستپێشخەری تاکتیکی و ئابووری و سیاسی بە ئەمریکا دەبەخشێت بەسەر دەوڵەتە گەورەکانی تردا.**

**لە لایەکی ترەوە ئەوە ڕەچاو دەکرێت کە فەلسەفەی نوێی سۆڤیەتی بۆ سیاسەتی دەرەوە، لە سەردەمی (گۆرباچۆڤ)دا توانی هەندێ توخمی کلاسیکی لە نموونەی سۆشیالیزمدا، ئەوەی کە پەیوەستە بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە بگۆڕێت[١٠]، ئەوەبوو (گۆرباچۆڤ) درکی بەوەکرد کە ئەگەرەکانی سیاسەتی**

[١٠] هەریەك لە کابالکوڤا و کروکشانك (١٩٩٠: ١٩٩-٢٠١) هەشت خاڵیان بۆ ئەو نموونەیە دیاری کردووە، کە ئەمانەن:

١- جیهان لە بنەڕەتدا بریتییە لە وێناکردنێك کە ناسراوە بە ڕێکخستن و جێگیربوو بۆ گەیشتن بە تێگەیشتن لە سیاسەتی جیهان. ٢- پەیوەندیی توندوتۆڵ هەیە لە ناو ڕووداوەکانی کە لەسەر گۆڕەپانی جیهان ڕوودەدەن و لە نێو ڕووداوەکانیشدا. ٣- سیاسەتی دەرەوە درێژکراوەی بونیادی سیاسیی ناوخۆیە. ئەوەش بەشێوەیەك کە ئەو بیرۆکەیە ڕەتدەکاتەوە کە دەڵێت دەکرێ بارودۆخەکان بەراورد بکرێن و سەیر بکرێن وەك فاکتەری سەربەخۆ و بێلایەن. ٤- فاکتەرە گەورەکان مەرج نییە گونجاو بن لەگەڵ بارودۆخی ئێستادا، لەبری ئەوە بوونی پەیوەندییەکی سێ ڕەهەندی گریمانە دەکرێت بۆ وەسفکردنی سیستمە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان کە ئەمانەن: (سەرمایەداری و سۆشیالیستی و جیهانی سێیەم). ٥- دابەشبوونێکی دوولایەنەی بنەڕەتی هەیە باڵادەستە بەسەر جیهاندا کە (سەرمایەداری و سۆشیالیستی) دەگرێتەوە، لەگەڵ گریمانەی پێکدادانی ئەو دوو هێزە. ٦- ئەو پێکدادانە لە کۆتاییدا شێوەیەکی نزیکتر لە یاری سیفری دەردەکەوێت، کە سەرکەوتوو لە سەرەنجامدا لەسەر هەردوو ئاستی مێژوویی و ئەخلاقی سیستمی سۆشیالیستی دەبێت. ٧- دەتوانرێ پلێتەی پێکدادانەکە تەنها لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دەربهێنرێت، نەك لەسەر ئاستی تاکەکان یان دەوڵەتەکان هەرکام بۆخۆی. ٨- هەموو ئەوانە لە کۆتاییدا دەبنە هۆی دانانی ڕموزی ڕیزبەندی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا و دوابەدوای ئەوەش ڕیزبەندی

دەرەوەی سۆڤیەتی سنووردارن بەهۆی ئەو نموونەیەوە کە پشت بەستووە بە ئایدۆلۆژیا کۆنەکانەوە، هەرئەوەش بووە هۆی بەهەدەردانی داهاتە ئابوورییەکانی لە پارەدان بە بەرەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئایدۆلۆژی نێودەوڵەتی. ئەو فەلسەفە نوێیەی سیاسەتی دەرەوە لەگەڵ زیندووکردنەوەی کەلەپووری مێژوویی ڕوسیا هاوکاربوون لە دانانی بەردی بناغەی قۆناغێکی فرەڕەهەند لە بەردەم داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەوەی ڕووسیادا.

لێرەدا پرسیارێك دەوروژێت سەبارەت بەوەی کە ئایا دبلۆماسیەتی ڕووسی بە تەقالیدە بیرۆکراتییە کۆنەکانیەوە، پشتیوانی ئەم بۆچوونە نوێیانە دەکات کە پەیوەستن بە سیستمی هاوسەنگی هێزەکان، یان نا؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئاڕاستە ئایندەییەکانی سیاسەتی دەرەوەی ڕووسیا دیاری دەکات، لەم ڕاستایەدا ئەوە ڕەچاو دەکەین کە سەرکردە نەتەوەییە تازەکانی ڕوسیا هەوڵدەدەن بۆ بینینی ڕۆڵێکی هاوسەنگیکەر لە نێوان ئەوروپاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم قۆناغەدا، بەرهەڵستیکردنی دیموکراسییانە بە سەرکردایەتی (یەلتسین) دژ بەکودەتای سەربازی هاندەربوو بۆ سیاسەتەکەی (گۆرباچۆڤ) کە لە دروشمی (نیشتمانێکی ئەوروپی هاوبەش)دا کورتکرابووەوە، ئەوەش لە هەولێکدا بۆ گۆڕینی ڕوخساری ڕووسیا لە بەردەم ئەوروپادا و بۆ ڕاگەیاندنی لایەنە فرەڕەهەندە جیاکەرەوەکانی فەلسەفەی تازەگەری، بە مەرکەزیکردنی دروشمی (نیشتمانێکی ئەوروپی هاوبەش) لە بینینی ڕۆڵێکی گرنگ لە سیاسەتی ڕووسیدا لە قۆناغی دامەزراندنی سیستمی هاوسەنگی هێزەکاندا بەردەوام بوو، لە هەمان کاتیشدا پێشەوایانی ڕووسیا لە هەوڵدا بوون بۆ پاراستنی پێگەی وڵاتەکەیان وەك زلهێزێکی

---

پەیوەندییەکان لەسەر ساحەی نێودەوڵەتی ملکەچ نابێت بۆ ناوەرۆکەکەی، بەڵکو لەسەر بنەمای ناسنامەی لایەنە بەشدارەکانی ئەو پەیوەندییە دەبێت. (لیفو نین، ١٩٩٠: ٢٣).

گەورە لە دانوستانەکانیان لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ بەهێزکردنی ڕۆڵیان لە دیاری کردنی ئایندەی ئەوروپادا.

پەیوەندییەکی شایانی بایەخپێدان بێت نەریتە دبلۆماسیەکانی ئەڵمانیا و ڕووسیای پێکەوە کۆدەکردەوە بە شێوەیەك گونجاو بێت لەگەڵ سیاسەتەکانی سیستمی هاوسەنگی هێزەکاندا، شارەزاییە مێژووییەکانی سەدەی نۆزدەهەم سەلماندی کە پێکهێنانی هاوپەیمانێتییەك لە توانای ئەڵمانیا و ڕووسیادایە دژ بە هەر هاوپەیمانێتییەکی تر کە لە نێوان دەوڵەتێکی دەرەوەی ئەوروپا و بەریتانیادا ببەسترێت (ئەوە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی دروستبوونی سیاسەتی هاوسەنگی هێزەکان ڕوویدا) بە مەبەستی ڕاکێشانی ناوەندی دەسەڵات بۆ ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ڕووسیا، هەروەك لەکاتی پەیمانی ئەڵمانی (سلافی) لە ساڵی ١٨٧٢دا ڕوویدا، ئەوەبوو دوای ئەوە چەند ڕێککەوتننامەیەك لە نێوان ئەڵمانیا و ڕووسیادا لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا گرێدرا. ئەوەی کە باسمان کرد تەنها چەند نموونەیەکن کە ئەگەری پێکهێنانی نموونەیەکی ئەو هاوپەیمانێتییەی نێوان ئەڵمانیا و ڕووسیا دەسەلمێنن، ئامانجی ئەڵمانیاش لەوکاتەدا لە پشت درووستکردنی ئەو هاوپەیمانێتییەوە بریتی بوو لە زامنکردنی ئاسایشی بەرەی ڕۆژهەڵاتی پێش ئەوەی دەستبکات بە فراوانبوون بەرەو ڕۆژئاوا، بۆ ئەوەی ئەگەری هەر هاوپەیمانێتییەکی نێوان فەرەنسا و ڕووسیا لەبار ببات، کە فشارێکی لەسەر دروستبکات لە هەردوو سەری کیشوەری ئەوروپاوە، لێرەدا شیاوە کە ئاماژە بکەین بۆ لێکچوونێکی گەورە لە نێوان پەیمانی ئەڵمانی (سلاڤی) ساڵی ١٨٧٢ و لەگەڵ ئەو پەیمانەی کە هیتلەر و ستالین پێش جەنگی دووەمی جیهانیی پێکیان هێنا، ماکینەی سەربازی ئەڵمانی هاوکاربوو بۆ فراوانکردنی سەروەری خۆی بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن سەروەرییەکی کیشوەری، ئەوەش لە کاتێکدا فەرەنسای داگیرکرد، ئامانجی ڕوسیاش و دواتر یەکێتی سۆڤیەت لە پشت ئەو هاوپەیمانێتیانەوە بریتی بوو لە ڕاکێشانی پەیوەندییەکانی هێز بەرەو ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا لە ڕێگای هاوکاریکردنی

لەگەڵ ئەڵمانیادا، هەروەها بە مەبەستی بەهێزکردنی هەڵوێستی سەروەریی خۆی بەسەر ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا چاوەڕوان ناکرێ یەکێك لە دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا بە هێزێکی سەربازی گەورە وەك ئەڵمانیا دەربکەوێت، یان تەنانەت هەندێ هاوپەیمانێتیش کە ئامانج لێی سیاسەتی فراوانخوازی بێت، لەگەڵ هەبوونی پەیوەندییە هاوشێوەکانی ململانێی ئابووری لە ئەوروپادا، ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان ئەڵمانیا و ڕووسیادا بوو. لە ڕوانگەیەکی ترەوە گۆڕانکاری لە هێزە ئابوورییەکاندا ڕوونی دەکاتەوە، کە ڕووسەکان و ئەڵمانەکان بەرژەوەندیی هاوبەشیان هەبوو لە گواستنەوەی سەنتەری شارستانێتی بۆ ئەوروپا، ڕووسەکان دەرکیان بەو ڕاستییە کرد کە ناکرێ نیشتمانێکی ئەوروپی هاوبەش دابمەزرێت، بەبێ بەشداری هێزی ئابووری ئەڵمانی، هەروەك ئەڵمانەکانیش دەیانزانی کە سیاسەتی دەرەوەیان سەرکەوتنی بۆ نانووسرێت، بەبێ هاوکاریکردنیان لەگەڵ ڕووسەکان بۆ هەڵگرتنی هەندێ بەرپرسیارێتی نێودەوڵەتی ـ کە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بۆی جێهێشتبوون ـ لە بری ئەوروپای یەکگرتوو، کە پشت دەبەستێت بە بونیادی ژێرخانی ئابووری ئەڵمانی، ئەوەبوو یەکێتی ئەڵمانیا بە ئاسانی بەدیهات بەهۆی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیا. ((سیاسەتی ڕووکردنە ڕۆژهەڵات))ی ئەڵمانی پشتی بەستبوو بە هەندێ دەستەواژەی بریقەداری بەناوبانگ وەك ((ئاسایشی هاوبەش)) و ((بەشداری دیفاعی)) لە ساڵانی نەوەدەکاندا. ئەوە لەکاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەك لەسەر ڕوودانی گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە سیاسەتی ڕوسیادا دەرنەکەوتبوو، بۆ قۆناغێك لە لێکگەیشتنی هاوبەش بۆ سروشتی پشت بەستنی ئاڵوگۆڕ بە یەکتر لە ئەوروپادا.

هەربەم شێوەیە هاوپەیمانێتییەك ئەڵمانی سلاڤی نوێ وا دەردەکەوت کە بەسوود بێت بۆ ڕاکێشانی چەقی قورسایی بەرەو ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا کە پێ دەچوو پرۆسەی دامەزراندنی سەنتەرێکی شارستانی نوێ لە کیشوەری ئەوروپادا خێراتر بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەزموونە مێژووییەکان ئەو ڕاستییە جەختدەکەنەوە

که دەکرێ ئەو هاوپەیمانێتییە هەڵگەڕێتەوە بۆ دووژمنایەتییەکی ئاڵوگۆڕ کاتێك ئەو دەوڵەتانە دەست دەکەن بە زۆرانبازی لەسەر سەروەری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، ئەوەبوو لە کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا هاوپەیمانێتییەکە گۆڕا بۆ دوژمنایەتی (وەك هاوپەیمانێتی ڕووسی فەرەنسی ساڵی ١٨٩٤دژ بە ئەڵمانیا)، هەروەها لە دەیەی چلەکانی سەدەی بیستەمدا ـ هێرشی هیتلەر بۆسەر یەکێتی سۆڤیەت و پەیمانەکەی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا). لەوانەشە ئەو جۆرە ڕووبەڕووبوونەوانە لە ئایندەدا ڕووبدەن، پەیدابوونی هێزی ڕاستەقینە لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا ببێتە هۆی دروستبوونی قەیرانێکی هەمەلایەنە لە ناوچەکەدا، چونکە ئەڵمانیا و ڕوسیا پەیوەندی مێژوویی لە نێوانیاندا هەیە کە پەیوەندییەکانیان، بە پێکهاتە نەژادییەکانی ئەو ناوچە هەستیارەوە بەهێز دەکات، وەك کەمینەی ڤۆڵگای ئەڵمانی کە لە ناوچەی حەوزی زێی ڤۆڵگا دەژین و سربەکانیش کە لە بولقان دەژین، سەرباری ئەوەش تایبەتمەندییە ئابوورییەکانی ململانێ لە نێوان هێزە هاوچەرخەکاندا ڕەنگە دووژمنایەتی هاوشێوەیان لێ بکەوێتەوە، بەڵام ئەزموونە مێژووییەکان کە ئەو وڵاتە پێیدا تێپەڕیان کردووە، ناچاریان دەکات لەسەر جێبەجێکردنی سیاسەتێکی فرەڕەهەند و ئەو جۆرە سیاسەتانەش بۆیان هەیە بەشداری بکەن لە پێکهێنانی سیستمێکی نوێ بۆ هاوسەنگی هێزەکان، بەڵام ئەولەویەتی ستراتیژی سیاسەتی فەرەنسی لەو قۆناغەدا، بریتی بوو لە بەهێزکردنی ڕۆڵی کۆمسیۆنی ئەوروپی کە هێمایە بۆ ناوەندێکی دەسەڵاتی یەکگرتوو کە پاڵ بە هێزی ئابووری ئەڵمانییەوە دەنێت بەرەو زیادکردنی تێکڕای دەسەڵاتی ئەوروپی لەناو سیستمە جیهانییەکەدا، ڕەنگە فەرەنساش پشتیوانی لە فراوانکردنی بازنەی کۆمسیۆنی ئەوروپی بکات بە مەبەستی ڕێگرتن لەوەی ئەڵمانیا بازاڕی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپای دەوڵەتە بچوکەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران قۆرخ بکات بۆخۆی، بۆیە ئەولەویاتی فەرەنسی و ڕووسی بەیەکدا دەچن بۆ پێکهێنانی هاوسەنگییەکی دژ لە

بەرامبەر سەروەی باڵادەستی ئابووری ئەڵمانیا لە ڕێگای پشتیوانیکردن لە ئەرکی فراوانکردنی ئەکێتی ئەوروپاوە. چاوەڕێش دەکرێت کە فەرەنسا بەردەوام بێت لە جێبەجێکردنی سیاسەتێکی فرەڕەهەند بۆ هاوسەنگکردنی تای ئابووری ئەڵمانی و هەیمەنەی ئەمریکی جیهانیی و دەسەڵاتی ڕوسیا، بەوەش ڕۆڵی سیاسی خۆی بەسەر ساحەی نێو دەوڵەتیدا بەهێزتر دەکات بەوسیفەتەی کە پێشەوای سیاسی میحوەری ئەوروپییە، بەڵام لە بارەی ئایندەی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیاوە، ئەوا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان هەردوو میحوەری ئەتڵەسی و ئەوروپییەوە.

دینامیکییەتێکی تری هاوشێوە لە سەنتەری باسفیکیدا بە هۆی توانای ئابووری ژاپۆن و سەروەری دیموگرافیای چین ڕەچاو دەکرێت، لە پاڵ چالاکی دەوڵەتە تازە ڕاپەڕیوەکانی وەك کۆریادا، ئەوا ئەو هەموو فاکتەرانە کاریگەرن لەسەر ئایندەی سیاسی ئەم سەنتەرە لە چوارچێوەی سیستمی جیهانیدا، پێویستە هوشیاری ئەوەش بین کە ڕژێمەسیاسییەکانی ئەو ناوچەیە توانای ئابووری ئەوتۆیان لەسەر کارتێکردنی خێرا لە جووڵەی تەواوخوازی سیاسی و ئاسایشی جیهانیدا نییە. وادەردەکەوێت کە میراتی سەربازی ژاپۆنی کە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانییدا دروست بوو، حاڵەتێکی پێکەوە هەڵنەکردنی دەروونی لە نێوان دەوڵەتەکانی ناوچەکەدا هێناوەتە کایەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەو پەیوەندییەی نێوان ئەڵمانیا و هێزە ئەوروپییەکانی تری جیاکردۆتەوە، هەرئەوەش بووەتە هۆی بەتاڵکردنەوەی کاریگەری ئابووری ژاپۆنی لە بەدیهێنانی هەرجۆرە تەواوخوازییەکی سیاسیی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، لەبەر ئەوەیە کە هێزە سیاسییەکانی ئەو ناوچەیە پێویستیان بە پرۆسەیەکی درێژخایەنترە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاریی لە سیستمی ئابوورییاندا بۆ ئەوەی توانایان بشکێ بەسەر داڕشتنی هاوپەیمانێتی سیاسییدا، زۆریش وادەبێت کەدەوڵەتانی وەك ژاپۆن، چین، ئوستراليا و كۆریا لایان باشتربێت کە سیاسەتی دەرەوەیان جارێکی تر بەپێی ئەولەویاتیان لەسەرگۆڕەپانی جیهانیی

ڕێك بخەنەوە، ئەگەرچی هێزی ئابووریی ژاپۆن لە سیستمی جیهانییدا بۆ مەودای دوور کاریگەری لەسەر سیستمی هاوسەنگی هێزەکان دەبێت.

**قۆناغی چوارەم: گواستنەوەی سەنتەری شارستانییەت:**

دواقۆناغ لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی سیستمی جیهانیی نوێ قۆناغی دارشتنەوە، یان نۆژەنکردنەوەیە، یان گۆڕینی سەنتەری شارستانیەکەیە کە پەیوەندییەکی لە نێوان تێڕوانینی سەنتەرەکە بۆ جیهان لەگەڵ سیستمی جیهانیدا جێگیرکردووە، ئاشکرایە کە سیستمی جیهانیی هەردەم ڕەنگدانەوەیەکی فیکری و دامەزراوەیی کۆمەڵێك بەهایە کە نموونە شارستانیەکەی پێکهێناوە و پشت بەستووە بە ڕوئیایەکی دیاریکراو بۆ جیهان بە مانا فەلسەفییەکەی، ئەوەی کە ئەم زاراوە ئەڵمانییە (Weltanschaun) ئاماژەی بۆ دەکات. دیارە کە سیستمی ویستیڤالی ڕەنگدانەوەی نموونەیەکی شارستانی نوێ بوو کە لە جیهانیی ڕۆژئاوادا فۆرمۆلەی بۆ کرابوو، لەسەر ئەوە دەکرێ بووترێ کە بە دەزگاییکردنی چەمکە ئیستیعمارییەکان لە میانەی سەدەی نۆزدەهەمدا و چەمکی سیستمی بەرگری هاوبەش بە دەوری سەنتەرە شارستانییەکەدا کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دروست بوو، هەردووکیان دەربڕی گۆڕانکارییەکانن لە سیستمی جیهانی ئەورووپیدا، بەوسیفەتەی کە نموونەیەکی هاوتایی بوو بۆ گۆڕانکارییە شارستانییە تازەپەیدابووەکان، ئەو ئەو گۆڕانکارییانەی کە سیستمی ویستیڤالییان بەجیهانیی کرد لە ڕێگای ڕژێمە فەرعیەکانی ناو شارستانێتی ئەورووپییەوە، بەڵام هەوڵەکەی دواتر کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستی پێکرد بۆ دووبارە دارشتنەوەی سیستمی جیهانیی لە دوای لێك هەڵوەشانەوەی سیستمی دوو جەمسەری، هەر ئەوەش دەربڕینێك بوو بۆ نیشاندەرێك کە بەڵگەبوو لەسەر پاراستن، یان نۆژەنکردنەوەی بونیادێکی باڵادەست بەهۆی سەنتەرێکی شارستانێتی سەرکەوتووەوە لە میانەی پرۆسەی هەموارکردنی خەسڵەتە دەزگاییەکانی سیستمی جیهانیی دا.

زۆرتر وادەبێت کە پەیدابوونی هاوسەنگی لە سیستەمی هێزە جیهانییەکاندا ـ دوای هەڵوەشانەوەی سیستەمی جیهانیی کە لە ماوەی دوای شەڕی سارددا باڵادەست بوو ـ ببێتە هۆی ڕوودانی گواستنەوەیەکی نوێی سەنتەری شارستانێتی، یان بەلای کەم دووبارە داڕشتنەوەی. پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە: ئایا گۆڕان لە سەنتەری شارستانێتی دا دەکرێ توانای هەبێ لەسەر پێشکەشکردنی چارەسەر بۆ ئەو قەیرانە هەمەلایەنەی کە نموونە ڕۆژئاواییەکە پێیەوە گرفتارە، یان نا؟

لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ـ وەك لە پێشەوە ڕوونمان کردەوە ـ گەیشتین بەوەی کە مرۆڤی ئەمڕۆ ڕووبەڕووی تەنگژەیەکی زیاتر شموولی بووەتەوە، ئەوەش ئاساییە کە دووبارە توێژینەوەو بەکارهێنانی ژیری لە پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤ و ژینگە سروشتی و دەستکردەکانیەوە پێویست دەکات، سیستەمی جیهانیی شتێك نییە جگە لە سیستەمێکی دەستکرد کە مرۆڤ خۆی دروستی کردووە، بۆیە ناتوانرێت ڕوودانی گۆڕینی جەوهەری لەو ژینگەیەدا بە دوور لە بەشداربوونە شارستانێتییەکانی تر وێنابکرێت، ئەم قەیرانەی ئێستاش کە سەرشانی سیستەمی جیهانیی گران کردووە تایبەت نییە تەنها بە پەیکەری نەتەوە یەککگرتووەکانەوە، هەروەها کورت ناکرێتەوە تەنها لە ڕەنگدانەوە دەزگاییەکانی تری تایبەت بە سەنتەرێکی شارستانێتی دیاریکراوەوە، بەڵکو قەیرانێکی گشتگیرەو هەموو سیستەمە جیهانییەکەی لوول داوە.

بە بەکارهێنانی چەمکەکانی (گاڵتنگ) و پۆلینەکانی (١٩٨٥: ١٤– ١٥) دەکرێ بڵێین ئەو قەیرانە هەمەلایەنەی کە ئاماژەمان بۆ کرد، لەو بەڵگە نەویستە ئابوورییانەوە پەیدابووە کە شارستانێتی ڕۆژئاوا دایناون لە پەیوەندییدا بە سروشت و مرۆڤ و مێژووی کولتوورەکان و پەیکەری کۆمەڵایەتی جیهان و فەلسەفەوە، ڕوانین بۆسروشت وەك ئەوەی بەتەنها سەرچاوەی مەوادی خام بێت، نەوەك سیستەمێکی تێرو تەواو بەخۆی و پێوەری هاوسەنگیکردنی تایبەت بەخۆی هەبێ و توانای هەبێ لەسەر گەشەکردن و پەرەسەندن، هەروەها وێناکردنی تاکەکان وەك ئەوەی کە

**داهێنان بن بۆ هەردوو پرۆسەی بەرهەمهێنان و بەکاربردن و بەس، نەك ئەوانە مرۆڤن و زاتییەت و بوونی خۆیان هەیە و پێداویستی بنەڕەتییان هەیە (کەمێکیان سروشتێکی مادديیان هەیە)[11]، لەومیانەدا شێوەی جیهانی هاوچەرخ دیاری دەکرێت، هەموو ئەو تێڕوانینانە زۆر دوورن لە زامنبوونی ئاسایشی وجودی و ئازادیی ڕاستەقینە کە لە مێژە لە میانەی گەشتەکەیدا بە درێژایی مێژوو مرۆڤ خەونی پێوە دەبینێت.**

---

[11] گالتنگ (١٩٨٥: ١-١٥) وێناکردنەکانی تری ئاڕاستەی ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوایی پەیوەست بە بونیادی ئابووری و بەهایی بەمشێوەیەی خوارەوە وەسف دەکات: ((٣-کولتور نەگۆڕێکە لە نەگۆڕەکان و کاریگەری هەیە لەسەر گەشەی ئابووری، دابەش دەبێت بۆ کولتوری سەرەتایی، کولتوری کلاسیکی، ئەوی تر مۆدێرن. ٤- مێژوو: هوشیارییە بە کات کە هەڵقوڵاوی پێشینەی گەشەکردنی ئابوورییە و بەبێ ئەوە شیکردنەوەی چالاکیی ڕژێمەکان جۆرێکە لە ئەستەم، بەڵام هوشیارییەکی سنووردار دەمێنێت ئەگەر بە مێژوو لەناو نەچێت بە ئەو گۆڕانکارییە ڕیشەییانەشەوە کە لەن موونە کۆمەڵایەتییەکاندا دروستی دەکات. ٥- بونیادی کۆمەڵایەتی: هوشیاریی دابەشکردنی داهات و بەکردەیی لە هەندێ کاتدا لە شێوە و وێنەی هێڵکارییدا وێنا دەکرێت کە چەماوەی دابەشبوونی داهات ڕوون دەکاتەوە. ٦- چوارچێوەی جیهانیی: هوشیاریی بە ڕێگاکانی بازرگانی و جوگرافیای ئابووری بە شێوەیەکی گشتی، بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە چوارچێوە سیاسییە جیهانییەکەدا ڕوو دەدات، چونکە جیهان دابەش بووە بەسەر خۆیدا بۆ گرووپەکان یان گەلان و هۆزەکان، هەروەك لە ناو کۆمەڵگەکانی قۆناغەکانی پێشوودا هەبوو، کاتێك تاکەکان خۆیان دابەش دەکەن بەبێ نیشاندەرەکانی بارودۆخی ئابوورییان وەك (تێکڕای بەرهەمی خۆماڵی، یان تێکڕای داهاتی تاك، یان تێکڕای داهاتی خێزان)، دوای ئەوە بڕیارە هەڕەمەکییەکان دەردەکەون بۆ وەلاتانی هەربڕوایەك بە پارچە پارچەکردنی جیهان بۆ گەلان و کۆمەڵەکان، یان تەنانەت بۆ یاریزانی بنەڕەتی و یەدەك. لە ئەنجامی ئەوەدا هیچ چەمکێکی ڕاستەقینەی بونیادی ئابووریی سیاسیی دەرناکەوێت، جیهانیش تەنها وەك گەلان و گرووپی خنکاو لە چینایەتیدا دەمێنێتەوە. ئەوسا هوشیارییەکی سنووردار دەبێت بە پێویستی ڕژێمە ئابوورییە ڕۆژئاواییەکان بۆ توانای تاوتوێکردنی ئەو جۆرە مەسەلانەی کە لە پێشەوە باسمان کردن.

ئەم لێوەرگیراوەی خوارەوە- کە (گالتنگ) وەریگرتووە – تێڕوانینی دەروونی چەمکی ئیدراکی زاتی لەناو تێۆرەکانی کۆمەڵناسی گەردوونیدا ڕوون دەکاتەوە، هەر ئەوەشە کە دواتر چەمکی سیستمی جیهانیی لە شارستانێتی ڕۆژئاوادا دیاری دەکات: ((باڵا دەستیی مرۆڤ بەسەر سروشتدا و باڵا دەستی مرۆڤ بەسەر مرۆڤدا، دوو مەسەلەن لە مەسەلەکانی تیۆری کۆمەڵناسی گەردوونی، تاڕادەیەکی زۆریش هەردووکیان هاوشێوەن لە کارتێکردنیان لەسەر قەیرانی ئیدراکی زاتی. ئەگەر مرۆڤ کۆنترۆڵی کرد بەسەر سروشتدا و هەندێ لە مرۆڤەکان کۆنترۆڵی ئەوانی تریان کرد، ئیتر گرفتاریی ڕوو دەکاتە سروشت و زۆرێك لە مرۆڤەکان، ئافرەتان بە شێوەیەکی بنەڕەتی، بە تایبەت لەوکاتانەدا کە سیستمی جیهانیی دووچاری قەیرانی جیددی دەبێت، ئەوکاتە مرۆڤ بە هەقی خۆی دەزانێت کە ببێتە هۆکاری گرفتاربوونی سروشت، دیسان بە هەقی خۆی دەزانێت کە خەڵکانێکی تری وەك خۆی بچەوسێنێتەوە، بەوەش چەوسێنەر پابەندبوونەکانی سەرشانی جێبەجێ دەکات کە بەشێکی جیانەکراوەیە لە تێزە گەردوونییە کۆمەڵایەتییەکان، لەسەر ئەو بنەمایە ئەو ڕاستییانە هەمیشە خاوەنی بوون و کارتێکردن دەبن، خاڵی دوای ئەوە بۆ پێشکەشکردنی پاساوی کۆتایی دێت، ئەوەش ئەو بانگەشەیە کە دەڵێت بونیادی کۆمەڵایەتی ڕۆژئاوایی لە شێوەی بونیادەکانی تردا نییە، چونکە بونیادێکی زیاتر پێشکەوتووە و پێویستە مانەوەی ئەبەدی بۆ بنووسرێت، لەبەر ئەوە کە بەخێوکەری کۆتایی شارستانێتی مرۆڤایەتییە (وەك ئەو هەستە فەرەنسییەی کە پێی وایە فەرەنسا ڕۆڵێکی گرنگ و هاوشێوەی هەیە لە بارەی شارستانێتی ئەورووپییەوە). بەم پێیە سێ مانای بەڵگە نەویست بەدیار دەکەوێت:

**مانای یەکەم:** هیچ پاساوێك نییە کە داوا لە ڕۆژئاوا بکات بۆ ڕوانین لە دەرەوەی سیستمە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی بۆ ئەوەی ببینێت کە چ شتێك لە دەرەوە ڕوو دەدات، ئەو سیستمەی کە پێی وایە لێوەشاوەیی خۆی سەلماندووە و گونجاوە لەگەڵ ڕاستییەکانی ئەمڕۆ و گۆڕاوەکانی سبەیدا.

**مانای دووەم:** ئەوەیە کە ڕۆژئاوا بووە بە ناوەندێکی میحوەریی جوڵێنەری جیهان و ئەو ناوەندەش خۆی جووڵێنەری ڕۆژئاوایە، لەسەرو ئەو بنەمایەش کەواتە ڕۆژئاوا بە توانایە بۆ پاراستنی ڕۆژئاوا بە هۆی تێگەیشتنی دروستی بۆ خۆی، ئا لێرەوە پێویستی بە لێتێگەیشتنی خەڵکی تر نابێت.

**مانای سێیەمیش:** ئەوەی کە پێویستە بکرێت دەبێ بکرێت، تەنانەت ئەگەر بەو مانایەش بێت کە پێویستە هێزە شەڕخوازەکان لەناوببرێن (بێگومان لە تێڕوانینی ڕۆژئاواوە)، ئەوە تەنها هەقێك نییە، بەڵکو ئەرك و پێویستە لەسەر شانی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە خۆی، هەروەها بەرامبەر مێژووی مرۆڤایەتییش، چونکە ڕۆژئاوا سەنتەری هەڵبژێردراوە و شارستانێتی هەڵبژێردراویشە)) (١٩٨٥: ٢١) ئەم چەمکە پێویستە پێداچوونەوەی تێدا بکرێت بە دەرەنجامە سیاسییەکانیشدا، ئەگەر بمانەوێت زاڵ ببین بەسەر ئەو قەیرانە ژیارییە هەمەلایەنەدا لەپێناو دانانی سیستمێکی جیهانیی کە سیمای دادپەروەریی و سەقامگیریی هەبێت. هەروەك هەموارکردنە یاسایی و دەزگاییەکان بایەخێکی تایبەتیان هەیە لەپێناو پاراستنی سەنتەری شارستانێتی ئەتڵەسی دا، یان لەپێناو گواستنەوەی سەنتەری شارستانێتییەکە بۆ ئەوروپا، ئەو هەموارکردنانە لەهەمانکاتدا بە گۆڕانکاریی کلاسیکی و نوێ وەسف دەکرێت، ئەوانەش لەناو نموونەکە خۆیدا ڕیز دەبن، بەڵام نابنە هۆی دابەشکردنی هێزە ئابوورییە سیاسییەکان و هێنانەکایەی ئاسایشی جیهانیی زۆرەملێ لەژێر سەرپەرشتی ئەو میحوەرانەدا، هەرچەند لەتوانایدا نابێت زیندوێتی پەخش بکەنەوە بە گیانی نموونە شارستانییەکەدا لەپێناو پێشکەشکردنی وەڵامەکانی ئەو پرسیارە گەورانەی کە بە درێژایی مێژوو دەگەڕێن بە دوای ئازادیی بوون و ئارامییدا. لەوانەیە سەنتەری ئەتڵەسیی بتوانێت هەندێ توخم و دەرفەتی نوێ پێشکەش بکات بە مەبەستی هێنانە کایەی لێکگەیشتنێکی ڕۆشنتری سیستمی جیهانیی، بەڵام ئەو سەنتەرە هەرزوو پێویستی دەبێت بە چوونیەکبوون و ژیانەوەی فیکریی و ڕۆحانی شایستە بۆ چوونە قووڵایی بنەما نموونەییەکانی سیستمی

جیهانیی ئێستا. ئەو توخمانەی کە ناوەندی ئەتڵەسیی پێشکەشیان دەکات کە مەبەست لێی بەدیهێنانی گەشەکردنی ئابوورییە لە ڕێگای باشترکردنی داهاتە مرۆییەکان، بەو سیفەتەی کە فاکتەری دینامیکیەتی زۆر گرنگن بۆپەرەسەندنی تەکنۆلۆژی. لەوانەشە ئەو ئەولەویەتە ستراتیژییە ببێتە هۆی بەهێزکردنی هەڵوێستی ناوەندی ئەتڵەسیی لە ناو سیستمی جیهانیی ئێستادا، لە جیاتی ئەوەی سیستمێکی جیهانیی بەدیل پێشکەش بکات کە پشتبەستوو بێت بە نەریتە کولتوورییە مێژووییەکان.

فونگرونباوم (١٩٦٢م: ٥٠– ٥١) له وتارێکدا له بارەی نهێنی بەردەوامبوونی بنەما بنەڕەتییەکانی شارستانێتی ئیسلامییەوە، نووسیویەتی، پرسیارێکی گرنگی وروژاندووه که دەڵێت: ((نەتەوەکان (الأمم) پێکدێن و هەڵدەوەشێنەوە، شارستانێتییەکان گەشه دەکەن و لەناودەچن، بەڵام ئیسلام به مەحکەمیی مایەوە و بەتوانایه بۆ لەخۆگرتنی خەڵکی شارستانی و خەڵکی دەشتەکی و بونیاتنەرانی شارستانێتییەکانی تری لەناو خۆیدا جێکردەوە، ئەوانەی که وێرانیان کرد. کەواته دەبێ ئەو هۆکارانه چی بن که وەك یەك نەتەوە (أمة واحدة) کۆیکردنەوە، یان ئەوە چیه که وایان لێدەکات به ئاگایی، یان بێئاگایی به ئاڕاستەی پارێزگاریکردن له تایبەتمەندییەکانی کەسایەتییه بێوێنەکەی خۆیان دەڕۆن، لەکاتێکدا خەریکن پەیوەندییەکانی خۆیان وەك ئایینێکی جیهانیی فراوان دەکەن و بەنرخترین سامانی ڕۆحیی خۆیانی دادەنێن؟)).

داڕووخانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی و سەرهەڵدانی ڕابوونی ئیسلامیی لەو ناوچانەدا که زەمانێك بوو لەلایەن سۆڤیەت– بێباوەڕه شمولییەکانەوە– ژێر دەسته بوون، قووڵیی ناوەڕۆکی پرسیارەکەی (گرونباوم) لەبارەی نهێنی نەمری شارستانێتی ئیسلامیی و بەرەنگاربوونەوەی بۆ ئاستەنگەکانی ڕۆژگار دەسەلمێنێت. جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژه بکەین بەوەی که (ف. ك. فوتیف) له ساڵی (١٩٨٥)دا باسی دیاردەی ژیانەوەی ئیسلامیی له کۆماری چیچان و ئەنگۆشیا دەکات، ئەو ناوچەیەی که لەژێر ناهەموارترین سیاسەتی داپڵۆسینی ئیلحادی دا دەیناڵاند له ماوەی فەرمانڕەوایی ستالین دا، دەڵێت: ((پیاوانی ئایینیی ئیسلام هەوڵ دەدەن بچنه ناو وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خێزانییەوە و کۆنترۆڵی گۆڕستانەکان بکەن و دادگاکانی که پێی دەوترێت (Khhel) ساز بکەن، هەروەها پێشەوایانی تائیفه ئاینیەکان و نەوەکانی شێخ و مەلاکان هەوڵ دەدەن کۆمەڵه موریدەکان پێکبهێنن، بەبێ گوێدانه سیستمه یاساییه کارپێکراوەکان که ئەو جۆره کارانه قەدەغه دەکات و کار دەکەن بۆ بیناکردنی مزگەوتەکان بەبێ مۆڵەتی یاسایی، بۆ ئەوەی ببنه

پەناگەی کۆمەڵەی برا موریدەکانیان، هەروەك لە گوندەکانی چیچانی ئاوولا، یورزوی، شیلکی، شاری نازراق و چەندین شوێنی تر ڕوویدەدا)) (رایکن، ١٩٩١: ١٣٥).

فۆتییف، هێرش دەکاتە سەر پێکهێنانی دروشمە ئیسلامییە قەرەباڵغەکان و لەبەرامبەر پرۆسەی کۆکردنەوەی پارە بەخشین و قوربانییکردن و وتاردان و سرروودە ئایینییەکان بێزاریی دەردەبڕێت. لە گوندێکدا کە پێی دەوترێ (زاکان یورت) دەکەوێتە هەمان ناوچە، ڕێکخراوێك کەشف کرا کە منداڵان، کوڕانی موریدەکانی تەریقەی سۆفیگەریی لەخۆدەگرێت لە ساڵی ١٩٨٣دا پێش ئەوەی (گۆرباچۆڤ) سیاسەتی (پیرۆسترۆیکا) ڕابگەیەنێت بە چەند ساڵێك.

دەستگرتن بە ناسنامەی ئیسلامیی و دەرکەوتنی هوشیاریی بەرامبەر ئەو ناسنامەیە لە میانەی ممارەسەکردنی ئەو دروشم و ڕواڵەتانەی کە ئاماژەمان پێکردن لە گۆشەگیرترین ناوچەدا کە ڕووبەڕووی سیاسەتی داپڵۆسینی زۆر بێڕەحمانە دەبوونەوە و بەلای کەم سێ نەوەی یەك لەدوای یەك بەو هەلومەرجە ناهەموارەوە گرفتار بووبوون، پێویستە دیراسە بکرێت، وەك دیاردەیەکی هاوزەمان لەگەڵ ئەو بەرگری شارستانیانەدا کە لە نێوان جەماوەری موسڵماناندا بەرپا بووە دژ بە سیاسەتی بەجیهانییکردنی بەهاو دەزگا ڕۆژئاواییەکان. لەم ڕاستایەدا چەند پرسیارێك دەوروژێت لەوانە: ئایا ئەم دیاردەیە ڕەنگدانەوەی ڕووبەڕووبونەوەیەکی مێژوویی ڕەگ داکوتراوە لە بەرهەڵستیکردنی کولتوری کۆمەڵایەتییدا؟ یان تەنها ئەنجامێکی لۆژیکییە بۆ شێوازێکی سلوکی موحافیزکارانە؟ یان ئایا تەنها مەیلێکی سەرکەشانەیە بۆ دەستگرتن بە بەها کۆن و خاوێنەکانەوە وەك فۆکۆ یاما[١٢] دەڵێت،

---

[١٢] ژیانەوەی ئوسولیەتی ئیسلامیی کە لە دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئێرانی لە ١٩٧٨-١٩٧٩دا سەری هەڵداوە، بۆ ئەوە نەهاتووە تەعبیر لە (بەها کلاسیکییەکان) بکات لە سەردەمی مۆدێرنیزمدا. ئەو بەهایانە چاك و خراپیان لە سەدەکانی ڕابردوودا بزربوون، بەڵام بزاڤی ژیانەوەی ئیسلامیی هاتووە بۆ

یان ڕەنگدانەوەی ژیانەوەیەکی کاتیی و ڕووکەشیەوە و بەستراوە بەو ماڵ و سامانەوە کە لە وڵاتانی نەوتەوە دێت، وەك (دانیاڵ بایبس)[١٣] جەختی لەسەر دەکاتەوە؟ لە دواییدا ئایا تیۆرەکانی مۆدێرنیزم دەتوانن بە بەکارهێنانی شیکاری بینائی و وەزیفی، تەفسیری ئەم دیاردەیە بکەن؟

ئەو شیکردنەوانەی کە لەسەر ئەو گریمانەیە دەکرێن، گوایە هەوڵەکانی ژیانەوەی ئیسلامیی تەنها شێوەیەکە لە بەرگرییکردن و ناڕەزایی دەربڕین، شکستیان هێناوە لە پێشکەشکردنی لێکدانەوەیەکی بڕواپێکراو بۆ بوونی پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕی توندوتۆڵ لە نێوان مۆدێرنیزم لە لایەکەوە و بزاڤی ژیانەوەی ئیسلامیی لەلایەکی ترەوە، هەروەك ئەو شیکردنەوانە سەرکەوتوو نەبوون لە لێکدانەوەی پاڵنەرە دەروونییەکانی پشت شێوازە سلوکییەکانی کەسێتی موسڵمان، جگە لەوەش ڕۆشنبیرە هەوادارەکانی ڕۆژئاوا لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا شکستیان هێنا لە پەراوێزخستنی بەها ئیسلامییەکان و دوورخستنەوەیان لە ژیانی کۆمەڵایەتیی کردارییدا، ئەو شکستە خەسڵەتە بنەڕەتییەکەی ڕووبەڕووبوونەوە

---

دڵنیاکردنەوەی هەندێ بەهای کۆن کە لەوانەی ڕابردووی دوور و بڵاوبوون زیاتر خاوێن و ڕوونترن. نە لە دوور و نە لە نزیکەوە پەیوەندییەکیان بە (بەها کلاسیکییە) پڕوپووچەکانەوە نییە کە لە ڕابردووی نزیکدا دەرکەوتوون، هەروەها هیچ پەیوەندییەکیان بەو بەها ڕۆژئاواییە لاوازانەشەوە نییە کە بەزۆر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چێنراون. لەم سۆنگەیەوە ئوسولیەتی ئیسلامیی خۆی بەدوور دەگرێت لە هاوڕێککردنی ڕووکەشییانە بە فاشیزمی ئەوروپیشەوە)). (فۆکۆ یاما، ١٩٩٢: ٢٣٦).

١٣ ((تا پلەیەك بزاڤی ژیانەوەی ئیسلامیی بەتەواوەتی پشت دەبەستێت بە ژیانەوەی ئابووریی تەریب بە دۆزینەوەی نەوت، ئەوە تەنها سەرابێکە و پاڵنەرە یاساییەکان و بزاڤەکانی سەربەخۆیی لە ناوچەکەدا هاندەری بووە لە دەیەی حەفتاکاندا بە هۆی دەستبەسەرداگرتنی هەندێ ڕژێمی ئیسلامیی بەسەربڕی زۆر گەورە لە داهاتی نەوت، ئەگەرچی هەندێ ڕژێمی تر هەوڵیاندا بۆ سوودوەرگرتن لەو هەرا و هورایایەی کە داهاتە نەوتییەکان هێنایانە کایەوە بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە. بەڵام نە ئەو ڕژێمانە و نە ئەوانی تریش توانای مانەوەیان بۆ ماوەیەکی درێژ نییە)) (١٩٨٣: ٢٣٥).

ژیارییەکەی خستەڕوو، مەسەلەکە تەنها پەیوەست نییە بە بنەما سلوکیە پارێزکارییەکانەوە، چونکە نوخبە فیکریی و ڕۆشنبیرییە هاوسۆزەکانی ڕۆژئاوا لە هەموو گردبوونەوەکان تاڕادەیەك ڕەچاوی بەها پارێزکاریەکان دەکەن لە ناوخۆی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان خۆیاندا. جەماوەرە موسڵمانەکە تێدەکۆشێت لەپێناو هێنانە کایەی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی نوێخوازیی زیاتر لە هەوڵدانی بۆ خاوێنکردنەوەی ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لە هۆکارەکانی گەندەڵیی و بەرەڵایی، ئەو تێبینیە بەسەر زۆربەی ڕژێمە سیاسییەکانی وڵاتانی ئیسلامییدا جێبەجێ دەبێت، هەرئەوەش بە ڕوونی ڕەچاو دەکرێت لە سلوکیاتی نوخبەکاندا لەو کۆمەڵگە موسڵمانانەدا کە ـ تاچەند دەیەیەکی کەمی ڕابردوو ـ لە هەموو لایەك زیاتر دەمارگیر بوون بۆ بە عەلمانیەت، ئەو حاڵەتە لە هەریەك لە تورکیا و جەزائیر و تونس دا ڕەچاو دەکرێ. ئارەزووی گۆڕین لەناو میرنشینە تەقلیدیەکانی ناوچەی کەنداودا تێبینی دەکرێت و هەروەها لای ڕژێمە دیکتاتۆرە عەرەبیەکان و کۆمارە سۆشیالیستییەکانی پێشوو لە ئاسیای ناوەڕاست. ئەوەی کە شیاوی گرنگیپێدانە ئەوەیە کە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان کە هانی دیموکراتییەت و کرانەوە دەدەن لە ناوچەکانی تری جیهاندا، زۆر پەرۆشن لەسەر مانەوەی ئەو بەها پارێزکارییانە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، لەبەر ئەو هۆکارانە هەموو، گرنگە دیراسەی ئەو هۆکارە ڕاستەقینەیە بکرێت کە لە پشت بەرەنگاربوونەوەی ژیارییەوەیە، کە نهێنی سەرکەوتنی بنەماکانی شارستانێتی ئیسلامیی لێکدەداتەوە بۆ مانەوە و بەرهەڵستیکردنی هێرشەکانی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوایی، ئەوەش پێویستە لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا ئەنجام بدرێت و تا دەکرێ دووربخرێتەوە لە ڕەوانبێژی گوتاری سیاسیی. دوژمنایەتی و پێکەوە نەگونجان لە نێوان شارستانێتی ئیسلامیی و شارستانێتی ڕۆژئاوادا تەنها هەڵقوڵاوی هۆکارە سیاسیی و مێژووییەکان نییە، بەڵکو دوو مەسەلەن کە سەرچاوەیان لەو ڕاستییەوە وەرگرتووە کە شارستانێتی هەریەکەیان لەسەر ڕوئیایەك بۆ جیهان دامەزراوە کە بەدیلە بۆ ئەو ڕوئیایەی کە شارستانێتییەکەی تری لەسەر دامەزراوە. جیاوازییە

مێژوویی و سیاسیی و دەزگاییەکان تەنها هۆکاری تەواوکارن بۆ ئەو تێڕوانینە جیاوازەی کە لە لایەن هەریەك لەو دوو شارستانێتییەوە وێنای جیهانی پێدەکرێت[(١٤)].

ئەو شیکردنەوەیەی کە ئێمە پێشنیازی دەکەین، دەروازەیەکی بەدیل و تێڕوانینێکی پێچەوانەیە بۆ نموونەی مۆدێرنیزم کە وەها سەیر دەکرێت ئەو هێزە بنەڕەتییەیە کە تا کۆیی مێژوو بەردەوام دەبێت، دەکرێ خاسیەتە بنچینەییەکانی ئەم پێشنیازە بەدیلە لە میانەی شیکردنەوەیەکی بەراوردکارییدا بۆ نیشاندەرە سەرەکییەکانی قەیرانە ژیاریەکەی نموونەکەی مۆدێرنیزم بخرێتە ڕوو، وەك یەکێك لە دەرەنجامەکانی شارستانێتی ڕۆژاوا. سەرمایەداریی و سۆشیالیزم، بەوپێیەی دوو شێوازی جیاوازن و لە یەك باکگراوندی فەلسەفیەوە هەڵقوڵاون، هەوڵیاندا جەماوەرە موسڵمانەکە ناچار بکەن لەسەر گۆڕینی کەلەپووری فەرهەنگی مێژوویی خۆی لە ڕێگای جێبەجێکردنی چەند ڕیفۆرمێکی دەزگاییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ناسنامە بەهێزەی کە بنەما فەلسەفیەکان چاندوویانە، توانای خۆی سەلماند بۆ مانەوە و بەرەنگاربوونەوەی ئەو فۆڕمە تازانەی کە بە زۆر دەسەپێنران، هەر ئەوەش باڵادەستی ڕۆح و جەوهەری ناوەکی نموونەی ئیسلامیی بەسەر شێواز و نموونە کۆمەڵایەتییە دەرەکییەکاندا دەسەلمێنێت کە هەوڵ دەدەن ئەو ڕۆح و جەوهەرە ڕەش بکەنەوە.

**أ- هوشیاریی وجودی ئیسلامیی وەك دەروازەیەکی بەدیل:**

یەکگرتنی ناوخۆیی لە بینای عەقیدەی ئیسلامیی و بەجێهێنانە کۆمەڵایەتییەکانیدا، ئەنجامێکی سروشتی پەیوەندییە ئاڵوگۆڕەکانە لە نێوان

---

١٤ دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ شیکردنەوەیەکی بەراوردکاریی گشتگیر کە پەیوەستە بە کارتێکردنەکانی (سەرنجە ئەلتەرناتیڤەکان بۆ جیهان) لەسەر تێڕوانینە سیاسییەکان لە کتێبی (نموونە ئەلتەرناتیڤەکان کارتێکردنەکانی ئیسلام و عەرەب لەسەر جیهان و پەیوەندییان بەتیۆری سیاسییەوە)) (نووسەر: ١٩٩٤).

تێڕوانینە وجودیی و مەعریفی و ئەخلاقی و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا. بەجێهێنانی ئەو پەیوەندییە ئاڵۆگۆڕە ـ لە لایەنی ناوەڕۆکی تیۆری و شێوازی کۆمەڵایەتیی و پراکتیکیەوە ـ خەسڵەتێکی دینامیکی بێوێنە دەبەخشێت بە شارستانێتی ئیسلامیی، چونکە دوو پاڵنەری دەروونیی، بنەڕەتیی لای کەسایەتی موسڵمان هەیە لە بارەی پەیوەندیی بە ژینگەوە: ئەم کەسایەتییە تەنها هەوڵ نادات بۆ بیناکردنی گونجاوترین ژینگەی کۆمەڵایەتیی لە ڕوانگەی دەزگاییەوە، کە دەکرێ شێوازێك لە زیندوویێتی کولتووریی دروست بکات، هاوکار بێت لە بەدیهێنانی باڵادەستیی و سەروەریی شارستانێتی ئیسلامییدا، ئەگەر لە شارستانێتییەکی تردا سەروەریی پشت بەستوو بێت بە هێز، ئەوا کەسایەتیی موسڵمان هەوڵ دەدات پارێزگاریی لە بنەما تیۆریەکانی سیستمی عەقیدەی ئیسلامیی بکات، بەوپێیەی کە بنەمایە بۆ دینامیکیەتێکی کۆمەڵایەتی کە دەتوانێت بەدیلێك بۆ بینای هێزە باڵا دەستەکە دابین بکات. بەهەر حاڵ، کەسایەتیی موسڵمان هەرگیز ئارەزوو ناکات شەرعیەت بە سیستەمێك بدات لەسەر حسابی سەلامەتی بینای تیۆریی.

بنەماکانی ئەم شێوازە سلوکیە دەگەڕێتەوە بۆ هۆشیاری وجودی تاکی موسڵمان، ئەو هۆشیارییەی کە متمانە بە خۆی بەهێز دەکات، بەهۆی ئەو ئیدراکە زاتییە بەهێزەی کە هەیەتی، جگە لەوەش، ئیدراکی زاتیی کەسێتیی موسڵمان بەو سیفەتەی نموونەیەکی شارستانیانەی ڕەسەنە، بەشێکی تەواوکارە کە مۆرکێکی دەروونیی وجودی هەیە بۆ ڕێبازێکی دیارییکراو لە وێناکردنی زاتی خوداو مرۆڤ و سروشت. تێڕوانینی قورئانیی بۆ مرۆڤ و پێگەی لە بونیاد و پەیوەندیی لەگەڵ خودا بەو سیفەتەی کە بەدیهێنەری سروشتە، دوو مەسەلەن کە بەشێوەیەکی ئیجابیی کار لە هۆشیایری تاك دەکەن، لە پاڵ ڕێکخستنی پەیوەندیی مرۆڤ بە مرۆڤەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا. قورئانی پیرۆز بە ڕۆشنیی پێگەی وجودی مرۆڤ لەناو سیستمێکی پلەبەندی ڕێکخراودا دیاری دەکات بۆ چەمکی یەکتاپەرستی. ڕیزبەندیی وجودیی و ڕووەکانی جیاکاریی لە نێوان مرۆڤەکان و دەسەڵاتی خواییدا، هەموویان چەند

**چەمکێکن کە قورئان بە ڕۆشنیی و بە جددیی جەختی لەسەر کردوون لە چوارچێوەیەکی بەرز لە جەختکردنەوە لەسەر یەکتایی خودای پەروەردگار. بەهەرحاڵ ئەو جەختکردنەوەیە لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار، هیچ کاتێك نابێتە هۆی پەراوێزخستنی مرۆڤ، بەو سیفەتەی کە بوونەوەرێکی عاقڵە و توانای وردبوونەوەی لە گشت دروستکراوەکانی تردا هەیە))[١٥].**

**لەسەر ئەوەی کە لە پێشەوە باس کرا، وێناکردنی شۆڕشگێڕانەی قورئانیی ـ لە ڕوانگەی تەوحیدییەوە ـ ڕۆڵی وجودی مرۆڤ و پێگەی لەم زەویەدا، هەموو ئەوانە هۆشیارییەکی گەردوونیی و خاوەن سروشتێکی هاوسەنگ و پێکەوە گونجاو دەخوازن، بەڵام وێنە زیادەڕەوەکان لە وێناکردنی ئەم هۆشیاریەدا وەك ئەوەی باس لە یەکێتی بوون (وحدة الوجود) (واتە هەموو شتەکان لەگەڵ خوادا یەکدەگرن)، یان چوونە ناو (الحلولیة) (واتە خوا لە جەستەی هەموو شتێکدایە)، یان (الذات الکلیة)**

---

[١٥] فەزلوڕڕەحمان (١٩٦٧:١) باری میحوەری مرۆڤ ڕوون دەکاتەوە لە چوارچێوەی قورئانییدا بەم شێوەیە: ((ڕێنماییەکانی قورئان بە تەواوی ئامادەسازن بۆئەوەی بێنە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەو ڕێنماییانە چرایەکی ڕووناککەرەوە بۆ مرۆڤ دابین دەکەن. لەبەر ئەوە قورئان هیچ بایەخێك بە لاهوتیەتی خەملاّندنی ڕووتکراوە نادات. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە قورئان هەندێ بەهای لاهوتی و گەردوونی و دەروونیی تێدایە، بەڵام ئەوانە هەموویان چەمکی شیاوی پراکتیکن و دانراون بۆئەوەی کارئاسانیی بۆ مرۆڤ بکەن بۆ ڕێگای ڕاست، بە پلەیەکی ئەخلاقی گونجاو ڕێکخراون و بەتایبەتی ئامادەکراون بۆ پێکەوەگونجان لەگەڵ مەبەستێکی دیاریکراودا. لەبەر ئەوەیە چەمکی قورئانیی بۆ زاتی ئیلاهیی بەردەوام چەمکێکی کرداریی ڕووت دەبێت و بەهانەیەکی نارەوایە بەرامبەر بە قورئان ئەگەر بوترێت قورئان ناکۆکە لەگەڵ بەهاکانی ڕاستی و فەزیلەتدا. لە کاتێکدا قورئان دان بەوەدا دەنێت کە بەهاکانی ڕاستی -تەنانەت ئەوانەشی کە پەیوەندیدارن بە زاتی ئیلاهییەوە- بەهایەکن کە پێویستیان دەبێت بەوەی ژیریی لێیان تێبگات و لایەنی سەرکەوتنیان لە بەرهەمهێنانی سیستمێکدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری جیهان دیراسە بکات. لەبەر ئەوە نابێ هیچ کەسێك شۆك بیگرێت، کاتێك پێمان وت لەگەڵ ئەوەی وشەی (الله) لە قورئاندا زیاتر لە شەش هەزار شوێندا باسکراوە (لە پاڵ ناوهێنانی ناوەکانی تردا وەك الرحمن، الرب)، بەڵام هەموو لێدوانەکانی قورئان لە دەوری خولگەی مرۆڤ دەسوڕێنەوە کە ئامانجی مەرکەزیی قورئانی پیرۆزن)).

**(واتە هەموو بوونەوەرەکان لەگەڵ خوادایەك زاتن)، هەروەها ماددیەت، بەو شێوەیەی لە کەلەپووری ڕۆژئاوایی لاهوتی و فەلسەفی دا دەردەکەوێت، ئەو جۆرە دارشتنانە نەیانتوانیوە بگەنە ئەوەی کە چەمکی قورئانیی دەیەوێت لە هاوسەنگیی و پێکەوەگونجان و پلەبەندی بوونەوەرەکاندا، ڕۆڵی وجودی ڕۆشنی مرۆڤ و پێگەی لە میانەی پڕۆسەی تیۆریزەکردنی نموونە ئیسلامیەکەدا بە چاکی ڕەچاوکراوە بەو سیفەتەی شێوازێکی ڕۆشنبیریی تاقانەیە و پشت بەستووە بە ڕێسا خۆرسکە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤەکان[١٦].**

**دەکرێ شیکردنەوەیەکی بەراوردکاری بکەین لە نێوان ئیدراکی زاتیی ئیسلامیی لە ڕوویەکەوە و هاوشێوە ڕۆژئاواییەکەی لە ڕوویەکی ترەوە، بەکارهێنانی کۆمەڵە پێوەرێکی سەرنجڕاکێش کە (گاتنگ، ١٩٩٥: ١١) پێشکەشی کردووە کە پەیوەستن بە خاسیەتەکانی مەیلی ناسیۆنالیزمی ئەورووپی، دەڵێت ئەو خاسیەتانە ئەمانە دەگرێتەوە (شوێن: مەبەست لێی ناوچەی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئەمریکای باکوورە کە ناوەندی جیهان پێکدەهێنن، بەڵام ئەوەی کە دەمێنێتەوە چێوە دەرەکیەکەی دەنوێنێت، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ناوەندەکە بزوێنەری یەکەمە، هەروەها کات: وادادەنێت کە پڕۆسە کۆمەڵایەتییەکان کە لەناو چوارچێوەکەدا پەیدا دەبن، بە**

---

[١٦] موحەممەد ئیقبالْ (١٩٨٨، ٩٥) سێ لایەنی تاقانە و تایبەتمەندی مرۆڤ لە ئاماژەکردندا بۆ ئایەتە قورئانییەکان دەستنیشان دەکات، بۆ نموونە ئەو ئایەتەی کە دەڵێت مرۆڤ دروستکراوێکی هەڵبژاردەیە لەم ئایەتەدا: (ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى) (طه: ١٢٢). هەروەها مرۆڤ جێنشینی خودایە لە زەویدا لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانیشیدا: (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الَارْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ) (البقرة: ٣٠) هەروەها ئەم ئایەتە: (وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ الَارْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ) (الأنعام: ١٦٥). هەروەها مرۆڤ ئیرادەیەکی سەربەست و بەرپرسیاری هەیە لە کردار و هەڵسوکەوتەکانی: (إِنَّا عَرَضْنَا الَامَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالَارْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً) (الأحزاب: ٧٢).

یەك ئاڕاستەیە، واتە لە خوارەوە بۆ سەرەوە و بەبێ ڕاوەستان، بەڵام لەگەڵ ئەگەری سەرهەڵدانی هەندێك ئاستەنگدا کە پێویستە بەسەریاندا زاڵ ببن، بۆ گەیشتن بە دەرەنجامی ئیجابیی. مەعریفە: مەبەست لێی ئەوەیە کە تێگەیشتن لە جیهان دەکرێ لە ڕێگەی ژمارەیەك ڕەهەندی سنووردارەوە و لە کۆتایی دا دەکرێ دەرکی جیهان بکرێت لە ڕوانگەیەکی تاك ڕەهەندیی وەك تیۆری ئەتۆمیی، یان تیۆری ئەنجامگیرییەوە. مرۆڤ و سروشت: کە مرۆڤ سەروەر و خاوەنی سروشتە. مرۆڤ و خودا: بەدڵنیایی کە مرۆڤ ملکەچە بۆ خودا، یان بۆ هەندێك بیروباوەڕی ئایدۆلۆژی. مرۆڤ و مرۆڤ: کە مرۆڤێك زاڵ دەبێت بەسەر یەکێکی تردا و بواری ڕیزبەندی هەیە لە نێوان مرۆڤەکاندا لەسەر ئاستی تاك و چینایەتی و نەتەوەیی. هەروەها هەندێك مرۆڤ هەن کە لە هاوشێوەبوون و یەکسانبووندا لە پلەیەك بەرزتردان، لەوانی تر))، هەروەها گالتنگ وادادەنێت کە ئیدراکی زاتیی لە تێڕوانینی ڕۆژئاواییدا بەدی نایەت تا ئەو شەش مەرجەی کە باسکران، دابین نەبن.

ئێستا ئەگەر سەیری بنەما بەدیلەکان بکەین کە نموونە ئیسلامییەکەی لەسەر ڕاوەستاوە، دەبینین هەندێك چارەسەر بۆ ڕەهەندەکانی قەیرانەکەی نموونەی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوایی پێشکەش دەکات، ئەو سیمەتە گشتییەی کە نموونە ئیسلامییەکە جیادەکاتەوە، پێش هەموو شتێك یارمەتیی دەدات بۆ بەدیهاتنی ئیدراکێکی بەهێز و هۆشیاریەکی جیهانیی، ئەو ئیدراککردنەش یەکێکە لە سیمەتە جەوهەرییەکانی تێڕوانینی شارستانیانە. خۆ ئەگەر پێوەرەکانی (گالتنگ)ی پێشتر باسکران جێبەجێ بکەین، تێبینی دەکەین کە ئاڕاستە ئینسانیە ئیسلامییەکە چەندین تایبەتمەندیی جیاوازی هەیە، بە بەراورد لەگەڵ ئاڕاستە ڕۆژئاواییە ئەورووپییەکەدا.

بۆ چەمکی (شوێن)، تێڕوانینی ئیسلامیی لەسەر بنەمای ئەم ئایەتە قورئانییە (وَلِلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) (البقرة: ١١٥)، بۆیە لێرەدا زەوی دابەش ناکرێت بۆ ناوەند و پەراوێز، کە ناوەند جوڵێنەری کەم

بێت و پەراوێزیش لە هەموو شتێك بێبەش بكرێت، تەنها باوەڕهێنان سەنتەری ڕۆحی گەردوونە كە ناوەندێكی ماددیی جوگرافیی نییە سنووری بۆ دیاری بكات، بەڵام چەمكی (كات)، ئەویش پەیوەستە بە خولی چالاكیی كۆمەڵایەتییەوە و پەیوەندیی بەهێزی هەیە لەگەڵ چەمكی ڕاستی (الحق) و چەمكی ناڕاستی (الباطل)، بۆیە دەكرێ بەردەوام ئەنجامی سەلبیی و ئیجابیی ڕووبدات، هەروەك لەگەڵ، هەبوونی سەرەتایەكی ئیجابیدا، ئەگەری ئەوەش هەیە بگاتە كۆتاییەكی ئیجابیی، بەڵام چەمكی (مەعریفە): ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە تێگەیشتن لە جیهان، پێویستە تەنها لە چوارچێوەیەكدا بێت كە سەرچاوەكانی مەعریفە لە سەرەنجامدا لەگەڵ یەك ناكۆك نەبن، بۆ پەیوەندیی (مرۆڤ لەگەڵ سروشت): تێڕوانینی ئیسلامیی جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە سروشت بەخششی خوایە و ئامادەكراوە بۆ ئەوەی مرۆڤ تێیدا بە باشترین شێوە بژی.

سەبارەت بە پەیوەندیی (مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ): بنەماكەی یەكسانیی تەواوە لە نێوان هەموو نەوەی ئادەمدا، چونكە هەموو یەك بنەڕەتیان هەیە بۆ بوونیان و كۆكردنەوەیان لەبەردەم خوای پەروەردگاردا، بۆیە هیچ بوارێك بۆ جیاكاریی و پلەبەندیی لە نێوان مرۆڤەكاندا نییە، چونكە ئەوە ناوەندێتی ئیمان لە ڕۆحانیەتی گەردوونیدا تێكدەدات. سەبارەت بە پەیوەندی (مرۆڤ بە خوداوە): دیارە كە پلەبەندییەكی وجودیی هەیە، مرۆڤ پەیوەست دەكات بە خوداوە و مرۆڤ دەكاتە خەلیفە و جێگەداری خودا لە زەویدا.

هەردوو ئیدراكی زاتیی بەهێزی كەسایەتی ئیسلامیی وەك تاك و زیندوێتی كۆمەڵایەتیی و بە كۆمەڵ لە مێژووی ئیسلامییدا، پشت بەستوون بەو ئیدراكە زاتییە خۆیەوە. موسڵمان پێویستی بە دەزگایەكی نێوان، یان میكانیزمێكی دیارییكراو نییە بۆ ئەوەی لە خۆی تێبگات و ئیدراكی زاتی خۆی پەرە پێبدات. تەنها بەوەی كە موسڵمان ئەو ئیدراكە زاتییەی خۆی دەستكەوت، پڕۆسەیەكی بەردەوام لە كردارەكان دەست پێدەكات كە نموونەی سلوكی كۆمەڵایەتیی دروست دەكات،

قەیرانی چوارچێوە دەزگاییەکە نابێتە هۆی دروستبوونی قەیران لە ئیدراکی زاتیی تاکدا بە مانا ڕووتکراوەکەی وەك لە نموونەی ڕۆژئاواییدا ڕوودەدات، چونکە ئەم ئیدراکە لای موسڵمان هەڵقوڵاوی خودی بوونە مرۆییەکەیە، نەك لە میانەی دەزگا و میکانیزمی دەستکردەوە بێت. ئەم شیکردنەوەیە بەسەر نموونەی مەسیحیەتی ئەوروپیدا بۆ ئیدراکی زاتیی جێبەجێ نابێت، هۆکاری ئەو پێکنەکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەموو ئەفسانە و ئاڵۆزییەی کە لە مەسیحیەتدا وەك بیرۆکەی سیانەی پیرۆز (الثالوث المقدس The Trinty)، بۆیە هەمیشە مرۆڤی ڕۆژئاوایی پێویستی بە دەزگایەکی وەك کڵێسا هەبووە، یان پرۆسەیەکی ڕێکخراوەیی فەلسەفی لە شێوەیەکی ئایدۆلۆژیدا، بۆ ئەوەی یارمەتی بدات بۆ دیاریکردنی ئیدراکە زاتییەکەی، لەبەر ئەوە هەر قەیرانێك لەو پرۆسە ڕێکخراوەییە، یان دەزگاییەدا ڕاستەخۆ و بەشێوەیەکی سەلبی بەسەر ئیدراکە زاتییەکەیدا ڕەنگدەداتەوە، خۆ ئەگەر ئەو ئالیەت و دەزگا دەستکردانە هەر سەرکەوتنێکیان بەدەستهێنا، ئەوا ڕاستەوخۆ دەگۆڕێت بۆ ئیدراکێکی زاتیی خۆبەزلزان، بەوشێوەیەی کە (رودبارد کیبلنج) لە ژێر دروشمی (باری مرۆڤی سپی)دا تەعبیری لێدەکات، هەر ئەوەش بوو بە هۆی نێرگسیبوونی ئیدراکی زاتیی دامەزراوە ئیستیعمارییەکان.

نموونەی ئەو فۆڕمە پەڕگیرانە بە ئاڕاستەی قەیرانەکان، یان بە ئاڕاستەی هەستکردن بە نێرگسیبوونی لەخۆبایی، مانەوە و بەردەوامبوونی بۆ نانووسرێت، ئەگەر لە چوارچێوەی ئیدراکی زاتی ئیسلامییدا خۆی ببینێتەوە. موسڵمانەکان ئیدراکی زاتیی بەهێزی خۆیان نەگۆڕی بۆ نێرگسیبوون، یان خۆبەزلزانین لە سەردەمەکانی زیندوێتی شارستانێتیاندا، لە سەرتاسەری مێژووی ئیسلامییدا، ئەوەبوو لە سەدەکانی یەکەمی مێژووی ئیسلامییدا موسڵمانەکان ـ لە ماوەیەکی کەمدا ـ هەڵسان بە دامەزراندنی سیستمێکی جیهانیی لە ژێر چەتری (دار الاسلام)دا، کە هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بە سیستمی کۆمەڵایەتی سیاسیی خێڵەکی کۆنەوە، هەمان شت دووبارە بوویەوە لە سەردەمی حوکمی عوسمانییدا لە سەدەی

شازدەهەمدا، کاتێك موسڵمانەکان گەمارۆی شارستانێتی ڕۆژئاوایان دابوو لە گۆشەیەکی سنووردراردا لە ئەوپەڕی ئەوروپادا.

دەرککردنی خودی باوەڕدار بە تاکێتی و جیاکاری کەسایەتی موسڵمان، ئەو هۆکارە سەرەکیەیە کە وا لە موسڵمانەکان دەکات پێویستیان نەبێت بە دامەزراندنی ڕێکخراوە تەبشیریەکان، بە پێچەوانەی کۆمەنیستەکان و هەروەها بەنسبەت دەستە و تاقمە جیاوازەکانی مەسیحیەتەوە، موسڵمانەکان بانگەوازی خەڵکیان دەکرد بۆ وەرگرتنی ئیسلام لە ڕێگەی جەختکردنەوەی چەمکی ئیسلامیی بۆ ئیدراکی زاتیی، لەبری توندکردنەوەی پێگەی کۆمەڵایەتیی، یان ئابووریی، یان سیاسی، یان تەنانەت شێوازێکی سلوکی دیاریکراو. لەبەر ئەوە موسڵمانەکان زۆر بە ئاسانی سەرکەوتوو دەبوون لە هاندانی غەیری خۆیان بۆ ئاوێتەکردنی توخمە دەروونییەکانی ئەو ئیدراکە زاتییە لە دەروونی خۆیاندا، بەڵگەش لەسەر ئەوە، لەگەڵ هەموو ئەو فشارە بەردەوامەدا کە دووچاری موسڵمانەکانی بۆسنە دەبوویەوە، وەك کۆمەڵێکی سلاڤی لە لایەن نەتەوە سلاڤیەکانی ترەوە، ئەوان توانیان پارێزگاری لە ئیدراکی زاتیی ئیسلامیی خۆیان بکەن، هۆکاری ئەوەش لەوەدا بوو کە ئیدراکی زاتیی ئیسلامیی توانای مانەوەی هەبوو بە مانەوەی بوونی جەستەیی و ڕۆحی هەر تاکێکی موسڵمان لە ڕۆڵەکانی بۆسنە.

بە کورتی دەتوانین بڵێین، کە قەیرانی ئیدراکی زاتیی لای موسڵمان کاتییە و هەرگیز ناگۆڕێت بۆ دیاردەیەکی هەمیشەیی، ڕاستە کە شکستی دامەزراوەیی و سیاسیی، هەستکردن بە تێکشکان دروست دەکات، بەڵام ئەو هەستکردنە لای موسڵمان ناگۆڕێت بۆ هەستێکی هەمیشەیی خۆ بەکەم زانین، هەروەها ناگۆڕێت بۆ وێناکردنێکی خود، وەك ئەوەی پێگەیەکی ئینسانی پلە دوو، بۆیە دەڵێین کە ژیانەوەی ئیسلامیی بەڕاستی ژیانەوەی ئیدراکی زاتییە لە دوای ئەو شڵەژانەی کە دروست بوو لە ئەنجامی باڵادەستیی ماددیەتی شارستانێتی ڕۆژئاوا لە سەردەمی نوێدا.

ئەلتەرناتیڤی ئیسلامیی بۆ قەیرانی ڕۆژئاوا لەم ئیدراکی زاتییەوە سەرچاوە دەگرێت بۆ فۆڕمێکی ئینسانیی نویێ، لە چوارچێوەی ئەم فۆرمەدا و لەسەر بنەمای ئەم دەرککردنە، مانای ئازادیی و مانای ئاسیشی وجودی دروست دەبێت، ئازادیی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تەنها حاڵەتێکی شوێنکەوتەی هێز نییە و بەس، بەڵکو حاڵەتێکی سروشتییە لە هۆشیاریی زاتیی، هەروەها تەنها دیاردەیەکی ڕێژەیی نییە کە بە یەکسانیی لەگەڵ خەڵکی تردا، یان بە زاڵبوون بەسەریاندا دیاریی بکرێت، هەروەك دەرەنجامی ململانێی بەهێز نییە لەپێناو بەرهەمهێنانی داهاتە سروشتییەکان بە ئامێر و ئامرازی پیشەسازی، بەڵکو لە بنەڕەتدا تەعبیرکردنە لە پێگەیشتنێکی ڕۆحیی کە مرۆڤ وا لێدەکات بتوانێت کۆنترۆڵی ئەنانیەتی خۆی بکات.

ئازادیی بابەتێك نییە لە بابەتەکانی هێز، بەقەدەر ئەوەی بابەتێکی هۆشیارییە بە خود و ناسینی خود، ئاسایشی وجودیش نایەتەدی جگە بە گۆڕینی ئەم چەمکە ڕۆحیەی ئازادی بۆ شێوازێکی ئەخلاقیی لە مومارەسەکردنی کۆمەڵایەتییدا، ئیمانی ئیسلامیی بیروباوەڕێکی چەقبەستووو نییە کە لە هێزێکی دەزگایی وەك کڵێساوە دەربچێت، چونکە گوتاری قورئانیی خۆی دەخاتە بەردەستی هەموو کەسێك بۆ خۆی، لەسەر نەتەوەیەك، یان گرووپێکی تایبەت، یان کۆمەڵەیەکی هەڵبژێردراو لە زانایان کورت نابێتەوە، بەوشێوەیە کەسێتی تاك بەهێز دەبێت و هۆشیاریی بە خۆی زیاد دەکات لە تێڕوانینیی ئیسلامیدا، کە چەمکی نەتەوەی هەڵبژاردە ڕەتدەکاتەوە بەو شێوەیەی کە یەهودیەت بانگەشەی بۆ دەکات لە ڕوویەکەوە، هەروەك بوونی کەسێتییەکی کەهنوتی میانەگیر قبوڵ ناکات، کە لەو ڕێگایەوە دەزگایەکی موقەددەس لەسەر بنەماکانی ئاینی حەزرەتی مەسیح و سیانەی پیرۆز (الثالوث المقدس) و کڵێساوە خۆی زاڵکردووە، لە ڕوویەکی ترەوە.

زۆر لە ڕاستی دوور ناکەوینەوە ئەگەر وتمان تیشکۆی بایەخپێدانی ئاسایشی وجودیی لە تێڕوانینی ئیسلامییدا بریتییە لە کەسایەتیی تاك و هۆشیاری زاتیی خۆی، گرنگیشە تێبینی بکەین کە ئیمان (بە مانای باوەڕهێنان) و ئەمان (بەمانای

متمانه)، هەموویان چەمکی قورئانیی سەرەکیین کە پەیوەستن بەو هۆشیارییەوە و هەمووشیان لە یەك ڕیشەی زمانەوانیەوە وەرگیراون. لەسەر ئەو بنەمایە ئیمانداران (المؤمنون)[17] بەو مانایەی کە ئاماژەیە بۆ باوەڕهێنان، ئەوانەن کە دەرك بە (الأمان الوجودي) دەکەن و پارێزگاریش لە (المؤمن المهيمن) خاوەن ئەمانی بالآدەست وەردەگرن، بەمانای ئاسایش و ئاشتی[18]. خوای گەورەش لە قورئاندا دەفەرموێت: (اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْلِيَآؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ) (البقرة: ٢٥٧).

ئەم باکگراوندە زمانەوانییە پێکەوە پەیوەستە، ڕەهەندێکی نەفسی و وجودی دروست دەکات بەو مانایەی کە چەمکێکی دڵنیایی (الاطمئنان) لە قورئاندا ئاماژەی بۆ دەکات: (الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) (الرعد: ٢٨).

بەم شێوەیە ڕوون دەبێتەوە کە چەمکی ئیسلامیی بۆ ئازادیی وەك ڕێگایەك بۆ ڕزگار بوون، ئەنجامی ئەو دڵنیابوونەیە کە پێویستی بە دەستوەردانی میانگیرێك نابێت کەسێك بێت، یان دەزگایەك، ئەم جۆرە تێڕوانینەش بێگومان ڕۆڵێکی پێشکەوتوو دەبەخشێت بە هۆشیاری لە کاتی بەراوردکردنی بە کۆمەڵگە و دەوڵەت،

---

١٧ وەك لە سورەتی (البقرة)دا هاتووە: (الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ* والَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ*أُوْلَـئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (البقرة: ٣- ٥) لە سورەتی (آل عمران)یشدا هاتووەکە: (فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ) (آل عمران: ١٧٩). هەروەها لە سورەتی (التوبة)دا: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (التوبة: ٧١).

١٨ وەك ناوە جوانەکانی نموونەی (المؤمن والسلام) وەك لەم ئایەتەدا هاتووە: (هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ) (الحشر: ٢٣).

ئەو دووەش ئەو دوو ئامرازەن کە دەتوانرێت ئازادیی و ئاسایشی بوونیان پێ بهێنرێتە دی.

عەلی عیززەت بیگۆڤیچ (سەرۆکی پێشووی بۆسنە) کە خۆی یەکێکە لەوانەی بڕوایان بە گرنگیی ڕۆڵی هۆشیاریی هەیە، سەرباری ئەوەش ڕۆشنبیرێکی دەرکەوتوو و سیاسەتمەدارێکی هاوچەرخ، ئەو ئەخاسیەتە بەوە وەسف دەکات کە دەڵێت: ((مرۆڤ بەرهەمی ژینگەکەیەتی، ئەمە بەڵگەنەویستی سەرەکییە لە ڕێبازی مادديەتدا و دەشێت بکرێتە خاڵی دەستپێکی گشت تیۆرە نائیسانیەکان کە لق و پۆپی ماددیەتن: لە یاسادا، لە زانستی کۆمەڵناسییدا، لە مومارەسەکردنی گەمەکردن بە مرۆڤەکان کە لە سەردەمی نازیزم و ستالینیزمدا گەیشتە چڵەپۆپەی، هەموو تێزەکانی تری هاوشێوە لە فریودانی و ئەوانەی کۆمەڵگە دەخەنە پێش تاکەکانەوە و جەخت دەکەنەوە لەسەر پابەندبوونی مرۆڤ بە خزمەتکردنی کۆمەڵگە و هەموو تیۆرەکانی تری لەم بابەتە، هەموویان لە هەمان خاڵی دەستپێکەوە دەردەچن، لای ئێمە ڕاست نییە مرۆڤ خزمەتکار بێت بۆ هەر مرۆڤێکی تر و نابێ بکرێتە ئامراز، بەڵکو پێویستە هەموو شتێك بخرێتە خزمەتی مرۆڤەوە، مرۆڤ تەنها خزمەتکاری خودایە و بەس، ئەوەش مانای ڕەهایە بۆ ئینسانیەت)). (عەلی عیززەت بیگۆڤیچ، ١٩٩١: ٣٩-٤٠).

ئەم درککردنە زاتییە ڕێگر بووە لە بەردەم لەناوچوونی کولتووری ئیسلامییدا لە کاتی پرۆسەی بەجیهانیکردنی نموونەی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاواییدا، چونکە ئەم دەرککردنە بەشداریی کردووە لە بڵاوکردنەوەی هەستێك لەنێو موسڵمانانەدا بەوەی کە پەیامێکی تایبەتیان هەیە و پێویستە بیگەیەنن و نابێ هیچ هۆکارێکی تر ڕێگەی لێ بگرێت. فۆکۆ یاماش دانی بەو ڕاستییەدا ناوە کە دەڵێت: ((ئیسلام توانیویەتی ئایدۆلۆژیایەکی توندوتۆڵی خاوەن سیستمێکی لەیەکچوو دابمەزرێنێت، هەروەك لیبراڵیزم و کۆمۆنیزم، ئەوەش بە هۆی ئەوەی کە ئیسلام دەستوورێکی ئەخلاقییە و چەندین بنەمای سیاسیی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی هەیە))، لە ئەنجامی ئەوەدا

((قبولکردنی ئیسلام ئەگەرێکی شاراوەیە لەسەر ئاستی جیهانیی و توانیویەتی بگاتە هەموو مرۆڤەکان، نەك تەنها ئەندامانی کۆمەڵێکی تایبەت، نەتەوەیی، یان ئەتەنی)) (١٩٩٢: ٤٥). ئەمەی کە فۆکۆ یاما ئاماژەی بۆ کردووە، ناکۆکە لەگەڵ ئەوەی کە وەسفی بزاڤی ژیانەوەی ئیسلامیی دەکات، بەوەی کە تەنها جۆرێکە لە سۆز و گەڕانەوە بۆ دڵنیاکردنەوەی بەها کۆنەکان.

به ڕای ئێمە هۆکاری وێناکردنی ئیسلام وەك دوژمنێك، دەگەڕێتەوە بۆ لایەنگیری دەروونیی پێشوەختە کە جیهانی ڕۆژئاوای گرتۆتەوە، چونکە پابەندبوونی موسڵمانان بە ئیدراکە زاتییەکەی خۆیانەوە، توانیویەتی فراوانخوازیی ئیستیعماریی هەڵوەشێنێتەوە کە پشتی بەستووە بە ئاڕاستەی ناسیۆنالیزمی ئەوروپییەوە، هەروەها بیرۆکەی هەڵە لە بارەی ئوسوڵیەتی ئیسلامییەوە و وێناکردنی وەك دوژمنێکی ئامادە، ئەو بیرۆکەیە مەبەست لێی پەراوێزخستنی موسڵمانەکان و تێکشکاندنی ئیرادەی ڕەتکردنەوەیان بۆ هەیمەنەی ئیستیعماریی بوو بە لەناوبردنی ئیدراکی زاتیان، چونکە بەپێی نموونەی مۆدێرنیزمی ناسیۆنالیزمی ئەوروپی، هەموو ڕەگەزەکانی تری جیهانی ناڕۆژئاوایی، پێویستە سەروەری و باڵادەستی ڕۆژئاوا بەسەر خۆیاندا قبوڵ بکەن، ئەم مەسەلەیەش لە ڕوانگەی فرەییەوە پاساوی نییە، وێنەی ئەم لایەنگیرییە لەوانەیە ڕێگر بێت لە بەردەم گەیشتن بە تێگەیشتنێکی ئاڵوگۆڕ لە نێوان هەردوو شێوازەکەی ئیدراککردندا، دوای ئەو بومەلەرزە توندەی دووچاری نموونەی مۆدێرنیزم بووە، ئیدراکی زاتیی ئیسلامیی– کە پشتگیری بەرگرییکردنی جەماوەری موسڵمان دەکات دژ بە ئاڕاستەی فراوانخوازی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوایی بە بەهێزکردنی شوناسی خۆیان ـ دەتوانێت تێڕوانینێکی جیاواز ـ پێشکەش بکات بۆ تێپەڕاندنی قەیرانی ئێستای مۆدێرنیزم.

هیچ گومان لەوەدا نییە کە فراوانبوونی ئیسلامیی لە سەدەی یەکەمی دەرکەوتنیدا، موعجیزەیەکی مێژوویی و سیاسیی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا موعجیزەی

ڕاستەقینەی سیستمی عەقیدەی ئیسلامیی، خۆی لە داڕشتنی ئیدراکی زاتیی و بیناکردنی کەسێتیی تاکی موسڵماندا دەنوێنێت، کە بووەتە هاندەرێکی دەروونیی و کۆمەڵایەتیی بۆ زیندوێتی شارستانێتی ئیسلامیی، بەڵام شکستی ماددیی کە لە بەرامبەر فۆڕمە نوێکەی شارستانێتی ڕۆژئاوادا ڕوویداوە، ئەو شکستە پاڵی ناوە بە هەندێك لە بیرمەندە موسڵمانەکان بۆ پەرەپێدانی فۆڕمێکی تێکەڵە، یان ساختەکراو لە میانەی پرۆسەی بەڕۆژئاواییکردندا، لەگەڵ ئەوەشدا شارستانێتی ڕۆژئاوا شکستی هێناوە لە بەرهەمهێنانی هۆشیارییەکی زاتیی بەتوانا لەسەر جێگرتنەوەی شوێنی ئیدراکی زاتی ئیسلامیی کلاسیکی. دوای ئەو شکستەی کە ئەو ناسنامە سەپێنراوانەی لێکەوتەوە، بزاڤی ژیانەوەی ئیسلامیی ئەمڕۆ لە قۆناغی ڕابووندایە دوای دووبارە دۆزینەوەی ئیدراکە زاتییەکەی[١٩].

ئیدراکی زاتیی و هۆشیاری وجودیی، هەردووکیان دەروازەیەك پێشکەش دەکەن بۆ دەرچوون لە قەیرانە وجودیەکەی ڕۆژئاوا، ئەم هۆشیاریە ئەوەندە توانای هەیە کە ئامادەکاریی بۆ بکات بۆ ئەوەی ببێتە بنەمایەك بۆ زیندوێتی شارستانێتییەکی

[١٩] چەمکەکانی (الهویة والادراك الذاتي)م بەکارهێناوە وەك حاڵەتی جیاوازی هوشیاریی، لەبەر ئەوە جیاوازییەکانی نێوانیان لە هەمان ڕستەدا دادەنێم. لەوانەیە (الهویة) ببینیت وەك شێوازێکی دانانی کۆمەڵایەتی بە خود (الذات) کە بوونی دوولایەن دەخوازێت. بەڵام (الادراك الذاتي) وەك هوشیارییەکی پوخت و تاقانە دەمێنێتەوە. لەوانە (هویة) ناسنامەیەك لە لایەن دەسەڵات یان حکومەتەوە بەزۆر یان بە ئارەزوومەندانە بدرێت، لەبەر ئەوە وەك هۆکارێکی هەرەمەکی و شوێنکەوتەیەکی دروستکراو شوێنی هۆکارە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی تر دەکەوێت. بۆ نموونە کاتێك دەوڵەتی یوگسلافیا ناسنامەی دا بە هاوڵاتیانی، پەیوەست بوو بە سیستمی سیاسیی ئەو سەردەمەوە، بەڵام کاتێك ئەو سیستەمە هەڵوەشایەوە، ناسنامە ڕاستەقینەکانیان جارێکی تر هاتنە سەر ڕوو وەك ڕەنگدانەوەی ئیدراکی زاتیی ڕیشەداری خۆیان. بەم شێوەیە ئیدراکی زاتی ناسنامەی گونجاوی خۆی لەگەڵدایە، بەڵام پێچەوانەکەی هەمیشە ڕاست نابێت. لەوانەیە ناسنامە بگۆڕێت بۆ ئەوەی ببێتە ئیدراکی زاتی لە حاڵەتێك ئەگەر بگونجێت لەگەڵ توخمە ناوەکییەکانی پێکهێنەری کەسایەتیدا.

نویٚ، وەك لە بەشی داهاتوودا ڕۆشنی دەکەینەوە، قەیرانی جیهانی ئیسلامیی لەو پرسیارەوە پەیدا بووە کە پرسیار لەبارەی بەدیهاتنی ئەو ئیدراکە زاتییەوە دەکریٚ لە بواری جێبەجێکردنی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییدا، لەبری ئەوەی باس لە خودی ئیدراکە زاتییەکە خۆیەوە بکرێت.

ب ـ پێکەوەگونجانی مەعریفی: هاوسەنگی نێوان سەرچاوە مەعریفیە ڕەها و ڕێژەییەکان.

سیستمی مەعریفیی ئیسلامیی (Islamic epistemology) لە گریمانەیەکی بنەڕەتییەوە دەردەچێت کە هەموو سەرچاوەکانی مەعریفە هەرچەندەبن، بەڵام پێکەوە دەیانکریٚ و گونجاون لەگەڵ بنەما بەرزەکەدا کە بنەمای یەکتاییە (مبدأ التوحید). ئەوەش پەیوەندییەکی لۆژیکیی وێناکراوە لە نێوان هۆشیاریی یەکتایی لەسەر ئاستی وجودیی، لەگەڵ ئەو پێکەوەگونجانە مەعریفی و هاوسەنگییەی کە ئەو ڕاستییە جەختی لەسەر دەکاتەوە، کە دەڵێت سەرچاوەکانی مەعریفە هەرچەندە زۆربن، بەڵام دوا مەرج بۆ مەعریفەی گشتیی و تەواوەتی خوای پەروەردگارە. یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە ناوی (العلیم)ـە کە لە قورئاندا لە سورەتی (سبأ) و لە سورەتی (الانعام)دا بە چەند مانایەك هاتووە، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لە ڕووی لۆژیکیی و تیۆرییشەوە جیاکردنەوە لە نێوان ئاڕاستەی گشتیی مەعریفە و ئاڕاستەی گشتیی وجوددا ئەستەمە[٢٠]، بە پێچەوانەوە بەعەلمانیکردنی مەعریفە کە ڕۆژئاوا لە مێژووی فکری خۆیدا زانیویەتی.

---

[٢٠] هەموو ئەو چینانە کە لە تیۆرە کلاسیکییەکانی مەعریفەدان و لە کاتی دارِشتنەوەی نموونەی ئیسلامییدا گەشەیان کردووە، بە تەواوەتی دەردەکەون. (البغدادي، ١٩٨١: ٣٤) پێناسەی جیهان دەکات بەو سیفەتەی کە ((هەموو بوونەوەرێکی خاوەن مەعریفە و ئیدراکی هەستی))یە. (الزمخشري) پێناسەی دەکات و دەڵێت: ((کۆی گشتی تەنەکان -ماددەکان- و ڕووداوەکان کە پەروەردگار مەعریفەیەکی

جیاکردنەوەی جۆری لە نێوان سەرچاوەکانی مەعریفەدا لە تێڕوانینە ڕۆژئاواییەکەیدا، لە باریدایە وەك پێویستییەك ببێتە هۆی دەرکەوتنی دوو جەمسەری پەڕگیر: یەکەمیان بانگەشە دەکات بۆ قۆرخکردنی ڕاستی لە ڕێگای پێدانی ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە بە یەکێك لە سەرچاوەکانی مەعریفە، لەو ڕوانگەشەوە ڕەهابوونی مەعریفەی مۆدێرنیزم بەشداریی دەکات لەو چەقبەستنە مەعریفیە ڕەهایەی کلێسا لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپیدا پشتگیریی لێدەکرد. بەپێی ئەو بۆچوونە، پەراوێزخستنی ڕۆڵی سەرچاوە مەعریفیەکانی تر لە میانەی جەختکردنەوە لەسەر چەقبەستنی ڕەها، یان عەقلانیەتی ڕەها، وەیان ئەزموونگەرایی ڕەها، هەموو ئەمانە بوونەتە هۆی ئابلۆقەدانی ڕێگای مەعریفە لە یەك ڕێڕەودا، هەروەك بووەتە هۆی بەهێزکردنی ئەو جیاوازییە جۆرییەی کە خێرایی داوە بە خراپ کەڵەکەبوونی قەیرانە مەعریفیەکە و زیادبوونی ڕەخنە ناوخۆییەکان، بەڵام تیۆرەکانی کۆتایی پەیوەندیدار بە بنەماکانی مەعریفەناسیەوە (ئەپستمۆلۆجیا)) هاتن وەك تەواوکاری ئەو جیاکردنەوە توندەی لە ڕێڕەوی بەعەلمانیکردنی مەعریفەدایە، بەو شێوەیە بینیمان کە تیۆری کۆتایی ئایین تیۆری کۆتایی ژیریی بەدوادا هات، لەکاتێکدا میسالیەتی ڕەهای لای (هیگڵ) چەند ئاسۆیەکی نوێی کردەوە بۆ دەرکەوتنی ماددیەتی مارکسیزمی ڕووت و بە داڕووخانی مارکسیزمیش، تیۆری ((کۆتایی مێژوو)) دەرکەوت.

دەکرێ بەدواداچوون بکەین بۆ بنەماکانی ئەو سیما ڕەهایەی کە هەر لە سەرەتاوە ئەبستمۆلۆجیای ڕۆژئاوایی لە چەمکی سروش (الوحي) لای کلێسای

---

تایبەتی بۆ داناون)). ئەوانە نموونەن بۆ پەیوەندیی ڕیشەیی زمانەوانیی هاوبەش لە نێوان زانست و جیهاندا. بەڵام (الجويني) پەیوەندییەکی بەڵگەدار بۆ پێناسەکردنی جیهان دادەنێت بەوەی کە: ((نیشانەیەکی بەڵگەدارە لەسەر خاوەنی جیهان کە خوای پەروەردگار و باڵایە)) (ف. ڕۆزنتاڵ، ١٩٧٠: ١٩).

کاسۆلیکی جیادەکاتەوە. بەخشینی سیفەتی خوایەتی بەسەر کەسی مەسیحدا (سەلامی خوای لەسەر) و پەیوەندییە ڕۆحییەکەی بە کڵێساوە، پیرۆزییەکی داوە بەسەر کڵێسا خۆیدا و ڕێگای پێداوە بۆ بەرھەمھێنانی مەعریفەیەك کە بە ڕەھای دادەنێت، ئەم دیاریکردنی مەعریفەی ڕەھایە– کە سنووردارە بۆ یەك گرووپ لە ناو کۆمەڵگەدا– دەکرێ قبوڵ بکرێت، وەك باکگراوندێکی فەلسەفیی بۆ ئەو پەیوەندییە شوێنکەوتەییەی کە ھێز و مەعریفە پێکەوە دەبەستێتەوە، بەتایبەتی کە ئەرکی ئەو پەیوەندییەی کە لەسەر شوێنکەوتەیی ڕاوەستاوە لە سەردەمەکانی فیودالیزمدا دەرکەوتووە، بەڵام کاتێك ناوەندەکانی ھێز لە شارستانێتی ڕۆژئاوادا دەگۆڕێن، دوو پێویستیی دەرکەوتن: یەکەمیان پێویست بوون بە فۆرمێکی فەلسەفیی و دەزگایی کە توانای ھەبێ لەسەر بەرھەمھێنانی مەعریفەیەك بگونجێت لەگەڵ دابەشکردنە تازەکەی ھێزەکاندا، دووەمیان پێویستی دانانی تێڕوانینێکی ئایینیی نوێ کە بتوانێت خۆی لە ناکۆکیەکانی نێوان ناوەندەکانی ھێزەکان و مەعریفە تازەکەدا دەرباز بکات لە ڕوویەکەوە، لەگەڵ پێداویستییە ڕۆحانییەکاندا لە ڕوویەکی ترەوە. دەرکەوتنی ھاوکاتی ڕیفۆرمی ئایینیی لە سەردەمی ڕێنیسانس دا ھات بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانە ژیارییە لە ژینگەیەکی مەعریفیدا پێشکەش بکات، ناوەندەکانی ھێزە تازەکان لە شارستانێتی ڕۆژئاوادا خۆیان یەکلاکردەوە بۆ ئەرکی بەرھەمھێنانی مەعریفەی ڕەھا، ئەوەش ئەو ئەرکە بوو کاتی خۆی کڵێسا پێی ھەڵدەستا، جگە لەوەش ئەو پەرەسەندنانەی کە ھاوزەمان ڕوویاندا لە ھەریەك لە مۆدێرنیزمی عەلمانیەتی زانستیی و سیستمی سەرمایەدارییدا، چەندین ڕۆڵی وەزیفی نوێی لە پرۆسەی بەرھەمھێنان و بەکاربردنی مەعریفەی ڕەھادا ڕەسم کرد، بەو ھۆیەوە پەیوەندییەکی بەردەوام بەدی دەکرێت لە نێوان ئاڕاستەی ئاینی کاسۆلیکی لەگەڵ بۆچوونە زانستییە تازەگەرییەکاندا لە بارەی مومارەسەکردنی کۆمەڵایەتیی دەزگای چەمکەکانی مەعریفەی ڕەھاوە، ئەو مەسەلەی مەعریفەی ڕەھا دەکات بە گۆڕاوێکی پاشکۆ بۆ پەیکەری ئەو ھێزەی کە لە ئارادایە، جەمسەرە پەرگیرەکەی تری ئەو

ڕەهاییە خۆی لە (ڕێژەیی پۆست مۆدێۆنیزم)دا دەنوێنێت، ئەوەیە کە دان بە شەرعیەتی هیچ داڕشتنەوەیەکی ڕاستییدا نانێت، ئەم جەمسەرە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت وەك هێزێکی سەلبی، چونکە ئەو ئاستەنگە ئاشکرا دەکات کە ڕەهاییەکەی مەعریفە لە سەردەمی نوێدا تێیکەوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێژەیی پۆست مۆدێرنیزم دەستەوسان دەبێت لە ئاست بەرهەمهێنانی تێڕوانینێکی مەعریفیی ئیجابیی بۆ ڕاستی، کە بتوانێت بەهای جیهانیی هەڵبگرێت کە پێویستە بۆ بەرپابوونی گۆڕانکاریی شارستانێتی جیهانیی. لە لایەنەکەی ترەوە لێکدوورکەوتنەوەیەکی لۆژیکیی ڕیشەدار لە پشت ئەم جەمسەرەوەیە بۆ سووربوون لەسەر تیۆری ڕێژەیی، چونکە وێنەی ئەم سووربوونە بە ئاسانی دەتوانێت ڕێگایەکی تر لە بیرکردنەوەی ڕەها پەیدا بکات، ڕێژەیی ڕەها، ئەویش خۆی جۆرێکی ترە لە ڕەهابوون.

ئەپستمۆلۆجیای ئیسلامیی بەدیل بۆ هەردوو هەڵوێستە پەرگیرەکەی لە پێشەوە باس کران، پێشکەش دەکات، ئەو بەدیلەش لە پێناسەی ڕۆشنی سرووش (الوحي) دەردەچێت، بەو سیفەتەی کە تاکە سەرچاوەیە بۆ مەعریفەی ڕەها، بە پێچەوانەی مەسیحیەتەوە، لە ئیسلامدا جیاکاریی لە نێوان (قورئان) وەك مەعریفەیەکی نێردراو لە لایەن خوداوە، لەگەڵ کەسایەتی (پێغەمبەر) بەو سیفەتەی کە بەس نێردراوی ڕاگەیەنەرە بۆ ئەو مەعریفە ڕەهایە، ڕێگرە ـ لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر– لەبەردەم بوونی هەر دەسەڵاتێکی ڕۆحی دا کە بانگەشە بکات کە گوایە توانای هەیە بگاتە ئەو مەعریفە ڕەهایە، جگە لەوەش فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سەلامی خوای لەسەر) خۆی نەگەیشتوون بە پلەی سرووش (الوحی) لە ڕووی مەعریفەوە، دوابەدوای ئەوەش هیچ دەزگایەك، یان کەسایەتییەك دوای مردنی پێغەمبەر نەیتوانیوە بانگەشە بکات بۆ بوونی دەسەڵاتێکی مەعریفی بۆخۆی کە هاوتای وەحی بێت، چ جای باس لەوە بکات کە درێژکراوەیەتی. ئەو بنەما مەعریفیانە بوارەکانی مەعریفە و ئەحکامە ڕەهاو ڕێژەییەکانیان دیاریکردوە. هەروەك بونیادە عەقڵانیەتەکەی قانونی ئیسلامیی بەو سیفەتەی کە جێبەجێکردنی

کرداری مەعریفەیە، پرۆسەی بەدەزگاییکردنی ئەو دیاریکردنەی ئاسانکردووە وەك دەزگایەکی تاقانە بۆ نموونەی مەعریفەناسی ئیسلامیی، زیاتر لەوەش بابەتی بوونی وەحی ڕێگر بووە لە بەردەم دروستبوونی هەر جۆرە شوێنکەوتنێکی مەعریفەی ڕەها بۆ دامەزراوەییکردنی دەسەڵات. لە کاتی خراپ بەکارهێنانی مەعریفەی بابەتی ڕەهادا، مەسەلەکە تەنها جۆرێك دەبوو لە خراپ بەکارهێنان، ئەو خراپ بەکارهێنانەش هیچ شەرعیەتێکی وەرنەدەگرت، بە پێچەوانەی ئەوەی کڵێسای کاسۆلیکی لە سەردەمی فیودالیزمدا کردی. جیاوازیی ڕۆشن لە نێوان دەق و لێدەرهێنان (النص والاجتهاد)دا هێڵێکی جیاکەرەوەیە لە نێوان مەعریفەی ڕەهاو ڕاوبۆچوونی کەسەکان کە سیفەتی ڕێژەییان هەیە و ڕاستی و هەڵە پوویان تێدەکات.

لە ئەنجامی پێکەوە گونجان لە نێوان سەرچاوەکانی مەعریفە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، ئەو جیاکردنەوەیە مۆرکێکی عەلمانیەتی وەرنەگرتووە، هەر لە یەکەم ساتەوەختی بنیاتنانی سیستمی مەعریفەناسی ئیسلامییدا و تا سەردەمی نوێ، هەموو پێشەوایانی نموونەی ئیسلامیی لە قوتابخانە فیکرییە جیاوازەکان دەبینین جەختیان کردۆتەوە لەسەر ئەوەی کە سەرچاوەکانی مەعریفە تەواوکاری یەکترن[٢١] و پێك ناکۆك نین، هەروەك هەموو سەرچاوەیەك لەوانە بەدیلی لەناوبەری سەرچاوەکانی تر نییە، هەروەها ئەوەشیان دڵنیا کردۆتەوە کە توانای ژیریی پێویستییەکی نکوڵیی لێ نەکراوە بۆ تێگەیشتن لە وەحی، بەڵام وەحی هەمیشە ڕێکخەر و هەڵسەنگێنەرە بۆ ڕاوبۆچوونە ڕێژەییەکان کە بەرهەمی بیر و ژیرییە و ئەگەری خراپ بەکارهێنانی هەیە. هەموو قوتابخانە فیکرییە ئیسلامییەکان

---

[٢١] (التفتازاني) (١٩٥٠: ١٥) سەرچاوەکانی ئەو مەعریفەیە دیاری دەکات بەوەی کە (هەستی قووڵ و گێڕانەوەی ڕاست و ژیرییە کە گریمانەی سەرەکیی ئەم مەسەلەی پێکهێناوە).

تەواوکاریی سەرچاوە مەعریفیەکانن و پێکەوە گونجانی ڕەهایان لاپەسەندە وەك سیمایەکی بنەڕەتیی نموونە مەعریفەناسی ئیسلامیی.[٢٢]

لێرەدا شیاوی ئەوەیە ئاماژە بکرێت بۆ ئەوەی کە ئەو تەواوخوازیی و پێکەوەکۆکبوونە کاری کردۆتە سەر پۆلێنکردنی زانستەکان وەك شیکردنەوەی بەدیل بۆ مەعریفەیە، حاڵیان حاڵی میتۆدەکانە (المنهجيات) بەو سیفەتەی کە ئامرازن بۆ گەیشتن بە ئەکتیڤکردنی مەعریفە لە مێژووی فیکری ئیسلامییدا. هەوڵەکانی ئێستا کە ڕەنگدانەوەی بەئیسلامییکردنی مەعریفەیە (تەحەدی)یەکی نوێیە، بەو سیفەتەی کە دینامیکیەتێکی نوێیە دەچێتە ناو کەش و هەوای فیکری ئیسلامییەوە و لە بەرامبەر پۆلێنکردنەکانی نموونەی مۆدێرنیزمی عەلمانیدا ڕادەوەستێت، ئاشکرایە کە چەندین پرسیار و ئاستەنگ هەیە کە بەرەنگاری پرۆسەی بەئیسلامیکردن دەبێتەوە. بەهەرحاڵ توێژینەوەیەکی بەدیل هەیە کە بووەتە بەشێکی جیانەکراوە لەو دینامیکیەتە فیکرییە نوێیەی کە لە گرنگترین داخوازییە بنەڕەتییەکانە بۆ بەدیهێنانی گەشەکردنی ژیاریی.

**ج - ڕۆڵی سیستمی بەهاکان لە ئاراستەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیی و ڕێنماییکردنی میکانیزمەکانیدا:**

پێشتر لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ڕوونمان کردەوە کە تێکچوونی ئەخلاقی ماددییگەرایی وەك یەکێك لە ڕەهەندەکانی قەیرانە ژیارییەکە، ئەنجامێکی سروشتیی پشتبەستنی سیستمی بەهاکانە بە چوارچێوەی میکانیزمە دەستکردەکان. لە

[٢٢] (ابن طفيل) هەوڵ دەدات ئەو پێکەوەگونجان و تەواوخوازییە لە کتێبە ناوازە و بەناوبانگەکەیدا ((حي بن يقظان)) بخاتە ڕوو کە دەڵێت: ((کاتێك دەرکی بەو دۆخە کرد کە مرۆڤایەتی پێی گەیشتووە و دڕندەیەتی مرۆڤ لەرگیانداراە دڕندەکان و کێوییەکان دژوارترە، تێگەیشت کە حیکمەت و سەرفرازیی تەنها لەوەدایە کە پەیامبەرانی خودا هێناویانە، دوای ئەوەش کە پەیامی ئاسمانیی تەواو بووە، کەواتە هیچ ئاینێك نییە شایانی شوێنکەوتن بێت لە تەنیشت ئەو پەیامەدا و بیرێك نییە کە بخرێتە سەر ئەوەی هێناویەتی)) (١٩٠٥: ٦٨).

شارستانێتی ڕۆژئاوادا تێکچوونی ئەخلاقی لە ڕاوەستانی مەعریفە لەسەر دامەزراوەی دەسەڵات پەیدا دەبێت، کە لە ناو چوارچێوەیەکی تاکڕەوییدا کار دەکات، بەهۆی توانای ناوەندەکانی هێزەوە بۆ بەرهەمهێنانی مەعریفەیەکی گونجاو بۆ پەیداکردنی سیستمێکی بەهایی شیاو کە بۆ بەرژەوەندییە زاتییەکانی ئیش بکات، لە ڕوویەکەوە، پتەوی تیۆرە زانستییەکانی وەك فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم و فەلسەفەی ئەزموونگەرایی و پشت بەستن بە ڕاستییە بینراوەکان، لە ڕوویەکی ترەوە، یارمەتیدەرن بۆ جێگیرکردنی ئەو بەهایانە بەو سیفەتەیان کە ڕاستیی کۆتایین و هیچ گومان و سەرلێکردنەوەیەك قبوڵ ناکەن، لە حاڵەتی پێکەوە نەگونجانی وێنەی ئەو بەهایانە لەگەڵ میسالیاتە باوەکاندا، ئەوە لە توانایدایە کە بە ئاسانیی پاساوی ئەوە پێکەوە نەگونجانە بکات لە ڕێگای جیاکردنەوەی میسالی، لە واقیعی، یان لە نێوان پێوەرکاری و یەقینی دا، بە ڕەچاوکردنی ئەو جیاکارییانە کە بەرهەمی سروشتی بوون، نموونەی ئەو سیستمی پلەبەندی عەلمانیەتەی کە تایبەتە بە ئاستی مەعریفیەوە.

ڕەتکردنەوەی پۆست مۆدێرنیزم بۆ ئەو وێناکردنە ڕەهایە دەگاتە هەڵوێستێکی پەڕگیری تر، ئەویش ئەو هەڵوێستەیە کە ئەوە ڕەتدەکاتەوە دان بنێت بەوەی هەر کام لەو بەها ڕەهایانە بەسوود بن، بێگومان وێنەی ئەم هەڵوێستە لە توانایدا نابێت زاڵ ببێت بەسەر ئاستەنگی بەهاکاندا، نموونەی ئیسلامیی هەوڵدەدات بۆ دۆزینەوەی چارەیەك بۆ ئەو ئاستەنگە بە دامەزراندنی پەیوەندییەکی بەیەکدا چوو لە نێوان وجودناسیی و مەعریفەناسیی و بەهاناسییدا.[٢٣] لەبەر ئەوەی کە پێکەوە گونجان و هاوسەنگ بوون لە نێوان سەرچاوەکانی مەعریفەدا پێوەری بنەڕەتییە بۆ

---

[٢٣] لە ڕاستیدا چەمکی بنەڕەتی  لە سیستمی بەهاکانی قورئانییدا بریتییە لە کردەوەی چاك (العمل الصالح) کە یەکێتیی توندوتۆڵ پێك دێنێت و شیاوی پارچە پارچەکردن نییە لەگەڵ هەردوو چەمکی (الایمان والعلم)، مەسەلەیەکە لەباریدایە ئەو کێشەیە بسەلمێنێت.

مەعریفەناسیی ئیسلامیی، بۆیە هەبوونی جیاوازی لە نێوان میسالی و واقیعیدا، یان لە نێوان پێوەرکاریی و یەقینییدا مومکین نابێت، بەدوای ئەوەشدا شەرعییەتدان بەسەر حوکمێکی دانراودا ڕێگای بۆ نییە بیٚ ئەوەی ڕەهەندێکی پێوەرکاریی تێدا نەبێت، بە پێچەوانەشەوە حوکمدانی پێوەرکاریی هیچ توانایەکی وەزیفی نابێت، ئەگەر بەسەر ڕەفتارە کۆمەڵایەتیی و کەسێتییەکاندا ڕەنگی نەدابێتەوە.

بنەما بنەڕەتییەکانی ڕەوشت کە لەسەر بەهاناسی ڕاوەستاوە، ئەمانەی خوارەوەن:

أ- پێویستیی دانانی کۆمەڵێك لە بەها ڕەهاکان لەهەر کویٚ مەعریفەی بابەتی ڕەها هەبیٚ.

ب ـ بەڵام نەمە عریفەی ڕەها و نە ڕەنگدانەوەی بەهاکانی، ناکریٚ ببنە پاشکۆی بونیادی دەسەڵات، چونکە شەرعیەتی هەردووکیان سنوورەکانی کات و شوێن تێدەپەڕێنێت.

ج ـ ئامرازە دەستکردەکان و دامەزراوە سنووردارەکان بە هەردوو فاکتەری کات و شوێن دەستەوسان دەبن لە بەرهەمهێنانی بەها ڕەهاکاندا، لە ڕاستییدا پێچەوانەکەی ڕاستە، چونکە لە توانای ئەو دەزگاو ئامرازانەدا نابێت هیچ شەرعیەتێك وەربگرن تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە پابەند بن بەو بەهایانەوە.

د- بەها ڕێژەییەکانی پێوەندکراو بەکات و شوێن، شەرعیەتی وەزیفیان شوێنکەوتەی سیستمی بەها ڕەهاکان دەبێت، ئەو شەرعیەتەش کۆشش دەکات بۆ ئامادەسازیی ژینگە کۆمەڵایەتییەکە بە مەبەستی بەدیهێنانی پێوەرگەراییەکی ئیسلامیی، پێوەرگەرایی سیستمی بەهاکان لە ئیسلامدا پێشترە لە یاساکان و ئامرازەکانی تایبەت بە بونیادە کۆمەڵایەتییەکە.

(الفاروقی) ئەو بیرۆکەیە ڕون دەکاتەوە کە دەڵێت: ((سیمەتی ئیلاهی بۆ قورئانی پیرۆز کردوویەتی بە کانیاوێك بۆ بەهاکان، نەك بۆ ڕاستییە واقیعیەکان، کانیاوێك بۆ عەقیدەیەکی ئەخلاقیی، نەك بۆ وەسفکردنی جیهانەکانی تر،

سەرچاوەیەك بۆ بنەما هەرەمیەکانی بەها ئەخلاقیە ئایینییەکان لەبری گێڕانەوەی لیستێکی وردەکاریی بۆ ئەو بەهایانە)) (١٩٦٣: ١٥٩).

دەتوانین ئەو سیمەتە بنەڕەتییەی کە نموونە مەعریفی ئیسلامیی جیادەکاتەوە، تیۆریزە بکەین، بەو پێیەی کە ئەنجامی کارتێکردنی قورئانیەکە پێناسێکی ڕۆشن دادەنێت بۆ شێوەکانی ڕەفتارە ئیجابیی و سەلبییەکان، چونکە ئەم پێناسەیە بە یاساییکردنی نموونە ئەخلاقیەکان، چەمکە قورئانیەکانی وەك چاکە (الخير)، دادپەروەری (العدل)، ڕاستی (الحق)، کردەوەی چاك (العمل الصالح)، چاك ویستن (البر)، دادگەریی (القسط)، پارێزکاری (التقوى)، خۆگریی (الحلم)، پێزانین (المعرفة)، ئەوانە و هاوشێوەکانیان کە لە قورئاندا زۆرن، وەك مەشخەڵی ڕێنماییکردن وەهان لەسەر ڕێگای گەیشتن بە پێوەرکاری بەهاو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان.

قورئانی پیرۆز ئەو دەق و وردەکارییانە لە بارەی ئەو ئامرازە کۆمەڵایەتیانەوە کە پێویستە پراکتیك بکرێت، پێشکەش ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بونیادە پێوەرکارییە بۆ چەمکەکان، کە ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە ئەرك پێدانی خودایی کە ڕووی گوتاری لە تاکی موسڵمانە، ئەو بونیادە وێنایەکی کۆمەڵایەتیی و دوابەدوای ئەوەش، ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتیی دروست دەکات و لە هەردووکیشیانەوە ڕێسایەکی شەرعی بۆ ئەو ئامرازە کۆمەڵایەتییانە پێکدێنێت. هەروەك سیستمی ئەخلاقیی گریمانە دەکات کە جێگیرکردنی سیستمێکی گشتگیریی بەهاکان و شێوازێکی ڕەفتاریی ـ کە هاوڕێك بێت لەگەڵ ئەو سیستمەدا ـ دەشێ بە شێوەیەکی خۆبەخۆ گونجاوترین ئامراز بۆ ئیدراککردنی ئەو بەرپرسیارێتییە پیرۆزە بەرهەم بهێنێت، قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکات بۆ ئەو بەهاو شێوازە ڕەفتاریانە و فەرمانەکان لە زیاتر لە جێگەیەکدا، بۆ نموونە ئەم ئایەتە قورئانیە کە دەڵێت: (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ) (آل عمران: ١٠٤). مانای وایە کە بەجێهێنانی ئەو بەها ئەخلاقیانە دەکەوێتە سنووری توانای مرۆڤەوە، هەروەك پێکهێنانی باشترین دەزگا و ئامرازی کۆمەڵایەتیی، بەشێکی

جیانەکراوە دەبێت لە ئەرکەکانی توانای مرۆڤەکان، هەروەك مەسەلەیەکی بەدیهیە دان بەوەدا بنرێت کە مرۆڤ ئەو توانایەی پێ بەخشراوە بۆ هەڵسان بەو بەرپرسیارێتیانەی دەکەوێتە سەرشانی، وەك ئەنجامێکی سروشتی بۆ ئەو چەمکە ـ ئەوەش بە تەواوی جیاوازە لە شارەزایی ڕۆژئاوایی ـ کە بەخەیاڵدا هاتنی بوونی هێزێکی کۆمەڵایەتی، یان ئامرازێکی دەستکردی کە بالاتر بێت لە توانای مرۆڤ بۆ بەجێهێنانی ئەو تەکلیفە خواییە، بە مەسەلەیەکی ئەستەم دادەنێت. توخمە ئینسانیەکانی پێوەرکاریی ئیسلامیی بە شێوەیەکی بەهێز پشت قایمە بەو باکگراوندە مەعریفیە، لەبەر ئەوەش تیۆرە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان ئاماژەبە دوو پرسی بنەڕەتیی دەکەن:

أـ ناساندن و وەسفکردنی سیستمێکی کۆمەڵایەتیی نموونەیی، وەك ئەوەی لە (المدینة الفاضلة)ی فارابیدایە.

ب ـ دامەزراندنی چەند نموونەیەکی کۆمەڵایەتیی و یاسایی هاوڕێك بن لەگەڵ سیستمی پێوەرکارییدا، وەك ئەوەی لە کتێبی (الاحکام السلطانیة)دایە.

ئەم دەروازە مەنهەجیە مانای وایە کە ڕەتکردنەوەیەکی بێ مەرجە بۆ بوونی ڕێسا ڕەفتاریی و کۆمەڵایەتییەکان، چونکە دڵنیابوون لە ڕاستی ئەو ڕێسایانە و ڕەچاوکردنیان بە مەرجێکی پێشینە دادەنرێت بۆ بەراوردکردنی تیۆریی و پراکتیکیی لە نێوان بوارە میسالی و واقیعییەکاندا و لە نێوان پێوەرکاریی و یەقینی دا، هەوڵەکەی (ابن خلدون) هەر لەم ڕاستایەدایە لە کتێبە ناودارەکەیدا (المقدمة)، کە جەختی کردووە لەسەر ئەوەی کە ئەم چوارچێوەیە لە ڕوانگەی ئیسلامییەوە بۆ مەعریفە پێویستە پەرەی پێبدرێت. شیکردنەوەی (ابن خلدون) هەرگیز خۆی نەداوە لە وەسفکردنی هیچ ئاستەنگێکی مێژوویی، ڕەگەزی مرۆڤ تیایدا تەنها گۆڕاوێکی شوێنکەوتەی ئامێرە سروشتییە کۆمەڵایەتییەکان بێت بە ڕێڕەوی مێژووییدا کە ڕاوەستانی بۆ نییە، بەلام ـ بە پێچەوانەی ئەوەوە ـ هەوڵی داوە ڕەگەزی مرۆڤ بە مەنهەجیەتێك دەربخات کە وەسفی ڕۆڵە کرداریە کۆمەڵایەتییەکان بکات و بەپێی

پێوەرە نموونەییەکانی پێغەمبەرێتی (یان ئەوەی پێی دەوترێ سیاسەتی ئایینیی) هەڵسەنگاندنیان بۆ بکات. زیاد لەوەش لێکدانەوە بازنەییەکەی بۆ حەرەکەتی مێژوو، ئامانج لێی زاڵکردنی ڕەهەندی بەهایە بەسەر گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکاندا لە هەردوو حاڵەتی گەشەکردن و پووکانەوەدا.

گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان تێڕوانینی ئیسلامیی و هاوشێوە ڕۆژئاواییەکەی، لە چۆنێتی پاساودانی ئامرازە کۆمەڵایەتییەکان و شەرعییەت پێدانیاندایە، پێشتر لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ڕوونمان کردەوە کە تێکچوونە ئەخلاقییە ماددییەکان کە بە خراپی کەڵەکەبوون، لە ئەنجامی ئاستەنگە ژیارییەکەی ئێستادا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە مرۆڤ توانای بەسەر ئاڕاستەکردنی سیستمی بەهاکاندا لەدەست داوە و ئەو بەرپرسیارێتییەی سپاردووە بە ئامرازە کۆمەڵایەتییە دەستکردەکان و ئەو ئامرازانەش خۆیان کۆمەڵێك بەهای ئەخلاقییان بۆ خۆیان پەیداکردووە بۆ پاساودانی بوونی خۆیان و بۆ ئەوەی ئەو بوونە بکەنە مەسەلەیەکی شەرعیی.

لەو تەنگژەیەی کە مرۆڤایەتی لە ڕۆژئاوادا گرفتاری بووە، ئا لێرەدایە بەتەواوەتی، چونکە تیۆرە مێژووییە سەرەکییەکان بە ڕەنگدانەوە ئایدۆلۆژییەکانیان ڕۆڵی ڕەگەزی مرۆڤیان تەسککردۆتەوە و بەرپرسیارێتییەکانی کەم کردۆتەوە، هەرلەبەر ئەوەشە کە - لە ڕژێمە سۆشیالیستییەکان و لە سیستمی سەرمایەدارییشدا لە چوارچێوەی میکانیزمەکانی بەجیهانییکردنی ئابوورییدا - دەسەڵات سەپاندنی سیستمی بەهاکانی داوە بە دەزگاکانی دەوڵەت، بەو شێوەی کە خۆی حەزی لێ بکات و وێناکردنی وەك ئەنجامێك بۆ عەقڵانییەکی حەتمیەتی مێژوویی. هەردوو نموونەکەی (سەرمایەداریی و سۆشیالیزم)، دەبنە هۆی خراپ بەکارهێنانی ئەو هێزەی کە لە بن دەستی نوخبە خۆماڵی و نێودەوڵەتییەکاندایە لە ڕێگای ئامرازە کۆمەڵایەتییەکانەوە، لەو ڕێگایەشەوە دەستوەردەداتە چارەنووسی مرۆڤەکانی تر، بەڵکو سنوورەکانی ڕۆڵیشیان لە ژیاندا بۆ دەکێشێت.

به پێچەوانەی ئەوەوە پێوەرەکانی ئیسلامیی ئەو پانتاییە بەجێناهێڵێت بۆ ئامرازە کۆمەڵایەتییەکان بەبێ مەرج و قەید، بەتایبەتی ئەو ئامرازانە وادادەنرێت کە گۆڕاوی شوێنکەوتە خزمەتگوزار بن بۆ مرۆڤەکان و یارمەتیدەر بن بۆی، بۆ ئەنجامدانی بەرپرسیارێتییەکانی، نەك کۆنترۆڵی چارەنووسی بکەن، بۆیە هیچ بوارێك نییە بۆ پاساودان بەو ئامرازانە، یان داننان بە دەسەڵاتەکانیاندا بەبێ گەڕانەوە بۆ سیستمی بەهاکانی کۆمەڵگەی موسڵمان، تەنانەت ئامرازە کرداریە دووەمی و فەرعییەکانیش لەساتە وەختێکدا شەرعیەتیان دەبێت کە هاوکاریی بکەن لە بەدیهێنانی ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ڕەوشتە ئیسلامییەکاندا، ئەم خەسڵەتەیە کە تێڕوانینی کۆمەڵایەتیی سیاسیی لە پێکهاتەی ڕۆشنبیری تیۆریی ژیری موسڵماندا جیا دەکاتەوە، بەوەش تێگەیشتنی ئیسلامیی بۆ سیستمی جیهانیی دەبێتە ئەنجامێکی سروشتی کە لەم تێڕوانینەوە هەڵدەقوڵێت.

**د- هاوسەنگی ژینگەیی:**

پەیوەندییەکی قایم هەیە لە نێوان هوشیاریی وجودیی و سیستمی بەهاکان و ئیدراکی سروشت و ژینگە پێکەوە دەبەستێت، لەڕاستیدا ژینگە وەك دەفرێکی پێویست وایە بۆ ڕەگەزی مرۆڤ، لەبەر ئەوە ئەو پەیوەندییە مەفاهیمیە زۆر ڕوونە، چونکە نەفسیەتی پاوانخوازیی مرۆڤی ڕۆژئاوایی و ئامرازە کۆمەڵایەتییە تەواوکارەکانی، هۆکاری بنەڕەتییە لە پشت قەیرانە ژینگەییەکەی ڕۆژئاواوە، ئەو نەفسیەتە پاوانخوازییە هاوڕێکە لەگەڵ ئیدراکی زاتیی شارستانی مرۆڤی ڕۆژئاواییدا. سیاتڵ، کە یەکێکە لە پێشەوایانی هیندیە سوورەکان، ئەو مەیلە پاوانخوازییە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر وەسف دەکات کاتێك دەڵێت: ((ئێمە لەوە دڵنیاین کە ڕۆژێك دێت مرۆڤی سپی پێست بۆی دەردەکەوێت کە پەروەردگاری ئێمە و ئەوانیش یەك خودایە، لەوانەیە مرۆڤی سپی پێست گومانی وابێت کە وەك چۆن بووەتە خاوەنی زەوی، ئاوەهاش بووەتە خاوەنی خودا، بەڵام ئەو گومانە دوورە لە

ڕاستییەوە، چونکە خودا پەروەردگاری هەموو مرۆڤەکانە و بەخشندەییەکەشی بە یەکسانی مرۆڤی سپی پێست و ڕەش پێست دەگرێتەوە)).

ئەو نەفسیەتە پاوانخوازییە مرۆڤی ڕۆژئاوایی گەیاندە ئەوەی سروشت بەو شێوەیە وێنا بکات، وەك تەنها هۆکارێك بێت لە هۆکارەکانی بەرهەمهێنان و مادەیەك بێت بۆ کردن بە موڵك وەك هەر کاڵایەکی تر نرخی بازاڕی بۆ دابنرێت و بەکارهێنانیشی مەسەلەیەکە تەنها پەیوەستە بە ئارەزووی خاوەنەکەیەوە و بابەتێکە بۆ ئامرازە ئابوورییەکان، ئێستا دوای ئەوەی هەموان زانیان کە ئامرازە دەستکردەکان بوونەتە هۆی ڕوودانی کارەساتێکی ژینگەیی، چەندین هەوڵ دەرکەوتن بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك توانای بەردەوامبوونی هەبێ بە پشت بەستن بە خودی بنەما دەروونییە مەنهەجیەکان خۆیان، بێگومان دانانی ئەو ئامرازە نوێیانە پێویستن بۆ کۆنترۆڵکردنی تێکچوونە ژینگەییەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی مەسەلەکە دەمێنێتەوە بەدەستی (خاوەنی) باڵادەست بەسەر ئەم ژینگەیەدا، ئەوا دەوڵەتە پێشکەوتووەکان بەردەوام دەبن لە ڕێگادان بە ئامێرە وێرانکەرەکان بۆ ڕەتکردنەوەی هەر جۆرە مشتومڕێك لە بارەی پێشینە فەلسەفیەکانی کارەساتە ژینگەییەکەوە، چونکە وێنەی ئەو مشتومڕانە دەرگای تاوتوێکردن لە بارەی بنەماکانی شارستانێتی ڕۆژئاواوە، دەخاتە سەرپشت.

لە بەرامبەر ئەوەدا، تێڕوانینی ئیسلامیی هەر مەیلێکی پاوانخوازیی بۆ سروشت ڕەت دەکاتەوە، دەروونیی بێت، یان پراکتیکی، چونکە ئیسلام گەردوون بەگشتی بە بەخششێکی خوایی دادەنێت بۆ ڕەگەزی مرۆڤایەتیی لەپێناو مانەوەیان لە ژیاندا، هەروەك ئەم گەردوونە ڕاگەیاندنی بەڵگە و نیشانە ڕۆشنکەرەوەکانی خودایە. کاتێك تاکی موسڵمان لە میانەی ئەم هۆشیاریە وجودیەوە دەڕوانێت بۆ گەردوون، ئەو شتانەی کە لە گەردووندا دەیبینێت، تەنها وەك مەوادی خام سەیریان ناکات کە بەدیهێنرابن بۆ پیشەسازیی و بەکارهێنان، لەوانەیە بیرمەندێکی مۆدێرنیزم ئەم تێڕوانینە وەك تێڕوانینێکی ئایینیی سەردەمی پێش شۆڕشی پیشەسازیی تێبگات،

بەڵام ئێمە پێویستە لەوە بێئاگا نەبین کە هەوڵەکانی ڕیفۆرمی نموونەیی مۆدێرنیزم لە ناوخۆدا، سەرکەوتن بەدەستناهێنێت، ئەگەر هەروا بمێنێتەوە و پێوەندکراو بێت بەو کۆت و پێوەندانەوە کە دەستکردی نموونەکە خۆیەتی و هەرئەوەش بەرپرسیاری یەکەمی ئەم کارەساتەیە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە تێڕوانینی قورئانیی ڕێزگرتنێکی غەیبی (میتافیزیکی) تێدایە بۆ سروشت، لە پاڵ بانگەشەکردنی بۆ بەکارهێنانی دیموکراسییانەی جیهانیی بۆ ئەم بەخششە خوداییە، تێڕوانینە غەیبی و سروشتییەکان بەیەکدا دەچن بۆ پێکهێنانی چەمکی بەڵگەکان (الآيات)، ئەو بەڵگانەش پەیوەندییە گەردوونیەکانی نێوان خوداو مرۆڤ و سروشت لەخۆدەگرێت، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت: ٥٣).

هاوڕێکی و هاوسەنگیی لە گەردووندا هەیە، چونکە دەستکردی خودایە[٢٤] کە هەموو شتێکی بە وردی و جوان دروست کردووە، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤەکان پارێزگاریی لەو هاوڕێکیە بکەن، وەك خەسڵەتێکی جەوهەریی بۆ مانەوەی گەردوون، وێنەی ئەم مانا غەیبیە و دەروازەی تایبەتمەند بۆ تێگەیشتن لە گەردوون، ژمارەیەك لە زانایانی ئاڕاستە کردووە بۆ قبوڵکردنی وەك شێوەیەکی تر لە شێوەکانی سروشی خودایی (الوحي الالهي) و بەڵگە و ئایەتێك لەسەر بوونی بەدیهێنەر.[٢٥] لەبەر ئەوە

---

٢٤ ئەو ئایەتە قورئانییە کە دەفەرموێت: (وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ) (الرعد: ٨).

٢٥ سەید حسێن نەصر ئەو دیاردەیە بەوە لێك دەداتەوە کە: (لە ئیسلامدا پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا، هەروەها لە نێوان زانستە سروشتییەکان و ئاییندا، لە قورئان خۆیدا دەکرێ بەدواداچوونی بۆ بکەین، ئەو کتێبە پیرۆزەی کە وتەکانی خوای تێدایە بۆ بەندەکانی. ئەوە سروشە (الوحی) کە پایەیەکی بەهێزی ئاینە و دیسان سەرچاوەی سروشی گەردوونیشە بە هۆی ئەو هەموو بەڵگانەوە کە تیایینی. هەریەك لە (القرآن التدويني) (القرآن التكويني) بیر و نموونەی ڕەسەن هەڵدەگرن کە

هیچ مانایەك لەوەدا نییە كە پەیوەندیی لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا پەیوەندی مالیك و مەملوك بێت، ڕاستە مەبەست لە دروستكردنی سروشت، بەدیهێنانی شوێنێكە بۆ ژیانی مرۆڤ، خوای گەورە لەقورئاندا ئامارەی پێ دەكات: (الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْداً وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّن نَّبَاتٍ شَتَّى، كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُوْلِي النُّهَى) (طه: ٥٣، ٥٤).

لەبەر ئەوەی كە سروشت بەخششێكە لە خواوە بۆ مرۆڤایەتی، كەواتە جوانترین بەكارهێنان و بەردەوامیی سامانە سروشتییەكان، ماف و دەستكەوت دەبێت بۆ گشت مرۆڤەكان، بەبێ هیچ قۆرخكارییەك لە كات و شوێنێكی دیاریكراودا، ئەم تێڕوانینە لەباریدایە كە بەشداریی بكات لە پەرەپێدانی بەهاكان و سیاسەتە جیهانییەكاندا لەپێناو پاراستنی ژینگە لە دڕندەیەتی ئامێرە پیشەسازییەكانی مۆدێرنیزم، كە لە سایەی سیستمی دەوڵەتی نەتەوەییدا گەشەی سەندووە، بە دڵنیاییەوە ((مافی سوود لێوەرگرتن)) زۆر جیاوازە لە ((مافی دەستبەسەردا گرتن)) كە ئامێرەكانی سەرمایەداریی بانگەشەی بۆ دەكەن، چونكە دەستبەسەردا گرتن ئەو مانایەش لەخۆ دەگرێت كە خاوەندار، یان دەستبەسەرداگەر، ئازادی ڕەهای هەیە لە بەدیهێنانی ئەوپەڕی بەكارهێنان و سوود وەرگرتن لە سامانە سروشتییەكان، ئەگەریش ببێتە هۆی وێرانكردنی ژینگە و خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ اللّهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُ فَإِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ) (البقرة: ٢١١).

سەرباری ئەوەی پێشەوە، تێڕوانینی قورئانی لەسەر بنەمای پەیوەستكردنی هاوسەنگی گەردوونیی و هاوڕێكی ژینگەیی ڕاوەستاوە لەگەڵ ڕوئیایەك بۆ گەردوون كە لە ئامانجەكانیدایە كار بكات بۆ قەدەغەكردنی خراپ بەكارهێنانی سروشت، ئەنجام لێوەرگرتنەكەی حسێن نصر (١٩٨٦: ١٣٦) بە وردی لەو ڕوانگەیەوەیە كە

---

وەسفی بوونەوەرەكان دەكەن. بۆیە قورئان زاراوەی (الآیة) بەكار دەهێنێت و بۆ ئەوەش كە ئایەتە قورئانییەكان ئەوەی بەسەر ڕۆحی مرۆڤەكان و ڕواڵەتەكانی گەردووندا دێت، دەگرێتەوە.

دەڵێت: ((لە کۆتاییدا، هەموو ئەوەی کە بتوانین بیڵێین بە یەقینی ئەوەیە کە هیچ بوارێك نییە بۆ بەدیهێنانی ئاشتی لە نێوان مرۆڤەکاندا، بەبێ بەدیهێنانی ئاشتی و پێکەوە گونجان لەگەڵ ژینگەدا هەر لەسەرەتاوە، وە بۆ ئەوەی ئاشتی و پێکەوە گونجان لەگەڵ سروشتدا بێتەدی، پێویستە لەسەر مرۆڤ بگاتە پلەی پێکەوە گونجان و هاوسەنگیی لەگەڵ خوادا، چونکە هەر ئەوە کە سەرچاوەی گشت بوونەوەرەکانە، هەرکەسێك لەگەڵ خوادا لە ئاشتییدا بێت کە لە بنەڕەتدا پەروەردگار و بەدیهێنەریەتی، ئەوا بێگومان لەگەڵ مرۆڤی براو سروشتیشدا لە ئاشتییدا دەبێت)).

فەرمانە ئەخلاقییە ئیسلامییەکان ئەو بنەما غەیبیە بەهێز دەکەن، چونکە ئیسلام ڕێگا نادا بە هیچ جۆرە زیان گەیاندنێکی بە ئەنقەست بەرامبەر بە سروشت، تەنانەت لە حاڵەتی جەنگیشدا. ئیمامی (گبری) لە خەلیفە ئەبوبەکر صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە ئامۆژگاریی جەنگاوەرە موسڵمانەکانی کردووە پێش دەرچوونیان بۆ جەنگ، ئامۆژگارییەکە مانای قووڵی تێدایە و بەڵگەیە لەسەر ڕادەی هەستکردنی موسڵمان بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر ژینگە و هەموو ئەو شتانەی تیایدایە، بە مرۆڤ و گیاندار و ڕووەکەوە کە دەڵێت: ((ایها الناس قفوا أوصیکم بعشر فاحفظوها منی: لا تخونوا، ولا تغلوا، ولا تغدروا، ولا تمثلوا، ولا تقتلوا صغیرًا ولا شیخاً کبیراً، ولا امرأةً، ولاتعقروا نحلاً، ولا تحرقوه، ولا تقطعوا شجرة مثمرة، ولا تذبحوا شاة ولا بقرة، ولا بعیراً، الا لمأکلة، وسوف تمرون بأقوام قد فرغوا أنفسهم فی الصوامع فدعوهم وما فرغوا انفسهم له، وستمرون علی قوم بأنواع مختلفة من الطعام، فان أکلتهم منها فاذکروا اسم الله علیه)) (ولیام، ١٩٧١: ٢٦٢).

**هـ ـ ڕەسەنایەتی و فرەکولتووریی:**

ڕەسەنایەتی و فرەکولتووریی دوو لایەنی گرنگن لە نموونەی شارستانێتی ئیسلامییدا: لایەنی یەکەم لە تێڕوانینی موسڵمانان بۆ کۆمەڵگە و مێژوو خۆی دەنوێنێت کە پاڵنەرە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکانیان پێدەخشێت بۆ پارێزگارییکردن لە خەسڵەتە ڕەسەنەکانی شارستانێتییەکەیان، ئەوەش لەگەڵ

دژواریی هۆکارەکانی داپلۆسین کە نوسخە تازەگەرییەکەی شارستانێتیی ڕۆژئاوا بەرهەمی هێناون و کار دەکات بۆ قوتاربوون لە هەموو کولتووری دێرینەکان وەك زەمینەسازکردنێك بۆ ڕیشە داکوتانی گلۆبالێزم بە شێوەیەکی کۆتایی و بەپێی خواست و ویستی ئامرازە ئابوورییەکان، بەڵام لایەنی دووەم لە مومارەسە مێژووییەکانی شارستانێتی ئیسلامییدا بە دیار دەکەوێت، کاتێك باڵادەست بوو بەسەر زۆرێك لە کولتووری دێرینەکانی تردا، لایەنی یەکەم ئەو پرسیارە دێنێتە ئاراوە کە دەڵێت چۆن ـ بەچ تێڕوانینێکیش ـ موسڵمانەکان توانیان پارێزگاریی لە هیوا و ئارەزوویان بکەن بۆ دووبارە بونیادنانەوەی پێوەرەکانی شارستانێتی ئیسلامیی، لەگەڵ ئەوەش دووچاری پڕۆسەیەکی مێشك شۆردنەوەی دژوار بوون، بۆ ئەوەی بنەماکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا قبوڵ بکەن، وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ڕادەی دینامیکیەتی بەرگریی شارستانێتی دەردەخات کە لە ناو موسڵماناندا بڵاوبۆتەوە، زۆرێك لە زانایانی کۆمەڵناسیی و سیاسەتمەداران مەیلێکیان لا دروست بووە بۆ ئەوەی ئیسلام لە وێنەی نموونەیەکی توندڕەو لە دەرەوەی کۆدەنگیی گشتیی کۆمەڵگەی جیهان بناسێنن، ئەنجام لێ دەرهێنانەکەی (فۆکۆ یاما)ش نموونەیەکە لەسەر ئەو مەسەلەیە کە دەڵێت: ((بەڵام ئێستا دوور لە جیهانی ئیسلامییەوە ئەوە تێبینی دەکرێت کۆدەنگییەکی گشتیی بۆ پشتیوانیکردن لە دیموکراسی لیبراڵیزم هەیە کە باشترین نموونەی حوکمی عەقڵانی پێشکەش دەکات، ئەوە دوای ئەوەی جیهانی ئیسلامیی گەیشتووە بە حاڵەتێك لە ڕەتکردنەوەی تەواو بۆ هەر ئارەزوویەك کە دان بنێت بە عەقڵانیەتدا)) (فۆکۆ یاما، ١٩٩٢: ٢١١– ٢١٢).

بە ڕاستی ئاستەنگێکە شایانی لا لێکردنەوەیە، بەتایبەتی کاتێك نموونەی ئەم شیکردنەوەیەی کە فۆکۆ یاما پێشکەشی دەکات، دەبێتە یەکێك لە گرنگترین ئەو تێڕوانینە تیۆرییانە کە بەکاردەهێنرێت بۆ لێکدانەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی لە دوا دەیەی سەدەی بیستەمدا ڕوویانداوە، ئەو لێکدانەوەیەش لەکاتێکدا دەخرێتە ڕوو کە فرەیی (پلۆراڵیزم) وەك یەکێك لە بەها ئینسانیە بنەڕەتییەکان لە چوارچێوەی

کولتووری جیهانییدا پێشکەش دەکرێت و لەکاتێکدا پێشەوایانی دیموکراسیە لیبراڵیزمەکان پشتگیریی لە ڕژێمە سیاسییە شمولیەکانی ناو جیهانی ئیسلامیی دەکەن، بۆ سەرکوتکردنی ئەو داخوازییە دیموکراسییانەی گەلانی موسڵمان داوای دەکەن، وەك ئەوەی کە لە جەزائیر ڕوویدا، بۆ نموونە، ئەگەر ڕاستە پلۆرالیزم یەکێکە لەو بەها بنەڕەتییانەی کە هاوڕێکە لە کۆدەنگیی جیهانییدا، دەرەنجامی سروشتی ئەو کۆدەنگییە ئەوە دەخوازێت کە بەردەوامبوونی پێوەرە ژیارییەکانی ئایینی ئیسلام ڕێزلێگیراو بێت، چونکە مانەوەی پێوەرە ڕەسەنەکانی شارستانێتی ئیسلامیی زەحمەتە لە سایەی نەبوونی ژینگەیەکی کولتووری پلۆرالیزم دا، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە نەریتە ڕۆژئاواییەکە دان بە پلۆرالیزمدا نانێت جگە لە پلۆرالیزمێك نەبێت کە لە چوارچێوەی نموونە شارستانییەکەی خۆیدا بێت، ئەوەش وای لێدەکات ڕێگا بدات بە بوونی ئایدۆلۆژیا جیاوازەکان تەنها لە چوارچێوە ڕۆژئاواییەکە خۆیدا، دوای ئەوە دەکرێ بووترێت کە ئەو سیفەتە قۆخکاریی تێڕوانینی ڕۆژئاوایی جیا دەکاتەوە - ئەوەی کە لە بەشی دووەمدا شیکرایەوە- هۆکاری سەرەکیە وا لە ڕۆژئاوا دەکات نەتوانێت لەوە تێبگات بۆچی موسڵمانەکان توخمە بنەڕەتییەکانی باکگراوندی شارستانێتی خۆیان لە خۆشگوزەرانیی ماددیەتی مۆدێرنیزم لەلا باشترە.

مەبەستێکی سیاسیی شاراوە هەیە بۆ پاساودانی هەر جۆرە شیکردنەوەیەکی دوو پێوانەیی (الكيل بمكيالين) لەسەر حسابی ڕوانینی بابەتیانە، کە وای لێدەکات چاوپۆشیی بکات لە ڕەهەندی قووڵی تیۆریی ئەو مەسەلەیە، چونکە ئامانجی سەرەکی ئەوەیە کە بەهانە پێشکەش بکات بۆ پاساودان بەو سیاسەتانەی زلهێزەکانی سیستمی جیهانیی لەسەری دەڕۆن، بۆ نموونە (ئوسوڵیەتی ئیسلامیی) هەمیشە وەسف دەکرێت بەوەی کە تووندڕەوە و دژی پێوەرەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوایە، بۆیە پێویستە لە هەر شوێنێك بێت سەرکوت بکرێت، تەنانەت ئەگەر ئەو سەرکوتکردنەش ببێتە هۆی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و هەتاکو ئەگەر شێوازە

سەرکوتکردنە بەکارهێنراوەکانی دژ بە ئوسولیەت ڕێگر بن لەبەردەم دیموکراسییدا، ئەو دیموکراسییەی کە بە بەرزترین قۆناغەکانی عەقلانیەتی مرۆڤایەتیی دادەنرێت، سیاسەتی بانێکە و دوو هەوا کە هێزە ڕۆژئاواییەکان دەیگرنەبەر، وەك ئەوەی لە ڕۆمانیا و جەزائیر دەرکەوت بۆ نموونە، بە بیانووی بەدەمەوەچوونی داواکارییەکانی جەماوەر بۆ گۆڕینی ئەو ڕژێمە شمولییە گەندەڵانەی کە حوکم دەکەن، لە کوەیت و بۆسنەش بە بیانوی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ڕێزگرتنی ئەخلاقیاتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، دەڵێین ئەو سیاسەتە بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو پاکانە لایەنگیرانە هێنراونەتە کایەوە کە شێوەی (شیکردنەوەی زانستییان) وەرگرتووە، پوختەکەی بریتییە لە پاکانەکردنێکی پراگماتیکیانە بۆ ئامانجە سیاسییەکان، دوابەدوای ئەوەش پلۆرالیزم کاتێك جێبەجێ دەکرێت کە خزمەت بە بەرژەوەندییە قۆرخکارییەکانی شارستانیەتە باڵادەستەکە بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو شارستانێتییە وێرانکردن و پەراوێزکردنی هەموو کولتوور و شارستانێتییە ڕەسەنەکانیش بکاتە ئامانج. لێرەدا ئەنجامگیرییەکەی فۆکۆ یاما لەگەڵ شیکردنەوەکەی گالتینگدا یەك دەگرێتەوە کە تایبەتە بە مەیلی ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاوایی (١٩٨٥: ١١).

پێشتریش باسمان لەوە کرد کە فۆکۆ یاما وادادەنێت ((ڕۆژئاوا ـ ئەوروپای ڕۆژئاواو و ئەمریکای باکوور بە دیارییکراوی ـ سەنتەری جیهان دەنوێنێت، بەڵام بەشەکەی تری جیهان هەمووی تەنها پەراوێزە، یان چێوەی ئەو سەنتەرەیە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەوە کە سەنتەر بزوێنەری یەکەمی جیهانە)).

ئەو تەڵە مەنهەجیەی ـ کە ئەو شیکردنەوانە بەرهەمدەهێنێت ـ دەبێتە هۆی دروستکردنی کۆسپێکی وێناگیری و تیۆری و مەفاهیمی کە ڕووبەڕووی پەرەپێدانی هەر چوارچێوەیەکی بابەتیانەی توندوتۆڵ دەوەستێت، کە بتوانێت لەو بنەما دەروونیی و تیۆریی و مێژووییانە تێبگات کە هۆکاری مانەوەی نەگۆڕەکانی شارستانێتی ئیسلامیین، شیکردنەوەی ئەو دیاردەیە بەبێ زانینی جیاوازییە

جەوهەرییەکانی نێوان هەردوو ڕوانگەی ئیسلامیی و ڕۆژئاوایی بۆ کات و مێژوو مومکین نابێت، لەو سۆنگەیەشەوە جیاوازیی نێوان تێڕوانینی ڕۆژئاوایی و ڕوانگەی ئیسلامیی بۆ کات پێویستە خاڵی دەستپێك بێت، بۆ ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی بەراوردکاریی ورد.

تێڕوانینی ڕۆژئاوایی بۆ کات لەسەر ئاڕاستەی تاکلایەنی ڕەوتی مێژوویی دامەزراوە، ئەو تێڕوانینەش گریمانەی پەرەسەندن دەکات لە نزمترینەوە بۆ بەرزترین تا بە کەڵەکەبوونێکی ئیجابیی کۆتایی دێت، بۆیە وای ڕادەگەیەنێت کە عەقڵانیەتی ڕەها بۆ بڵندبوونەوەی مرۆڤانە، بێگومان لە میانەی بونیادە شارستانێتییەکانی ئێستاوە دێتە دی، چونکە بەرزترین فۆڕمی بڵندبوونەوەی ئینسانی پێکدێنێت، بەو گریمانەیەی کە ئەم سەردەمە دوا قۆناغی ئاڕاستەی تاکلایەنەی مێژووییە، لەسەر بنەمای ئەو تێڕوانینە، ئەنجامی لۆژیکیی بریتی دەبێت لە بزربوونی گشت شێوە کلاسیکیە ڕەسەن و نەژادزادەکانی شارستانێتییەکانی تر، چونکە ئاستە نزمەکانی عەقڵانیەت لە قۆناغە مێژووییەکانی پێشوودا دەنوێنن، لەو ڕوانگەیەوە هیچ جێگایەك، یان بوونێك نامێنێتەوە بۆ کولتووورە ڕەسەنەکان نە لە گەردوون و نە لە مێژوودا، بۆیە لە نموونەی ئەو تێڕوانینانەوە هیچ چاوەڕوانییەك ناکرێ بۆ قبوڵکردنی پێکەوەژیانی ئاشتیانە لە نێوان کولتووورە جیاوازەکان و شێوازە کۆمەڵایەتییە لە یەك جوداکاندا، ئەگەرچی ئەوە خواستێکی بنەڕەتییە بۆ گەیشتن بە پلۆرالیزمێکی ڕاستەقینەی ڕیشەداردا.

بە پێچەوانەی تێڕوانینی ڕۆژئاواییەوە، دەبینین تێڕوانینی ئیسلامیی بۆ کات و بۆ مێژوو جەخت دەکاتەوە لەسەر سروشتە بازنەییەکەیان و هەروەها لەسەر نەگۆڕی بەها ئیجابییەکان و شێوازە ڕەفتارییە ڕاستەکان لەپێناو بەدیهێنانی پەرەسەندنێکی ڕاستەقینەدا، کە بنچینەکەی بریتییە لە پاراستنی هاوسەنگیی لە نێوان ڕۆح و ماددەدا، گومان لەوەدانییە کە ئەم ئاڕاستەیە سەرەتایەکی کەڵەکەبووی ئیجابیی دەخوازێت، لەگەڵ کارکردن بۆ بەدیهێنانی بونیادی پێویست بۆ گەیشتن بە

کۆتاییەکی کەڵەکەبووی ئیجابیی دووبارە، خۆ ئەگەر هەر دیاردەیەکی مێژوویی ڕێکنەکەوت لەگەڵ بەها نەگۆڕەکاندا، ئەو مافەی نابێت داوای سەروەریی بۆ خۆی بکات، تەنها لەبەر ئەوەی لە دوا قۆناغی مێژووییدا دەرکەوتووە، ڕاستە لەوانەیە سەروەرییەکی ماددیی دەستەبەر بکات، بەڵام شەرعییەت و میصداقیەتی پێویست بۆ سەروەری ڕاستەقینەی هەمیشەیی دەست ناکەوێت.

بە ڕای ئێمە، ئەم تێڕوانینە ئیسلامییە وەك باکگراوندێکی دەروونیی و تیۆریی وایە لە پشت نەبوونی شەرعییەتی سەروەریی ڕۆژئاوادا، هەر ئەوەش هۆکار و پاڵنەری پێویستبوونی پاراستنی ناسنامە و ڕەسەنایەتی پێوەر و بەها نەگۆڕەکانی شارستانێتییەکانی ترە، سەرباری ئەوەش ئەم تێڕوانینە ئیسلامیە دوو خاڵی گرنگ دەوروژێنێت:

**یەکەم:** ئەوەیە کە شارستانێتی ڕۆژئاوا کە شەرعیەتی بەهاکانی نییە و تەنها پشت بە باڵادەستبوونی ماددیی ڕووت دەبەستێت، ناتوانێ بەرزترین وێنەی شارستانێتی ئینسانی پێکبهێنێت، لەبەر ئەوە لەسەر جەماوەرە موسڵمانەکە پێویستە کە بە وردیی و بە ئاگا بگەڕێت و دەستبژێریانە مامەڵە لەگەڵ پێکهاتەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوادا بکات.

**دووەم:** ئەوەیە جیهانی ئیسلامیی کە پێگەی خۆی وەك هێزێکی شارستانێتی کارا لە دەست داوە، هێشتا لە توانایدایە ئەو پلە و پێگەیەی خۆی بگێڕێتەوە لەسەر بنەمای چەمکی بازنەیی کات، ئەوەش دووبارە نوێکردنەوەی بەها نەگۆڕەکانی شارستانێتی ئیسلامیی دەخوازێت، لەبری خۆگێلکردن لەو بەها و نەگۆڕانە، هەروەها لەبری لایەنگیرییکردن بۆ بەهاکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا.

لە ڕاستیدا ئەو تێڕوانینە تیۆریە بۆ مێژوو ـ کە جەخت لەسەر بازنەیی بوونی پەرەسەندن دەکاتەوە— لە وەسفکردنی قورئانیی بۆ ڕووداوە مێژووییەکان وەرگیراوە، قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکات بۆ هەڵسانەوە و ڕووخانی کۆمەڵگەکان و شارستانێتییەکان بەبێئەوەی هیچ قۆناغێکی کاتیی دیاریی بکات، ئەوە ئەو

ئەنجامەی لێوەردەگیرێت کە هەڵسانەوە و ڕووخانی شارستانێتییەکان و شەرعیەتبوونیشیان، پەیوەست نییە بە بوونی ئەو شارستانێتییەوە لە چوارچێوەیەکی کاتیی دیارییکراودا، بەڵکو پەیوەستە بە پلەی یەکەم بە جێبەجێبوونی بەها تایبەتەکانی لە شێواز و شێوە و ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکاندا، چیرۆکەکانی نەتەوەکانی ڕابردوو وەك (عاد و ثمود و..) ئەو ڕاستییە ڕوون دەکەنەوە کە داڕووخانی کۆمەڵگەکانیان بە هۆی داڕووخانی ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکانەوە بووە، نەوەك لە ئەنجامی گەیشتن بە دوا پلەی عەقڵانیەت، یان لوتکەی پێشکەوتنی ماددیی.

مالیك بن نەبی - بیرمەندی جەزائیریی ناسراو - یەکێکە لە ناودارترین ئەو بیرمەندانەی کە تەعبیریان لەو تێڕوانینە ئیسلامییە کردووە، بەو مانایەی لەپێشەوە باسمان لەبارەوە کرد، بەشێك لە کتێبەکەی لە بارەی دیاردەی بازنەییەوە بە ئایەتێکی قورئانیی دەست پێکردووە بۆ ڕۆشنبوونەوەی بنەما قورئانییەکانی تێڕوانینی ئیسلامیی پەیوەست بە مێژوو، ئەو ئایەتە ئەمەیە: (وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ) (آل عمران: ١٤٠). لەم تێڕوانینە قورئانیەوە بۆ مێژوو، دوو دەرەنجامی گرنگ بەدیار دەکەوێت کە پشتگیری خاسیەتە دەروونییەکانی کەسێتی موسڵمان دەکەن و هانیدەدەن بۆ پارێزگارییکردن لە نەگۆڕە ژیارییەکانی ئیسلام: یەکەمیان ئەوەیە سەروەریی ڕاستەقینە لەسەر بوونیادی بەهادار و ڕۆحیی ڕادەوەستێت[٢٦]،

[٢٦] مالیك بن نەبی وەسفی پەیوەندیی نێوان سیستمی بەهاکان و گۆڕانی شارستانێتی دەکات و دەڵێت: ((مرۆڤ دەتوانێت لەو بەهایانە تێبگات کە زانای پایەبەرزی کۆمەڵناسی موحەممەد (دروود و سەلامی خوای لەسەر) پەیوەستی کردوون بە ڕەوشتە جوانەکانەوە، بەو سیفەتەی کە هێزی جوولێنەری شارستانێتییەکانن. بەڵام بە هاتنی سەدەکانی پووکانەوە و دواکەوتن پێوەری بەهاکان پێچەوانە بوونەوە، شتە سادە و بێنرخەکان وەك شتی گەورە سەیر دەکرێن، لە ئەنجامدا بینای کۆمەڵایەتی نەیتوانیوە ئەو هەموو بارگرانییە هەڵبگرێت، هەروەك پایە تەکنیکی و زانستی و عەقڵیەکانیش نەیانتوانی بەرگە بگرن، سەرەنجام بە داڕووخان کۆتایی هات، چونکە ڕۆح بە تەنها دەتوانێت مرۆڤ بەرز بکاتەوە و بەرەو پێشی

بەوەش ئەوە لێکدەداتەوە کە لەگەڵ حاڵەتە مادديە داڕووخاوەکەدا، موسڵمانەکان هێشتا ئەوەندە بەهای شاراوەیان هەیە کە ئامادەسازیان بکات بۆ ئەوەی ببنە مامۆستای گەلانی ڕۆژئاوا، دووەمیان ئەوەیە کە ژیانەوەی هەتاهەتایی و داڕووخانی هەتاهەتایی لە مێژوودا نییە، کەواتە لە توانای موسڵمانەکاندا هەیە کە جارێکی تر پێگەی خۆیان وەك شارستانێتییەکی کاریگەر بگێڕنەوە، بە مەرجێك سیستمی بەهاکانیان ئەکتیڤ بکەن، بە شێوەیەکی گونجاو لە بوارە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکاندا.

تێڕوانینی ئیسلامیی بۆ مێژوو لایەنی دووەم لە لایەنەکانی مانەوەی ڕەسەنایەتیی و پلۆرالیزمی کولتووریی ڕۆشن دەکاتەوە، کە مەبەست لێی مومارەسەی مێژوویی شارستانێتی ئیسلامییە کاتێك باڵادەست بووە بەسەر چەندین کولتووری نەژادزادەی تردا.

لێرەدا دەبینین کە مومارەسەی مێژوویی ئیسلامیی پێچەوانەی ئەو خەسڵەتە قۆرخکارییە بوو کە شارستانێتی ڕۆژئاوایی پێ دەناسرێتەوە، ئەو مومارەسەیە ژێرخانێکی بوونیادی بەپیت لەسەر هەردوو ئاستی تیۆریی و پراکتیکیی دابین دەکات بۆ دانانی تێڕوانینێکی بەدیل، هەروەك مێژووی شارستانێتی ئیسلامیی دەوڵەمەندە بە زۆرێك لە نموونەی پرشنگدار بۆ پلۆرالیزمی ئایینیی و کولتووریی کە شوێن و ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی پێویست بۆ ژیانی کولتوورەکان و شارستانێتییە ڕەسەنەکان دابین دەکات. ئەوە بەردەوام ئاسان بووە بە هۆی ملکەچبوونی کردە ئابوورییەکان بۆ ڕێنماییەکانی سیستمە پێوەرکارییەکانی کۆمەڵگە.

بەهەرحاڵ بەراوردکاریی مێژوویی زامنە بۆ دەرخستنی جیاوازییە جەوهەرییەکان لە نێوان ڕێنماییە ئیسلامییەکان و هاوشێوە ڕۆژئاواییەکانیانیدا، موسڵمانەکان

---

بەرێت، هەرکاتێك ڕۆحیش شەفافیەتی خۆی لەدەست دا، پووکانەوە دەست پێدەکات و پاشانیش داڕووخان)) (ابن نبی، ١٩٩١: ١٠).

ئیسپانیایان ڕادەستی سوپاکانی مەسیحیەت کرد لە هەمان ئەو سەردەمەدا کە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپایان فەتح کرد و هێزە مەسیحیەکانیان لێوەدەرنان، ئەوە لە هەردوو سەدەی پازدەهەم و شازدەهەمدا بوو، ئەوەی کە ڕوویدا ئەوە بوو کە لە سایەی حوکمی ئیسلامییدا کە پێنج سەدەی خایاند لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا، وجودی کولتورە خێڵەکیی و ئایینیی و نەتەوەییەکان بەردەوام بوو وەك هێزی مێژوویی ڕاستەقینەی خەڵکی ڕەسەنی ئەو وڵاتانە لەو ناوچەیەدا، لە بەرامبەریشەوە کەلەپوری ئیسلامیی لە ئیسپانیا بەشێوەیەکی دڕندانە بە تەواوی تێکشکێنرا لەسەر دەستی مەسیحیەکان لە ماوەی کەمتر لە پەنجا ساڵی حوکمڕانیان لەو وڵاتەدا، هەروەها کەلەپووری شارستانێتی ئیسلامیی دواتر لە ناوچەی (بەلقان)دا لەلایەن سوپاکانی مەسیحیەتی ڕۆژئاواوە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا لەناوبرا، دواتریش پڕۆسەکانی پاکتاوکردنی ڕەگەزیی دڕندانە لە بەرامبەر موسڵمانانی بۆسنە و هەرسك لە دەیەی دوایی سەدەی ڕابردوودا ئەنجام درا.

دوای ئەوەی مارکسیزمەکان و مەسیحیەکانیش هەمان سیاسەتی وێرانکارییان گرتەبەر، لە ئەنجامی ئەوەی کە هەمان تێڕوانینی مێژووییان هەیە کە پشت بەستووە بە ئاڕاستەیەکی باڵادەستیی بۆ شێوازەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا، داگیرکارە ڕۆژئاواییەکان هەربەوشێوەیان کرد کاتێك هەڵسان بەدوورخستنەوەو وێرانکردنی شارستانێتی و کولتورەکانی هیندستان لە بەرژەوەندیی ڕژێمە سیاسیی و ئابوورییەکانیان، لە بەرامبەریشەوە و لە هەمانکاتدا، دەبینین کە ئیسلام لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بڵاوبوویەوە لە ڕێگای تێکەڵ بوون لەگەڵ کولتورە ڕەسەنەکانی ئەو ناوچانەدا، ئەو کاتەی سوپاکانی ڕۆژئاوای مەسیحیەت بە ڕووخسارێکی ئیستیعماریی نەخوازراوەوە ئەفریقیایان داگیر کرد، ئیسلام لە هەر لایەکی کیشوەری ئەفریقیادا بڵاوبویەوە بە ڕێکارە ئاشتییەکان و توانی زۆر بە ئاسانیی پێکەوەژیان مومارەسە بکات لەگەڵ نەریتە ئایینییەکانی دانیشتوانی ئەفریقیادا.

ئەو نموونانەی کە باسمان لێوەکردن تەنها ڕاستی مێژوویی لابەلایی نین، بەڵکو وێناکردنی دوو چەمکی دژ بە یەکن بۆ بیرۆکەی پلۆرالیزم، لە ڕوانگەی شارستانێتی ڕۆژئاواوە دەبینین کە پلۆرالیزم پشت بەستووە بە ئامرازە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکان، لە لایەکی ترەوە شارستانێتی ئیسلامیی دێت بە پلۆرالیزمێکی ئاڵوگۆڕکاریی کە سەروەری دەدات بە سیستمی بەهاکان و سیستمە یاساییەکان بەسەر ئامرازە ئابووریی و سیاسییەکاندا. ئەمە لە پاڵ ئەوەدا ئەو ڕێزگرتنەی موسڵمانەکان دەیبەخشن بە کۆمەڵگە ئایینییەکانی تر کە دەچوونە ڕێکەوتن لەگەڵیاندا، دەبووە ئەرکێکی ئایینیی و شوێنکەوتنی کرداری پێغەمبەری ئیسلام (موحەممەد (درودو سەلامی خوای لەسەر)، ئەو بەڵگەنامەی کە لەگەڵ (ئەهلی نەجران) لە یەمەن گرێی دا، گۆڕاوە بۆ شێوازێکی ڕەفتاری ڕیشەدار و موسڵمانان لە سەرتاسەری مێژوودا ڕێنمایی لێوەردەگرن، لەو بەڵگەنامەیەدا هاتووە: ((بسم الله الرحمن الرحيم، اله ابراهيم واسحاق ويعقوب، أما بعد، فاني ادعوكم الى عبادة الله من عبادة العباد، وادعوكم الى ولاية الله من ولاية العباد، فإن ابيتم فالجزية، ولنجران وحاشيتها جوار الله و ذمة محمد النبـي رسول الله، على اموالهم وأنفسهم وأرضهم وملتهم، وعائدهم وشاهدهم، وكل ماتحت ايديهم من قليل أو كثير، و لا يغير أسقف عن اسقفيته، و لا راهب عن رهبانيته، و لا كاهن عن كهانته و ليس عليهم دنية و لا دم جاهلية و لا يحشرون و لا يشعرون، و لا يطأ أرضهم جيش)). (الشيباني، ١٩٦٦: ٢٧٩).

ئەوانەی کە بڕوایان وایە مرۆڤایەتی لە بەرگی مۆدێرنێتەدا گەیشتووە بە لوتکەی عەقڵانیەت، لە سەریانە لێکدانەوە لە ڕاستی بیروڕاکانیان بکەن، دوای ئەوەی بەراورد دەکەن لە نێوان ئەو بنەمایانەی کە لە سەدەی یەکەمی کۆچی (حەوتەمی زاینی دا) ڕاگەیەندراون، لەگەڵ ئەو جیاکارییە ڕەگەزیی و پاکتاوکردنی نەژادیی و هەموو ئەو ناڕەواییانەی تر لە داپڵۆسین و تۆقاندن، کە لە سەدەی بیستەمدا دەستیان پێ سوور بووە.

# بەشی شەشەم:

# قەیرانی بیر و دامەزراوەکان لە ئوممەتی ئیسلامییدا

# ئایا دەکرێ سەنتەرێکی شارستانێتیی نوێ بنیات بنرێت؟

هۆکاری بنەڕەتیی زیادبوونی گرفتارە سیاسیی و دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکانی نێوان کۆمەڵگە موسڵمانەکان، بەتایبەتی و هەموولایەکی ئوممەتی ئیسلامیی بەگشتیی، لەو لێکدوورکەوتنەوەدایە کە لە نێوان ئەو ئیدراکە زاتییە ئیسلامیە بەهێزە - کە بۆ خۆی تیۆرێکی بەدیلی سەرکەوتوو پێشکەش دەکات - و لە نێوان واقیعی ئەم ڕۆژگارەی کۆمەڵگە موسڵمانەکانی تێدا دەژین لە سایەی سیستمێکی جیهانییدا بۆ دابەشکردنی هێزەکان، کە هیچ دەرفەتێکی بۆ ئەم کۆمەڵگایانە نەهێشتۆتەوە بۆ ئەوەی هەڵسن بە ڕۆڵێکی کارا و کاریگەر لەسەر گۆڕەپانی جیهانیی وەك هەموو سیستمە سیاسیی و ئابوورییە گەورەکانی تر.

لاوازیی لە کاراکردنی تیۆرێکی ئیسلامیی بە شێوەیەکی کرداریی لەپێناو بونیادنانی سەنتەرێکی شارستانێتی بەدیلدا، دەرەنجامی ئەو ئیشکالیەتە ژیارییەیە کە لەم سەردەمەدا جیهانی ئیسلامیی ڕووبەڕووی بووەتەوە، بەڵام پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە ئەو ئیشکالیەتە ژیارییەی ئەمڕۆ جیاوازە لەو ئیشکالیەتە مێژووییەی کە بووەتە هۆکاری گواستنەوەی سەنتەری شارستانێتی ئیسلامیی لەو ناوچەیەوە بۆ ناوچەیەکی تر: لە دیمەشق بۆ بەغدا، لە بەغداوە بۆ قاهیرە، دوای ئەوەش بۆ ئەستانبوڵ، یان ناوچە گەشەکردووەکانی تر لە ڕووی شارستانێتییەوە، وەك (ئیسپانیا و هیندستان و ئەندەلوس). بێگومان قەیرانی زۆریش هەبوون کە هاوڕێکی پرۆسەی ئەو گواستنەوەیە دەبوون، بەڵام لە قەیرانی شارستانێتی ناوخۆیی دەرنەدەچوو، بە خێرایی لەناو نموونە شارستانێتییەکە خۆی دا چارەسەر دەکرا، بە دووبارە بونیادنانەوەی سیستمە سیاسیی و ئابوورییەکان لە نێو سەنتەرێکی ژیاریی نوێ دا کە خاوەنی هێز و زیندوێتی دەبوو، بەڵام ئیشکالیەتی ئەم ڕۆژگارە کە ڕووبەڕووی ئوممەتی ئیسلامیی بۆتەوە تائێستاشی لەگەڵدا بێت، هەمەلایەنەترە و لەوە زیاترە کە تەنها قەیرانێکی ژیاریی ناوخۆیی بێت، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە سەرۆەریی بە شێوەیەکی ئاشکرا گواستراوەتەوە بۆ شارستانێتییەکی تر کە مۆرکێکی ماددیگەریی ڕووتی هەیە، سەرباریی ئەوەش، لە ئەنجامی ئەو خەسڵەتە

شمولیەی کە شارستانێتییەکەی ڕۆژئاوا هەیەتی، ئەو قەیرانەی کە ئێستا ڕووبەڕووی ئوممەتی ئیسلامیی بووەتەوە و ناتوانێت بەسەریدا زاڵ ببێت، تەنها بە ئەنجامدانی هەندێك گۆڕانکاریی لە توخمەکانی نموونەی شارستانێتییە مێژووییەکەدا، لە ئەنجامی ئەو ئاستەنگەدا بزاڤە تەقلیدییە ئیسلامخوازە نوێیەکان سەرکەوتنیان بۆ نەنووسرا، بۆ نموونە: ئەگەرچی هێرشەکانی مەغۆل کە زۆربەی ناوەندەکانی تیشکدانی شارستانێتی لە جیهانی ئیسلامییدا وێران کرد، بەڵام موسڵمانەکان توانیان بەسەر ئەو قەیرانەدا زاڵ بن، لە ڕێگای سەرلەنوێ گێڕانەوەی زیندوێتی شارستانیانەوە، هۆکاری سەرەکییش بۆ سەرکەوتنیان ئەوە بوو کە (تەحەددیی) مەغۆل بە تەنها سەربازی بوو بەس، بەڵام کاتێك هێزە کۆلۆنیالیزمەکانی ئەورووپا جیهانی ئیسلامییان داگیر کرد، بە هەموو ئەوەی کە هەیانە لە سیستمە فیکریی و سەربازیی و سیاسیی و ئابوورییەکان، هەوڵیان دا بۆ سەپاندنی ئیدراکێکی زاتیی جیاواز لە ناسنامەی ئیسلامیی ڕەسەن، لەو هەلومەرجەدا بارودۆخێکی نوێ پەیدابوو کە بنەڕەتەکەی هەستکردن بە کەمیی بوو، لە ئەنجامی ئەو شۆکەدا کە دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان دروستیان کرد، کاردانەوەکەی کۆمەڵگە موسڵمانەکان پشتبەستوو بوو بە ئیدراکێکی زاتیی کە لەسەر بنەمای تێڕوانینە تیۆریی و شارەزاییە مێژووییەکان دامەزرا بوو.

سەرەنجام سەروەریی ماددییگەرایی شارستانێتی ڕۆژئاوا بووە هۆی دەرکەوتنی دوو جۆر وەڵامدانەوە لە جیهانی ئیسلامییدا، ئەوەش دوای ئەو شکستەی کە دووچاری هەوڵە تەقلیدییە نوێیەکان بوو بۆ ژیانەوەی شارستانێتی ئیسلامیی لە ڕێگای ئەنجامدانی هەندێك گۆڕانکاریی لە نموونە مێژووییەکەدا، وەڵامدانەوەی یەکەم بریتی بوو لە دەرخستنی ڕادەی پێکەوە گونجان لە نێوان سەرچاوە جەوهەرییەکانی ئیسلام و زانستە ڕۆژئاواییە نوێیەکان کە ژێرخانی باڵادەستی ماددیی ڕۆژئاوای پێکهێنابوو، ئەو ئاڕاستە ڕیفۆرمخوازیە ڕەهەندێکی لە خۆگرتبوو بانگەشەی دەکرد بۆ خاوێنکردنەوەی عەقیدەی ئیسلامیی لەو شتانەی کە تێکەڵی بوون و گەڕانەوە بۆ

حاڵەتە ڕۆشنەکەی یەکەمی، ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کە ئەم ئاڕاستەیە لە هەوڵی ئەوەیدا بوو چارەسەر بۆ گرفتارییەکان لەناو خودی ڕێنماییە جەوهەرییەکانی ئیسلام خۆیەوە بدۆزێتەوە، ئەو تێڕوانینەش لەسەر ئەو گریمانەیە بونیاد نرابوو کە لەمپەر و کۆسپێك کە ڕێگرە لە بەردەم بەدیهاتنی باڵادەستیی ئوممەتی ئیسلامیی لە ڕووی ماددییەوە، بە هۆی پراکتیزەکردنی ڕێنماییە ئیسلامییەکانەوەیە بە ڕێکارە مێژووییەکان، نەك بە هۆی خودی ڕێنماییە ئیسلامییەکانەوە بێت، بەڵام وەڵامدانەوەی دووەم ئامانجی ئەوە بوو کە گۆڕانکاریی شارستانێتی هەمەلایەنە ئەنجام بدات لە ڕێگای بەرپاکردنی شۆڕشێکی بەڕۆژئاواییکردنەوە، هەڵگرانی ئەم ئاڕاستەیە ئەوەیان کرد بووە گریمانە کە کۆسپی گەورە کە ڕێگرە لەبەردەم تێگەیشتن و قبوڵکردنی کۆمەڵگە موسڵمانەکان بۆ شێوازی ژیانی نوێ، دەرەنجامی پراکتیزەکردنی مێژووییانەی ڕێنماییە ئیسلامیەکان نییە و بەس، بەڵکو لە خودی ڕێنماییە ئیسلامییەکان خۆیانەوەیە.

**أ- قەیرانە فیکرییەکە:**

ئەم قەیرانە قەیرانی نموونە فیکرییە بنەڕەتییەکەیە کە نوخبەی فیکری ئیسلامیی پشتیوانی لێدەکات و توانی لەو ڕێگایەوە پەرەسەندنی ڕۆشنبیریی لە جیهانی ئیسلامییدا ئاڕاستە بکات و لە چوارچێوەیەکی فێرکارییدا دایبڕێژێتەوە کە تایبەتمەندیی خۆی هەبێت و لەوانی تری جیا بکاتەوە.

ئەو گۆڕانکارییە ژیارییەی سەپێنراوە بەسەر جیهانی ئیسلامیی دا دوای بەڕۆژئاواییکردنی ناسنامە ئیسلامییەکەی، ئامانج لێی دروستکردنی نوخبەیەکی فیکریی هاوسۆز بوو بۆ ڕۆژئاوا، لە ڕێگای دامەزراوە فێرکارییەکانەوە کە ئاڕاستەیەکی ڕۆژئاواییانەیان هەبوو، بە شێوەیەك کە بتوانن ڕێبەرایەتی گۆڕانکارییە ژیارییەکە بکەن و پاساویشی پێ بدەن، بەڵام دوای ئەو سیاسەتانەی کە لە سەدەی بیستەمدا پراکتیزە کران، ئەستەم بوو متمانە بکرێت بەو ڕۆڵەی کە ئەو نوخبەیە بینیان، یان شەرعیەت وەربگرێت لە لایەن جەماوەرە موسڵمانەکەوە، لەبری ئەوە

حاڵەتێك لە جەمسەرگیریی پەیدابوو لە نێوان ڕۆشنبیریی نوخبە و ڕۆشنبیریی جەماوەردا، کە بەدەوری خۆی هەوڵیدا بۆ دۆزینەوەی کەناڵی نوێ بۆ ئەوەی بەشداریی لە پرۆسەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتییدا بکات.

خۆ ئەگەر بمانەوێت پڕۆسەی گۆڕانکارییە فیکرییەکە و دەرهاویشتە دەروونیی و ڕۆشنبیرییەکانی ڕوون بکەینەوە، پێویست بەوە دەکات کە بە پێشکەشکردنی چوارچێوەیەکی تیۆریی کورت زەمینەسازی بۆ بکەین، مەبەست ئەوەبوو کە لە سەر دەستی نوخبە غەرب زەدەکەوە کە کۆنترۆڵی دامەزراوە پەروەردەیی و فیکریی و کۆمەڵایەتییەکانیان لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا بەدەستەوەیە، لەلایەن ئەو نوخبەیەوە پڕۆسەیەکی گۆڕانکاریی فیکریی ئەنجام بدرێت، ئەوەش لە ڕێگای پەراوێزخستنی زانایانەوە، کە هەڵبژاردەی ڕۆشنبیریی و فیکری ئوممەتی ئیسلامیین.

زانایانیش لە تیۆری ئیسلامییدا بەوە وەسف دەکرێن کە ((میراتگری پێغەمبەرانن))، بە هۆی ئەو ڕۆڵە بنەڕەتییەی کە هەیانە لە بێدارکردنەوەی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، ئەو ئەرکەی کە تایبەتە بە زانایان وەك ڕابەر و ڕێنماییکاری جەماوەرە موسڵمانەکە، نموونەیەکی مەعریفیی و بەهاداری تایبەتیی دەخوازێت، بە شێوەیەك کە لەسەر گریمانەیەکی سەرەکی بونیاد نراوە کە دەرەنجامەکەی ئەوەیە پێکەوە گونجانێکی تەواو لە نێوان سەرچاوە مەعریفییەکاندا هەبێ، لەبەر ئەوە، نوێکردنەوە و ژیاندنەوەی ئەو نموونە مەعریفیە ئیسلامییە پێویستە (زانایانی ئوممەت) پێی هەڵسن، چونکە ئەوانن زانا و شارەزان بە بنەماکانی ئاینی ئیسلام وەك پەیامێکی ئاسمانیی، هەر ئەوانیشن کە دەتوانن جارێکیتر تەفسیری بۆ بکەنەوە بەپێی ئەو شێوازە مەنهەجیانەوە کە لە خودی نموونە مەعریفییە ئیسلامییەکەوە وەرگیرا بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پێگەی سیاسیی (زانایان) هەمیشە بە پێی هەلومەرجەکان دەگۆڕێت، بەڵام دوو تایبەتمەندیی گشتییان بۆ ماوەتەوە کە ئەمانەن:

دروستنەبوونی چینێکی دامەزراوەیی لە پیاوانی ئایینیی و هەڵسانیان بە ڕۆڵێکی دەرکەوتوو لەناو کۆمەڵگەدا لە سەردەمە تەقلیدییەکاندا، چونکە پێگەی زانایان هەمیشە جێگای ڕێز و قبوڵ بووە لای جەماوەرە موسڵمانەکە، پێکهاتەی ڕۆشنبیری تریش هەبوو کە بەشدارییان کردوە لە هەڵسان بە ڕۆڵی هاوشێوە، بەڵام ئەو ڕۆڵە بەرچاوەی کە زانایان پێی هەڵساون دوو ڕەهەندی سەرەکیی لەخۆ گرتووە: گواستنەوەی مەعریفەیەك کە خەسڵەتی پێکەوە گونجانی هەیە، لەگەڵ سەلماندنی ئەو مەعریفەیە و پاراستنیشی. ئەرکی گواستنەوە، یان (جێگیرکردن)، بەردەوامبوونی ئەو کەلەپور و میراتەی زامن کردووە کە پێغەمبەری ئیسلام، موحەممەد (دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت) جێی هێشتووە و هاوەڵەکان و شوێنکەوتووەکانیان لە دوای ئەوان هەڵیانگرتووە، بەڵام ئەرکی پاراستن و (ڕەتکردنەوە)ی گومانەکان، یان سەلماندنی ئەو مەعریفەیە و پێشکەشکردنی بەڵگەی نەقڵیی و عەقڵیی کە ڕاستیی ئەو مەعریفەیە بخاتە ڕوو، ئەوە ئەرکێکی لۆژیکیی چاوەڕوانکراوە بۆ پەیامەکەیان وەك ڕێبەرانی ئوممەت و ڕەتکردنەوەی هەر توخمێکی نامۆ کە بە هۆی کارلێککردن لەگەڵ شارستانێتییەکانی تردا، یان لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتیی و کولتوورییە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت، پرۆسەی سەلماندنی کەلەپوری ئیسلامیی بە بەردەوامیی کەڵەکەبوونی ڕۆشنبیریی و مەعریفی زۆر دەوڵەمەند بووە، لەکاتێکدا کە پرۆسەی ڕەتکردنەوە (الدحض) ڕێگر بووە لەبەردەم هاتنە ناوەوەی ئەو بیروباوەڕە تێکدەرانەی کە لەوانەیە هەڕەشە بن لەسەر بونیادی عەقائیدیی و مەعریفەیەك کە سەرچاوەکەی سروش (وحی)یە.

زانایان سەرکەوتوو بوون لە هەڵسان بە ئەرکی خۆیان، بەتایبەت لەو قۆناغەدا کە ئاستەنگەکان و تەحەددیاتی شارستانێتی لە مێژوودا زۆر توند دەبوون، ئەوەش بە هۆی زیندوێتی شارستانێتی ئیسلامیی و بەهێزیەوە، موسڵمانەکانیش هیچ دوودڵییەکیان نەبوو لە وەرگرتنی زۆرێك لە بیروڕا و توخمە بەسوودەکانی

شارستانییەکانی پێش شارستانێتی ئیسلامییەوە، کە هاوڕێك و گونجاو دەبوون لەگەڵ نەگۆڕ و پێوەرەکانی شارستانێتی ئیسلامییدا.

ئەگەر چەمکی (زانا) بە مانا دروست و گشتگیرەکەی لە کەلەپوری ئیسلامییدا وەربگرین — نەك بە مانایەکی کورتکراوە کە تەنها ئاماژە بە زانایەك، یان فەقیهێك، قازیەك، بکات، بەو شێوەیەی کە مونتیگومری وات (١٩٧٠: ٢١٠) کردوویەتی —، دەبینین کەلەپووری ئیسلامیی بە ڕۆڵێکی جەوهەریی بەشداریی کردووە لە میانەی پرۆسەی ڕەتدانەوە (الدحض)ەوە، گێڕانەوەی هاوسەنگیی بۆ فیکری ئیسلامیی، بەڵام ئەو ڕۆڵە لە مێژووی نوێدا لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەی تەحەددی شارستانێتیدا نەهاتۆتە دی، دوای ئەوەی جیهانی ئیسلامیی چووە هەڵوێستێکی بەرگرییکردنەوە لە بەرامبەر هەڵسانەوەی شارستانێتی ڕۆژئاوا و ئاڕاستە فراوانخوازییەکەیدا.

لەم سەردەمەدا پێویستیی بۆ پەیدابوونی نوخبەیەکی فیکری نوێ، دەرکەوت، بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆی هەبێ لە ئاڕاستەکردنی گۆڕانکارییە ژیارییەکان لە جیهانی ئیسلامییدا، بەڵام بەداخەوە، نوخبە غەرب زەدەکە، کە ئەو نوخبە نوێیەیە هەڵسێت بەو ئەرکە گرنگە، مەرجەعیەتێکی فیکریی، مێژوویی، نەبوو گونجاو بێت لەگەڵ شارستانێتی ئیسلامییدا، پەیدابوونی ئەو نوخبە فیکرییەش لە دەوڵەتی عوسمانییدا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر ئەو قەیرانە فیکرییەی کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئوممەتی ئیسلامیی پێوەی دەناڵێنێت.

ڕووداوە مێژووییەکان پێمان دەڵێن کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا دوو گرووپ لە جیهانی ئیسلامییدا دەرکەوتن بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی تەحەددی ڕۆژئاوا:

ئەو دوو گرووپەش: ئەهلی عیلم و ئەهلی قەڵەم (بیرۆکراتییەکان) بوون.

زانایان لە تواناییاندا نەبوو مامەڵەی دروست لەگەڵ ئەو ئەرکە گرانەدا بکەن، لە ئەنجامی ئەو تەمەڵی و لاوازییەی کە لە مێشك و دەروونیاندا ڕەگی داکوتابوو بەهۆی سیستمی قوتابخانە تەقلیدییەکانەوە کە ڕێگربوو لە بەردەم هەر بەرهەمهێنانێکی

فیکرییداو بەو هۆیەوە ئەستێرەی ئەم گرووپە ڕوولەئاوابوون بوو، لەبەر ئەوە ئەهلی قەڵەم (بیرۆکراتییەت) هەڵسان بە پڕکردنەوەی بۆشاییەکە و ڕۆڵە میحوەرییەکەشیان لە چالاکییە فیکرییەکاندا ڕێگای بۆ کردنەوە بۆ وەرگرتنی توخمە شارستانیە نوێیەکان و تێکەڵکردنی بە ژینگەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، ئەوەش بووە هۆی ڕوودانی گۆڕانکاریی دامەزراوەیی ڕیشەیی لە بوارە ئابووریی و یاسایی و سیاسییەکانی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا.

ئەو پەرەسەندنەی کە لە فیکری ئیسلامیی و لە جیهانی ئیسلامیی ڕوویداوە، بە تەواوی جیاوازە لەوەی کە لە ئەزموونی ڕۆژئاوادا ڕوویداوە، چونکە کەلەپووری مێژوویی ڕۆشنبیریی سەرچاوەیەکی مەعریفیی و بەهاکانە کە بۆچوونە فیکرییە ڕۆژئاواییەکان لێی هەڵدەگۆزن، ئەو سیستمە پەیوەستە بە ژینگە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکەی ناوخۆی شارستانێتی ڕۆژئاواوە. بۆچوونە فیکرییە نوێکە لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا بە ڕەنگدانەوەی ئەو گۆڕانکارییە شارستانیانە دادەنرێت لە شۆڕشی پیشەسازیی کەوتۆتەوە، هەروەك ئەو بۆچوونە پەیوەندیی توندوتۆڵی هەیە بە چینی بۆرجوازییەوە لەوێ، بە پێچەوانەی ئەو حاڵەتەی کە لە کۆمەڵگە موسڵمانەکاندایە، چونکە نوخبە فیکرییە لایەنگرەکەی شارستانێتی ڕۆژئاوا لە ئەنجامی گۆڕانکاریی شارستانێتییەوە پەیدا نەبووە، بەڵکو وەك هەوڵێك بۆ هێنانە کایەی وێنەی ئەو گۆڕانکارییە لە ڕێگای پشتیوانییکردنی پڕۆسەیەکی بە دامەزراوەکردنی بە زۆر سەپێنراو لە دەرەوەی چوارچێوەی شارستانێتی ئیسلامییەوە هاتۆتە کایەوە. سەرباری ئەوەش ئەو نوخبەیە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ بونیادی چینایەتیی کۆمەڵایەتیی ئابووریی دا نییە، لە ئەنجامی بزربوونی ئەو چینایەتییە ئابوورییەدا هەر لە سەرەتاوە لەناو کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، هەروەها وێناکردنی پراگماتیزمی مەرکەزیی بۆ تەقالیدە بیرۆکراتییەکان، ڕێگر بووە لە بەردەم دارشتنەوەی هەر لێکدانەوەیەکی هەمەلایەنی پێشکەوتوو بۆ ئەو تەحەدیە ژیارییە، بە هۆی کورتکرانەوەی کێشەکە تەنها بۆ لایەنە سەربازیی و سیاسییەکان.

نوخبە (ئەنتەلجانسیا) غەربزەدە (بەرۆژئاوایی بووە) کە خۆی لەگەڵ دەوڵەتدا بینیەوە، ئەوەی یارمەتی دا لەسەر ئەوە باکگراوندە بیرۆکراسیەکەی بوو، ئەوەش بوویە هۆی پەیدابوونی مومارەساتی سەرکوتکردن کە ئەو ئەنتەلجانسیایە ستراتیژیەتێکی ستوونیی لەسەر دامەزراند بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی گۆڕانکاریی ژیاریی، بە مەرجێك شێوەیەکی هەڕەمیی بەرەو بەرۆژئاواییکردنی هەمەلایەنە وەربگرێت، بەو شێوەیە نوخبەی غەرەب زەدەی کۆمەڵگە موسڵمانەکان ئیدراکێکی زاتیی نوێی پێشکەش کرد کە لەسەر پلانێکی گشتگیر ڕاوەستاوە بۆ گۆڕینی بۆچوونە فیکرییەکانی جەماوەر، ئیدراکە زاتییە نوێیەکە و هۆکارە هەڕەمکییەکانی کە ئەو نوخبەیە دەیگرێتە بەر، دژوارییەکی مەفاهیمی لە نێوان زانایاندا بەو سیفەتەی کە ڕێبەرە فیکرییە تەقلیدیەکانن، لەگەڵ نوخبە فیکرییە تازە پەیدابووەکەدا دروستکرد، دوابەدوای ئەوەش دژوارییەکی هاوشێوە لە نێوان نوخبە فیکرییەکە و جەماوەردا دروست بوو، ئەو دوژمنایەتییەش لە نێوان ئەهلی عیلم و ئەهلی قەڵەمدا لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا بەردەوام بوو، تا دوایی هات بە دوورخستنەوە و پەراوێزخستنی ئەهلی عیلم لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، لە ئەنجامی کۆنترۆڵکردنی ئەنتەلجانسیای غەرب زەدە و قۆرخکردنی گۆڕەپانە فیکرییەکە بە شێوەیەکی ڕەها..

ئەو نوخبە فیکرییە غەربزەدەیە و ـ هاوشێوەکانیان لە نوخبە سەربازیی و سیاسییەکان ـ کاریان کرد بۆ بەدیهێنانی سێ ئامانج کە ئەمانەن:

هێنانە کایەی کولتوورێکی نەتەوەیی نوێ هاوڕێك بێت لەگەڵ چەمکە ڕۆژئاواییەکاندا و بەدەستهێنانی گەشەپێدانی ئابووریی و بونیادنانەوەی هێزە سیاسیی و سەربازییەکە بۆ گەیشتن بە پێگەیەکی باشتر لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتییدا، هەروەها ئایدۆلۆژیاکانیان بە شێوەیەکی ڕەسمیی سەپاند، نەك تەنها بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە، بەڵکو بۆ جێگیرکردنی ئەو سیاسەتە

قۆرخکارییانەی کە نوخبە غەرب زەدەکان مومارەسەیان دەکرد لە بوارە جیاجیاکانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا.

ئەندامانی ئەو نوخبە فیکرییانە لە زۆربەی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا هەوڵیاندا بۆ هێنانە کایەی کولتورێکی نەتەوەیی پشتبەستوو بە ئیدراکێکی زاتیی نەتەوەیی و وەرگیراو لە تیۆرە تازە پەیدابووەکانی مێژووەوە کە ئوممەتی موسڵمانی هاوچەرخی پەیوەست دەکرد بە کەلەپوورەکانی پێش هاتنی ئیسلامەوە، بەشێوەیەك کە بە تەواوی بگونجێت لەگەڵ باکگراوندی مێژوویی ئەزموونی ڕۆژئاوادا، پرۆژە و تێزەکانی لایەنگرانی دەوڵەتی نوێی تورکیا کە نەژادە تورکیەکان و هیندۆئەوروپییەکان یەك بنەڕەتیان هەیە، هەروەها هەوڵە بێوچانەکان کە لە میسر دەدران بۆ زیندووکردنەوەی سەردەمی زێرینی فیرعەونیەت، ئەو دووە دوو نموونەی پراکتیزە کراوی تیۆرە تازەکەن بۆ کولتوور و مێژوو، لەوانەشە بانگەشەکانی (سەددام حسێن) بە دووبارە دامەزراندنەوەی شارستانێتی بابلی دوانموونە بێت لە نموونەکانی زیندووکردنەوەی کولتوورە نەتەوەییە مێژووییەکان لە جیهانی ئیسلامییدا، ئامانجی بنەڕەتییش لە پشت ئەو هەولانەوە، بریتی بوو لە هێنانەکایەی تێڕوانینێکی شارستانییانەی هەڵقوڵاو لە دابەشبوونە ئیقلیمیە نەتەوەییەکان و لەباربردنی خەونی گێڕانەوەی خیلافەتی ئیسلامیی، وەك دامەزراوەیەك کە هێمایە بۆ یەکبوونی ئوممەت و دیارییکردنی خاسیەتە کولتوورییەکان بەپێی نموونە ئیسلامییەکە.

ئەمڕۆ کە ئێمە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمداین، دەبینین مەیلە فیکریە ڕۆژئاواییەکە ڕووبەڕووی ئاستەنگێکی ڕاستەقینە دەبێتەوە، لەبەر چەند هۆیەك:

**یەکەمیان:** شکستە لە بەدەستهێنانی هەرکام لەو ئامانجانەی کە هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە دیارییان کردن، ئەوەبوو دەستەوسانبوون لە هێنانە کایەی کولتورێکی نەتەوەیی سەربەخۆ لە باکگراوندە ئیسلامییەکە، لەگەڵ قۆرخکردنی غەرب زەدەکان بۆ هەموو کەناڵەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتیی و

ڕۆشنبیریی. هەروەك دەستەوسان بووە لە پێکەوەنانی پێکهاتەیەکی ڕۆشنبیریی کە پشتیوانی جەماوەری موسڵمان بەدەست بهێنێت.

**هۆکاری دووەم:** بێتواناییان بوو لە بەدیهێنانی ئامانجی گەشەپێدانی ئابووریی، ڕاستە هەندێك لە دەستکەوتە ئابوورییەکان لە هەندێك لە دەوڵەتەکاندا دەکرێ قسەیان لەبارەوە بکرێت، بەڵام لەلایەن گەل بەگشتیی، پێشوازییان لێنەکراوە، چونکە لە لایەکەوە گەشەیەکی هەمەلایەنەیان بەدینەهێناوە، لە لایەکی دیکەوە هیچ ئەنجامێکی بەرچاوی ئەوتۆی نەبووە کە یارمەتیدەر بێت بۆ بەرزکردنەوەی پێگەی ئەو دەوڵەتانە لە نێوان ڕیزبەندییە هەرەمیە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکەدا، ئەوەش هۆکاری سێیەمە کە لە پشت تەنگژەکەی نوخبە غەرب زەدەکەوەیە، بۆیە دەکرێ بڵێین هەوڵە نوێخوازییەکانی کەلەپووری ئیسلامییان بەدواکەوتوو و گۆشەگیر تۆمەتبار دەکرد، شکستیان هێنا لە جەمسەرپێگرتنی گەلانی موسڵماندا، کە دەستیان کرد بە بەراوردکردن لە نێوان دۆخی خۆیان و دۆخی دەوڵەتانی تری وەك ژاپۆن ـ بۆ نموونە ـ کە موعجیزەیەکی ڕاستەقینەی بەدیهێناوە لە بواری ئابوورییدا، ئەگەرچی دوای هەوڵە تازەگەرییە ڕۆژئاواییەکانی جیهانی ئیسلامیی، نەك لە دوایانەوە، دەستی کرد بە تازەکردنەوەی سیستەم و ئامرازەکانی. ئەوەی قورەکەی زیاتر خەستکردۆتەوە ئەوەیە کە لەگەڵ هەموو تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانی بۆچوونەکانی نوخبە فیکرییە بیرۆکراسیە غەرب زەدەکان، کەچی هێشتا ئارەزووی زیاتریان هەیە بۆ گرتنەبەری ڕێباز و مومارەسەکردنی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی توندتر لەمەوبەر، لەپێناو پاراستنی پێگە قۆرخکارییەکانیاندا، لەکاتێکدا گەلان دەگەڕێن بەدوای ئەو ئامراز و هۆکارانەدا کە زیاتر گونجاون لەگەڵ ئیدراکی زاتیی هەڵقوڵاو لە کەلەپووری ئیسلامیی، ئەو زیندوێتی و بێدارییە نوێیە بووەتە هۆی دروستکردنی هاندەرێکی دەروونیی بەرەو ڕزگاربوون لە گرێی خۆ بەکەم زانین و هەستکردن بە پلە دوویی، هەروەها بووەتە هۆی زیاتر کەڵەکەبوونی کێشەکان و

توندوتیژییەکان لە هەندێك کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا کە لە هەمانکاتدا هەڕەشەیە لەسەر سەقامگیریی سیاسییان.

تەنگژەیەکی تر هەیە کە ڕووی کردۆتە نوخبە فیکرییە غەرب زەدەکان، خۆی لەو ئاستەنگەدا دەنوێنێت کە پەیوەستە بە گریمانەکەیان کە بڕوای بە تاك ئاڕاستەیی پێشکەوتنی مێژوویی هەیە و پێیوایە شارستانێتی ڕۆژئاوا کۆتایی قۆناغەکانی ئەو پێشکەوتنەیە، ئەو گریمانەیەی ئەو ڕۆڵەی بۆ ئاسان کردوون کە هەڵسن لەپێناو بەرپاکردنی گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە کۆمەڵگەکاندا، بەرەو ڕۆژئاوایی بوون، لەگەڵ ئەوەی کە خراپ کەڵەکەبوونی قەیرانە ژیارییەکە لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان خۆیاندا، ئەو تێڕوانینە تازەگەرییەی دووچاری سەرلێشێوان کردووە، ئەوەی کە ڕەنگی داوەتەوە بەسەر ئەرکە تەبشیرییەکەی نوخبە غەرب زەدەکەدا کە لەسەر ئەو تێڕوانینە ڕۆژئاواییە بۆ تازەکردنەوە بونیاد نراوە، بۆیە کێشەی سەرەکیی کە سەرشانی بونیادی کولتوری ئوممەی ئیسلامیی گران کردووە، لەو نموونە بنەڕەتییەدایە کە پێشەوایانی تازەگەریی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی گرتوویانەتە بەر. هەر لەو کاتەوە کە نوخبە غەرب زەدەکە دەستی کردووە بە پاشەکشە لەو ڕۆڵە سەرکەشەی کە پێی هەڵدەسا، دەبینین (زانایان) ڕۆڵیان لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا بە تەواوی پەراوێز خراوە. لەسەر ئەو بنەمایە ئەوەتا گۆڕانکارییەکی ژیاریی نویێ هەیە کە ڕێگای خۆی دەبڕێت لە جیهانی ئیسلامییدا و ئاڕاستەیەکی گرتۆتەبەر جیاوازە لەوەی ڕابردوو کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا باو بوو، گرنگترین شت کە ئەم گۆڕانکارییە ژیارییە نوێیەی پیێ دەناسرێت ئەوەیە بیروڕاکانی لە مەرجەعیەتی ئیسلامییەوە وەردەگرێت و نەوەیەکی نویێ لە موسڵمانی خاوەن پلەبەرزی زانست، پێشەوایەتیی دەکەن، چونکە زۆرێك لە کەسایەتییەکانی بزاڤە ئیسلامییەکان لەناو کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، ئەندازیار، یان پزیشك، یان زانای کۆمەڵناسیین.

ناسەقامگیریی لەو نموونە بنەڕەتییەی ڕێبەرە ڕۆشنبیرییەکان گرتبوویانە بەر، بووەتە هۆی تەشەنەکردنی جۆرێك لە پشێویی فیکریی، ئەوەش پشێوییەکی بەڵگەدارە لەسەر بوونی جۆرێك لە زیندوێتی لە هەندێ ڕووەوە، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو زیندوێتییە لەوانەیە بڕوات بەرەو قۆناغێك لە چاکسازیی و نوێکردنەوە، بەڵام باشتر وایە بۆمان لەوە بێئاگا نەبین کە قەیرانەکە وەك خۆی درێژەی دەبێت، تا نموونەیەکی نوێ دێتە کایەوە و ڕێبەرە فیکرییەکان پشتیوانی لێبکەن و گونجاو بێت لەگەڵ ئەو تێڕوانینە ژیارییانەدا کە کۆمەڵگە موسڵمانەکان هیوای بۆ دەخوازن، ئەوەش بۆ ئەوەی لە بەرامبەر تەحەددییاتەکانی گۆڕانکارییە ژیارییەکانی ئێستادا ڕابووەستێت، پێویستە ئەوەشمان لەبیر بێت کە دیارنەبوونی نوخبەیەکی فیکریی پێکەوە گونجاو و خاوەن ڕوئیایەکی ڕوون، یەکێك بوو لە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شەڕی کەنداو، سەبارەت بە قەیرانەکەی جیهانی ئیسلامیی، چونکە هیچ جۆرە دیدار و بەیەکگەیشتنێك نەبوو لە نێوان زانایان و ئەکادیمیەکان و بڕیاربەدەستانی سیاسیی لەبارەی ئەو قەیرانەوە، ئەوەش ئەوە دەردەخات کە پێویستییەکی ڕیشەیی هەیە بۆ بوونی کەناڵی دەزگایی کار بکات لەسەر پێکەوە گونجاندن لە نێوان هەوڵەکانی دامەزراوە فیکرییەکان و ڕوئیای بڕیار دروستکەرانی سیاسیی لە جیهانی ئیسلامییدا، ئەمڕۆ گۆڕەپانەکە هیچ کەناڵێکی دەزگایی تێدا نییە، مەگەر کەناڵێکی تاك ئاڕاستە کە دەسەڵاتە سیاسییەکان دەیسەپێنن، زانایان لەو جۆرە کەناڵانەدا پاساو بۆ شەرعیەتدان بەو سیاسەتانەی بڕیاربەدەستان دەیانەوێت، دادەڕێژن، با ئەوەش بووەستێت کە کەناڵەکە بە ناکارایی دەمێنێتەوە، تا قەیرانەکە خراپ کەڵەکە دەبێت، ئەوەش کاریگەریی دەکاتە سەر ڕادەی کاراییەکەی و دەبێتە هۆکاری ئامادەنەبوونی دەرفەت بۆ تاوتوێکردنی بەدیلە سیاسییەکان بەپێی گۆڕاوەکانی قەیرانەکە و بواری مانۆڕە سیاسییەکانیش سنووردار دەکات، خۆئەگەر ئەم حاڵەتە هەروا بەردەوام بێت، ئەوا توانای چارەسەرکردنی قەیرانەکان زۆر لاواز دەبێت، لەوانەشە چارەسەربوون زۆر ئاستەنگ دەبێت، هەبوونی نموونەی

دامەزراوەیەکی فیکریی سەربەخۆ و کەناڵی پەیوەندییکردنی گونجاوی هەبێ، لەباریدا دەبوو ڕێگری بکردایە لەو وێرانکارییەی دووچاری عێراق و کوەیت بوویەوە، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە دامەزراوە فیکرییەکانی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان بە هۆی ئەوەی چەندین کەناڵی پەیوەندیی کارایان هەیە، توانیان بگەنە لای بڕیاربەدەستانی سیاسیی حکومەتەکانی خۆیان و هاوکار بوون بۆ دانانی چەندین بەدیلی سیاسیی تری گشتگیرتر و کاریگەرتر.

نیشاندەرێکی تر هەیە ـ کە بایەخی کەمتر نییە لەوەی پێشەوە، لەبارەی جەنگی کەنداوەوە و پەیوەست بە قەیرانە فیکریەکە ـ خۆی لە نەبوونی ڕای گشتیی کاریگەر و بەتوانا دەنوێنێت لە ئاڕاستەکردنی سەرکردایەتییە سیاسییەکاندا، ئەوەبوو ڕایەکی گشتیی ئەمریکیی ئامادە و بەهێز و کاریگەر هەبوو لەسەر بڕیاری ئەمریکیی، لەگەڵ دووریی ئەمریکییەکانیش لە هەر هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە کە ئاسایش و سەلامەتییان بکاتە ئامانج، بەڵام لای لایەنی ئیسلامییەوە حاڵەتێکی تەواو پێچەوانە سەبارەت بەوەی لە نێوان لایەنە شەڕکەرەکاندایە دەبینین، بەشێوەیەکی ڕۆشنتر لە ڕای گشتیی عێراقیدا، بۆ نموونە، دوای جەنگ ئاڕاستەیەکی شۆڕشگێڕیی بەرەو وێرانکردن و رووخاندن، نەك ئاوەدانکردنەوە، سەریهەڵدا.

ئەو چڵەپووشەی کە پشتی وشترەکەی شکاند، بریتی بوو لە نەبوونی هیچ دامەزراوەیەکی ڕاگەیاندنی سەربەخۆ کە بتوانێت دەرفەت پەیدا بکات بۆ تاوتوێکردنی ڕەهەندەکانی مەسەلەکە، دیارە کە گەلانی موسڵمان ناچار دەبن پشت ببەستن بە ئاژانسەکانی هەواڵی جیهانیی، وەك: تۆڕی هەواڵی ئەمریکی CNN کە توانی گەمە بکات بە ژیریی گەلانی موسڵمان و کار بکاتە سەر کاردانەوەکانیان.

**ب ـ قەیرانە ئابوورییەکە: پرۆسەی یەکگرتن لە سیستمی ئابووریی جیهانییدا:**

ئەو قەیرانە ئابوورییەی ئوممەتی ئیسلامیی پێدا تێدەپەڕێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەستە بەو لێکدورکەوتنەوەیەی کە لە نێوان سیستمی بازاڕی سەرمایەداریی جیهانیی و ئەو شارەزاییە ئابوورییەدایە کە موسڵمانان لە مێژووی

خۆیاندا فێری بوون، چونکە کۆمەڵگە موسڵمانەکان بەگشتی، بە قۆناغەکانی فیودالیزم (دەرەبەگایەتیی)دا تێنەپەڕیوون لە مێژووی شارستانێتی خۆیاندا، بۆیە خاوەنی هەندێك دامەزراوە و میکانیزمی ئابووریی نین کە بوونەتە هۆی کەڵەکەبوونی سەرمایەداریی لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا، لە هەمانکاتدا هێزێکی پاڵنەریش بوو بۆ شۆڕشی پیشەسازیی و هەناردەکردنی تەکنۆلۆژیا بۆ دەرەوە و گەورەبوون و ئاڵۆزبوونی پەیکەر و سیستمە ئابوورییەکانیان.

کاتێك هێزە کۆلۆنیالیستەکان دەستیانکرد بە هەناردەکردنی بەرهەمەکانیان و ئامرازەکانی بازاڕی سەرمایەداریی بۆ کۆمەڵگە موسڵمانەکان، توانیان دامەزراوە ئابوورییەکان و سیستمی بازاڕی ئیسلامیی کلاسیکی وەلاوە بنێن، کە پشتی دەبەست بەو بنەما و بەها پێوەریانەی کە دەیویست زاڵ بێت بەسەر کۆی میکانیزمەکانی پرۆسەی ئابوورییدا و تا ڕادەیەکی گەورەش سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو، ئەگەرچی ئەوەندە پاساوی بەدەستەوە نەبوو بۆ گونجاندنی بنەما و بەها تایبەتەکانی لەناو بونیادی بازاڕی سەرمایەدارییدا، تێکەڵکردنی لەناو چوارچێوەی نموونەیەکی ئیسلامیی و چەمکە ئابوورییە ئیسلامییەکاندا کارێکی دژوار بوو.

ئێمە لێرەدا ئێستا خەریکی دیراسەکردنی ڕەهەندێکی دیکەین لە ڕەهەندەکانی ئیدراکی زاتیی، کە کار دەکاتە سەر پرۆسەی گواستنەوەی سیستمی بازاڕی سەرمایەداریی بۆ کۆمەڵگە موسڵمانەکان، لە لایەنی ئەخلاقیاتی بەرهەمهێنان و چوارچێوەکانی بازاڕی سەرمایەداریی بەکاربردنەوە، ئەگەرێکی پێکەوە گونجانی هەیە لەگەڵ ناسنامەیەکی زاتیی بۆرجوازیی دیارییکراو، وەك نموونەیەکی ئینسانی بنەڕەتیی، چونکە نموونەی ئەو چینە بۆرجوازییە بەو سیفەتەی نموونەیە کە لە نموونەکانی ئەخلاقیاتی ئینسانی، دروستبوونی لە چوارچێوەی باکگراوندە شارستانێتییە ئیسلامییەکەدا مومکین نابێت، چونکە ئەو چینە باوەڕی بە پراکتیزەکردنی چەمکە ئابوورییە دانراوەکان هەیە، کە ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی

پەراوێزخستنی بنەما پێوەریە ئیسلامییەکان لە ناو ئامرازەکانی جوڵەی بازاڕدا، ئاستەنگی بنەڕەتیی لە بەردەم هەوڵەکانی بەڕۆژئاواییکردنی ئابووریی ئیسلامیی، بەدیارییکراوی ئالێرەدایە، ئاشکراشە کە ئەو گەشەپێدانە ئابورییەی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان بینیان، بەهۆی بوونی چینێکی ئابوورییەوە بەرهەم هاتووە کە لەناو کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا بوونی نەبووە، لەبەر ئەوە نوخبەی بیرۆکراسیی لە کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، هەوڵیاندا بۆ هێنانەکایەی نموونەیەکی هاوڕێك، بۆ ئەو چینە ئابوورییە بۆرجوازیە لە جیهانی ئیسلامییدا.

بۆ نموونە: ئەگەر سەیرێکی سیاسەتی ئابووریی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییدا بکەین کە پێی دەوترا ((Milli Iktisad))، لەگەڵ سیاسەتە هاوشێوەکانی لە میسر و کۆمەڵگە موسڵمانەکانی تردا، دەبینین ئامانجیان گەیشتن بووە بە هێنانەکایەی چینێکی بۆرجوازیی ئیسلامیی کە توانای هەبێ لەسەر ڕێگا خۆشکردن لەبەردەم گەشەپێدانی ئابووریدا، بەڵام لەبەر ئەوەی گوزارشتی (موسڵمانە بۆرجوازییەکان) لەناو خودی خۆیدا هاوڕێك نەبوو، بۆیە ئەو هەوڵانە نەیانتوانی سیستمێکی ئابووریی بازاڕ بە مانا ڕاستەقینەکەی بونیاد بنێن، بەڵکو لەبری ئەوە، سەرمایەدارییەکی ڕووکەشانەی لێ پەیدابوو کە لە لایەن بۆرجوازە ساختەکانەوە دانرابوو، لەگەڵ سەرکەوتنی ئەو سەرمایەدارییە ڕووکەشیە لە جێگیرکردنی کولتورێکی بەکاربردنی ڕۆچوو لە زیادەڕەویدا، بەڵام لەڕاستیدا دەستەوسان بوو لە بەدیهێنانێکی داهێنانکاریی لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا، لەگەڵ سەرکەوتنی لە وەلانانی بنەما ئەخلاقییەکانی سیستمە کلاسیکییەکانی بازاڕدا، ئەو سەرمایەدارە ساختەیە شکستی هێنا لە پەرەپێدانی ئەخلاقیاتێکی دانراو لەپێناو پراکتیزەکردنی لەسەر پەیوەندییە ئابوورییەکان، مەبەستی یەکەم کە بیر و هۆشی زۆرێك لە سەرمایەدارە ساختەکارەکانی سەرقاڵ کرد بوو، ئەوە بوو کە لە ڕیزی چینێکی ئابووریی باڵاتردا سەر حساب بکرێن و شێوازێکی ژیان بگرنەبەر کە لەسەر چەمکەکانی بەکاربردنی ڕووت، ڕاوەستاو بێت و بەس.

لێرەدا دوو پرسیاری گرنگ لە کاتی باسکردنی قەیرانە ئابوورییەکەدا دێتە ئاراوە، یەکەم ئەوەیە: ئایا دەکرێ عەقڵیەتی ڕۆژئاوایی کە میحوەری ئامرازەکانی بازاڕی سەرمایەدارییە بە تەواوەتی بگوازرێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگە موسڵمانەکان کە پشت بەستوون بە باکگراوندێکی مێژوویی تەواو جیاواز لە هاوشێوە ڕۆژئاواییەکەی؟ دووەمیش ئەوەیە: ئایا دامەزراندنی بازاڕێکی بەدیل، بگونجێت لەگەڵ نەگۆڕە شارستانییەکانی نموونە ئەخلاقیە ئیسلامییەکەدا مومکین دەبێت لە ڕێگای دارشتنەوەی یاسا و تەشریعاتە ئیسلامییەکانەوە؟

پرسیاری یەکەم تەنگژەیەکی دروستکرد و زۆربەی ئەو بزاڤانەی تێکەوت کە هەوڵیاندا بۆ بەڕۆژئاواییکردنی جیهانی ئیسلامیی، چونکە سەرکەوتوو نەبوون لە ئامادەکردنی ژینگەیەکی گونجاو بۆ گەشەپێدانی ئابووریی بەرچاو وەك ئەوەی لە ژاپۆن ڕوویدا.

پرسیاری دووەمیش تەنگژەیەکی تری دروست کرد کە بزاڤە ئیسلامییەکان تێی کەوتن، ئەم تەنگژەییان مەترسیدارتر بوو بە هاوتەریبی لەگەڵ ئاڕاستەی ڕوولەزیادبوون بەرەو ڕەگداکوتانی گلۆباڵیزم. تائێستا کۆمەڵگە موسڵمانەکان نەیانتوانیوە بونیادێکی ئابووریی بەدیل پەرەپێبدەن کە هاوڕێك بێت لەگەڵ نەگۆڕە ژیارییەکانی نموونەی ئەخلاقی ئیسلامییدا، لە هەندێك هەوڵی بەئیسلامیکردن نەبێت، کە هەندێك دامەزراوەی ئابووریی دایانهێناوە و لە ژێر چەتری سیستمە ئابوورییە سەرمایەدارییەکە خۆیدا کار دەکەن.

هەروەك باسمان کرد، لە شیکردنەوەمان لە هەردوو بەشی سێیەم و چوارەمدا، ئەستەمە سەنتەرێکی شارستانێتی بەدیل بونیاد بنرێت، بەبێ جێگیرکردنی پایەکانی ناوەندێکی ڕاکێشانی ئابووریی و ئامرازەکانی بازاڕێکی چالاك، وڵاتە ئیسلامییەکان سامانێکی زۆر گەورەیان لە مەوادی خامی ستراتیژیی هەیە کە پێویستن بۆ ئەکتیڤکردنی گەشەپێدانێکی ئابووریی هەمە لایەنە، بەڵام ڕژێمە سیاسییەکان کە هێزە کۆلۆنیالیستەکان سەپاندوویانن و لەباریاندایە سەقامگیریی وڵاتە

ئیسلامییەکان تێك بدەن، هێشتا کۆسپێکی گەورەن لە ڕێگای بەدیهێنانی تەواوخوازیی پێویست لە نێوان توانا ئابوورییە ئیسلامییە گەورەکاندا، هەتا ئەو توانا و داهاتە ئابوورییانە ئاوا بەشێوەیەکی پەرتەوازە لە خولگەی ئامرازە ئابوورییە جیهانییەکاندا بسوڕێنەوە، سەروەری هێزە ئیستیعمارییەکان دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبن لە بەکارهێنانی ئەو وزە و تواناییانە لە بەرژەوەندیی خۆیان. پشێویە سیاسییەکان و شوێنکەوتنی ئامڕازەکانی ئابووریی جیهانیی تەنها ئەوە نییە کە ڕێگر بن لە بەردەم داڕشتنەوەی ژێرخانێکی بازاڕی بەدیل و بەس، بەڵکو دووبارە ڕێگرن لە بەردەم دابەشکردنێکی بەرهەمدار بۆ داهاتە مرۆیی و ماددییەکان لە جیهانی ئیسلامییدا.

قەیرانە ئابوورییەکە لە جیهانی ئیسلامییدا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەوەدا ڕەنگدەداتەوە کە هەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەوڵ دەدات خۆی بەجیا تێکەڵ ببێت لەگەڵ سیستمە ئابوورییە جیهانییەکەدا، لەجیاتی کارکردن لەسەر پەرەپێدانی بازاڕێکی ئیسلامیی هاوبەش کە زیادکردنێکی ڕاستەقینەیە بۆ ژێرخانە ئابوورییە ئیسلامییەکە بەشێوەیەکی گشتی، ئەم دیاردەیە ڕێگرە لە بەردەم ئەگەری پێکهێنانی سیستمێکی ئابووریی بەدیل دا، بە پێچەوانەوە، بەردەوامبوونی ئیستیعمارکردنی نوێی ئابووریی زامن دەکات و باڵادەستی سیاسیی ڕۆژئاوا بەسەر جیهانی ئیسلامیدا جێگیرتر دەکات. کەمترین شت کەلەم قۆناغەدا بکرێت ئەوەیە یەکگرتنێکی ئابووریی ئیقلیمیی لە جیهانی ئیسلامییدا بهێنرێتەدی، ئەوەش لەباریدا دەبێت پێگەکانی سەقامگیریی سیاسیی لە ناوچەکەدا بەهێز بکات، لە ڕێگای دابەشکردنی عادیلانەی داهاتەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی داهاتی تاك. خۆ ئەگەر ئەوە نەهاتەدی، زاڵبوون بەسەر ئەو تەنگژەیەدا لە توانادا نابێت، چونکە شێوازی ژیانی تاکی موسڵمان پەیوەستە بە بەرژەوەندییەکانی هێزە نێودەوڵەتییەکان و کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان لە نێو سیستمی ئابووریی جیهانییدا.

جەنگی نێوان ئێران و عێراق و جەنگی کەنداو ڕادەی بێتوانایی (ئوممەتی ئیسلامیی) لە پێکهێنانی بونیادێکی بازاڕی بەدیل، یان تەنانەت پێکهێنانی گرووپێکی ئابووریی چالاکی، خستەڕوو، ئەوەش نیشاندەرێك بوو لەسەر نەبوونی عەقڵانیەتێکی ئابووریی، ئەگەر هاوکارییکردنێکی هەمەلایەنە لە نێوان لایەنە بەشەڕهاتووەکانی ئەو جەنگانەدا ڕوویبدایە، دەستکەوتەکان زۆر گەورەتر دەبوون لە ئەگەری هەر سەرکەوتنێکی لایەنێك بەسەر لایەنەکەی تردا، داهاتی نەوت لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا تایبەتمەندیی نایاب و گەورەی بۆ جیهانی ئیسلامیی دەستەبەر کرد، بەڵام بڕیاربەدەستانی سیاسیی بەداخەوە نەیانتوانی ئەو دەستکەوتانە بگۆڕن بۆ سەرکەوتنێکی ئابووریی بەرهەمهێنان، ئەو داهاتە خراپ بەکارهێنرا، جارێك بە فراوانکردنی مەیلی بەکاربردنی زیادەڕەو، جارێکی تر بە چوونە ناو ململانێیەکی گەرمی خۆچەکدارکردن، ئەو خراپ بەکارهێنانەی سامانە نەوتییەکان ڕێگای خۆشکرد بۆ هاتنە ناوەوەی سیستمە ئابوورییە ئیستیعمارییەکان بۆ ناو وڵاتانی ئیسلامیی، لە ڕێگای پشتیوانییکردنی سیستمی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانەوە بۆ هەناردەکردنی کەلوپەلی خۆشگوزەرانیی بەبێ سنوور و چەکی کوشندە و بێشمار کە جیهانی ئیسلامیی پێویستی پێی نابێت.

هەموان تێبینی ئەوەیان کرد کە سیاسەتمەدارانی ڕۆژئاوایی چۆن دەستیان دایە تاوتوێکردنی لایەنە ئیجابییەکانی ئاوەدانکردنەوەی عێراق و قازانجی ئەوە لەسەر ئابووریی وڵاتەکانیان، تەنانەت پێش کۆتاییهاتنی جەنگەکەیش، لە واقیعدا پڕۆژەکانی ئاوەدانکردنەوەی هەریەك لە عێراق و کوەیت کە کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان پێش پێشێنیان لەسەر دەکرد، هاوبەش بوون لە جێگیرکردنی شوێنکەوتەیی سیستمە ئابوورییە ئیسلامییەکان بۆ بونیادە ئابوورییە ڕۆژئاواییەکان، بەکارهێنانی بەرهەمدار و کارای سامانە ئابوورییەکان لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، دەتوانێت هاوکاریی بەهێز بکات لە بونیادنانی سەنتەرێکی شارستانێتی بەدیل بۆ سەنتەری ئەتڵەسیی و سەنتەری ئەورووپی و سەنتەری باسفیکیش.

**ج: ـ قەیرانە سیاسییەکە: کێشەی شەرعیەتی سیاسیی و یەکێتیی ئوممەت:**

قەیرانی سیاسیی سەرەکیی لە جیهانی ئیسلامییدا، قەیرانی شەرعیەتی ڕژێمە سیاسییەکانە، ئەم ئوممەتەیش دوو لایەنی گرنگی هەیە: یەکەمیان پەیوەستە بەو لێکدوورکەوتنەوەوە کە لە دەمی پرۆسەی گۆڕانکارییە ژیارییەکاندا دەرکەوت، دووەمیشیان پەیوەستە بە ناوەڕۆکی میراتی قۆتاغی ئیستیعمارییەوە.

لە بارەی لایەنی یەکەمەوە، لە واقیعی ئێستادا تێبینی دەکەین کە شەرعیەتی سیاسیی لە زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا زیاتر شەرعیەتێکی ئیجرائیە، یان شەرعیەتێکە مۆرکێکی شەکڵی ئەدەواتیی هەیە، نەوەك ناوەڕۆکێکی فیکریی، یان بەهاداریی، هەبێت. دوو نیشاندەریش هەیە کە بەڵگەن لەسەر مەرکەزیەتی شێوازە کارپێکراوەکان لە پێکهێنانی شەرعیەتی دەسەڵاتدا:

**نیشاندەری یەکەم:** پێگەی میحوەریی سەرکردەی کاریزمایە، بەوپێیەی ڕەمزی دەوڵەتە.

**دووەمیان:** ئەو بایەخ پێدانە زیادەڕۆییە کە لە ئاهەنگەکانی دەستبەکاربوونی ڕێبەری وڵاتدا بەرپا دەکرێت.

ئەو دوو نیشاندەرە دیسان بەڵگەن لەسەر ڕادەی نابووتیی ئەو بنەماو بەهایانەی کە پایە مەعریفیەکانی کولتووریی سیاسیی دەوڵەت پێکدەهێنن. ئەو ڕواڵەتە ئیجرائیانەش کە شێوازی شەرعیەتی سیاسیی پێ دەناسرێت، ئەنجامێکی سروشتی ئەو گۆڕانکارییە ژیارییانەیە کە گشت سیستمی بەها باوەکانی وێران کردووە، نوخبەی سیاسیی و ڕۆشنبیری غەرب زەدەش بڕوایان وابوو کە دامەزراوە سیاسییە ڕۆژئاواییەکانی سەپێنراو بەسەر کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، بەهای تایبەت بە خۆیان بەرهەم دەهێنن، بەڵام ئەوە ڕووی نەدا و ئەو نوخبانەش ئەوەندە خۆیان ماندوو نەکرد بۆ ئەوەی جارێکی تر پرۆسەیەکی هەڵسەنگاندنی ڕۆشنبیرییە سیاسییەکەیان ئەنجام بدەن، ئەوەش بووە هۆی ڕێگرتن لە دروستبوونی پێوەرە ئەخلاقییە گشتییەکان، بەو شێوەیە سیستمی بەهاکان کە نوخبە حوکمڕانەکان

پشتیوانییان لێدەکرد، لە بەها و ئەخلاقیاتی جەماوەر جیابوویەوە و بەو هۆیەشەوە بۆشاییەك پەیدابوو لە بەشداربوونی سیاسیی گەل و کۆبوونەوە و ئامادەباشی ڕای گشتی جەماوەرییدا، هەر ئەوەش پاڵی بە گەلانەوە نا بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو بەها سیاسییانەی ڕژێمە دکتاتۆریە بیرۆکراسیەکان و عەسکەرتارەکان و پاشایەتییە کلاسیکیەکان سەپاندبوویان، دوای ئەوەی دەسەڵات و هەیمەنەی ئەو ڕژێمانە لاواز بوون بە هۆی هەژارییان لە بنەما مەعریفیەکان و بەهاکاندا، بەڵام لایەنی دووەمی قەیرانی شەرعیەتی سیاسیی ئەوەیە کە پەیوەستە بە میراتی قۆناغی ئیستیعمارییەوە کە دەوڵەتەکانیان لەسەر بنەمای یەکە ئیقلیمییەکان دامەزراندبوو، بەڵام ڕێگر بوو لە بەردەم دارشتنی کولتورێکی سیاسیی سەربەست و خۆبەخۆ لەناو کۆمەڵگەکاندا کە لە مێژوویاندا تەقالیدی سیاسیی تایبەت بە دەوڵەتیان نەبووە، تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت هێشتا زۆرێك لە دەوڵەتەکانی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست پێداویستییە بنەڕەتییەکانیان نییە بۆ ئەوەی ببنە دەوڵەتی خاوەن شەرعیەت و سەقامگیریی سیاسیی لە چوارچێوەیەکی جوگرافی ئیقلیمی و سروشتیدا، نە باکگراوندێکی مێژوویی جیاوازییان هەیە کە وەك قەوارەیەکی سیاسیی سەربەخۆ خۆیان بنوێنن، نە ئەوەیە خاسیەتی کولتوریی تایبەتمەندییان هەبێ، زمانەوانیی بێت، یان ئایینیی، یان نەژادیی، کە ئەوانە ئەو توخمانەن لە باریاندایە دەوڵەتێك لە دراوسێکانی جیابکاتەوە.

بە دوای ئەوەدا واقیعی پارچە پارچەکراوی ئیقلیمیی ڕەنگدانەوەی ئەو ڕاددەی کارتێکردن و دەسەڵاتەیە کە هێشتا هێزە کۆلۆنیالیستەکان ممارەسەی دەکەن بەسەر ئەو دەوڵەتانەدا، لە پاڵ جیاکردنەوە لە نێوان سامانە ئابووریی و مرۆییەکانی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، بە شێوەیەك شوێنکەوتەبوونی ئەو دەوڵەتە پەرتەوازەبووانە زامن بکات بۆ ڕژێمە ئابوورییە جیهانییەکان و برژێتە بەرژەوەندیی هێزە ئیستیعمارییە هاوچەرخەکانەوە.

واقیعی پارچەپارچەکراوی دەستکرد لە نێوان وڵاتە ئیسلامییەکاندا، چەند ئەنجامێکی لێکەوتۆتەوە، گرنگترینیان دوانن:

**ئەنجامی یەکەم:** بریتییە لەدەستدانی نەریتە جیاکەرەوەکانی دەوڵەت و لاوازیی لایەنە دەزگاییەکان لە کولتوری سیاسیدا، ئەوەش بووەتە هۆی ڕوودانی کێشە لە نێوان نوخبە ڕکابەرەکانی ناو دەوڵەت، باشترین ڕێگاش بۆ جێگیرکردنی پایەکانی دەسەڵاتی سیاسیی، بریتی بوو لە گرتنەبەری سیاسەتێك کە بە شمولیەت و بیرۆکراسیی دەناسرێت. لەهەمانکاتیشدا داڕشتنی نەتەوەگەرییەکی ئیقلیمیی (نیشتیمانیی) پێویست بوو بۆ شەرعیەتدان بە ڕژێمەکە و سەرکردایەتییەکەی لە نوخبە سیاسییەکە، هەروەها ئەوەی دەخواست کە ئایدۆلۆژیایەکی ڕەسمیی فۆرمۆلە بکرێت بە مەبەستی سەپاندنی چەمك و بەهای سیاسیی دیارییکراو بەسەر جەماوەردا لە پێناو پاراستنی ڕژێمی دەسەڵاتدار و لە بن دەرهێنانی هەر هێزێکی تری ئۆپۆزسیۆن.

**ئەنجامی دووەم:** ئەوەیە کە ناسنامە بەشەڕهاتووەکانی ناو یەك ڕژێمی سیاسیی، بوو بە هۆی خراپبوونی کێشەی شوناسی ئیسلامیی لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامییدا، چەندین ناسنامە و شوناسی تر هاتنە ئاراوە وەك: خێڵەکیی و نەژادیی و ئیقلیمیی و نەتەوەیی. کۆمکاری نەتەوەیی گشتگیر و پەیوەندیی مەزهەبیی، هەموو ئەوانە لە دەرەنجامی هەرەسهێنانی دەوڵەتی عوسمانیی و لێکهەڵوەشانەوەی ئەو چەترە کۆکەرەوەیە بوو کە هەموو ئینتیماکانی تری لەخۆگرتبوو، هێزە کۆلۆنیالیستەکانیش ئەو ناسنامە ڕکابەرانەیان بەکاردەهێنا بۆ بەدیهێنانی سیستمێکی هاوسەنگی هێزەکان لە ناوچەکەدا، هەروەك چەند دەوڵەتێك لە ڕێگای (طفرة) بازدانەوە دەرکەوتن و لە خێڵەکییەوە گۆڕان بۆ سیستمی دەوڵەت بەیەك باز، ئەوەبوو یەك خانەوادە هەموو دەستکەوتەکانیان پاوان دەکرد تەنها لەبەر ئەوەی لە ناوەوەی دەسەڵاتە سیاسییەکەدا بوون، لە حاڵەتەکانی تردا ئاڕاستەیەکی ئیقلیمیەتی دەستکرد دەرکەوت، وەك بنەمایەك بۆ عەقیدەیەکی

ئایدۆلۆژیی و سەرکردایەتییەکی کاریزمایی و تێکەڵ بە دەوڵەت کرا بۆ پڕکردنەوەوەی بۆشاییە سیاسییەکە لەسەر ئەو پارچە زەوییەی کۆنترۆڵ کرابوو بەپێی تێڕوانینێکی تەمومژاوی لە ماهیەتی دەوڵەت خۆی لە خۆیدا.

کاریگەریی ئەو ناسنامە بەشەڕهاتووە بەشێوەیەکی ڕوونتر و تایبەت لە سیاسەتی دەوڵەتە عەرەبیەکانی ئێستادا بەدیاردەکەوێت، ئیدارەی ڕووسی و ڕژێمە هەوادارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران لە ئاسیای ناوەڕاست، لاسایی ئەو بارە نادروستەی جیهانی ئیسلامیی دەکەنەوە، بە وروژاندنی پشێویە سیاسییەکان لەو ناوچەیەدا بۆ کۆسپ دانان لە ڕێگای سەربەخۆبوونی کۆمارە ئیسلامییەکانی ئاسیای سەر بە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

ئەو فۆرمە سیاسییە دروستکراوانەی لە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەتەوە، وەك دەرەنجامێکی میراتی ئیستیعماریی دابەش دەبێت بۆ دوو شێواز لە ڕژێمە سیاسییەکاندا و بۆ هەریەکەیان ڕێگای خۆی هەیە بۆ بەدەستهێنانی شەرعیەتی سیاسیی، ئەوانەش پاشایەتی تەقلیدیی و دکتاتۆریەتی بیرۆکراسین، شەرعیەتی سیاسی ئەو ڕژێمانە پشت بەستووە بە ئاڕاستە و بۆچوونە کلاسیکییە ئیجرائییە ڕەمزییەکان و عەقائیدیە ئایدۆلۆژییەکانی سەردەمی تازەگەریی، یان پشتبەستوون بە کۆمەڵێك چەمك و بەهای مەعریفیی، هەردووکیشیان ڕەنگدانەوەی نیشاندەرە ڕاستەقینەکانی شەرعیەتی سیاسیی سەقامگیر نین.

لە لایەکی ترەوە میراتی ئیستیعماریی توانی سیستمێکی هاوسەنگی هێزەکان لەم ناوچە زۆر هەستیارەدا بۆ هەر گۆڕانێك ڕوو بدات پێکبهێنێت، ڕژێمە پاشایەتییە تەقلیدیەکان هەوڵ دەدەن ناکۆکییەکانی نێوان پێکهاتە سەربازیی و بیرۆکراسیەکان بەکاربهێنن بۆ پارێزگاریکردن لە پێگە و ناوبانگی خۆیان لەناو ئەو بارودۆخەدا، لەکاتێکدا ڕژێمە سەربازییە بیرۆکراسیەکان کار دەکەن بۆ ڕاکێشانی توانا ئابوورییەکانی ڕژێمە پاشایەتییە تەقلیدیەکان لەپێناو بەهێزکردنی ڕۆڵی خۆیان لە سیاسەتە ئیقلیمیەکەدا، بە شێوەیەك ئەگەر هەر هێزێك ویستی گۆڕانکارییەك لە

دۆخەکەدا بکات، زۆر بە ئاسانی پەیمانێکی دژ بەرامبەر ئەو هێزە دەردەکرێت، ئەوەش نیشانەیەکی ڕۆشنە لەسەر سیستمی هاوسەنگی هێزەکان کە هێزە ئیستیعمارییە ڕۆژئاواییەکان پایەکانیان دامەزراندووە. ئەو سیستمەش دەرفەت دەدات بە زلهێزەکان بۆ دەستوەردانە کاروباری جیهانی ئیسلامیی لە ڕێگای گەمەکردن بە هاوسەنگیی هێزەکان لە ناوچەکەدا.

قەیرانی کەنداو نموونەیەکی پراکتیزەکراوی سیستمی هاوسەنگیی هێزەکان بوو کە لە سەر سیستمی ((شەرعیەتی بەزۆر سەپێنراو)) بونیاد نراوە، ئەوەبوو دیمان چۆن هەریەك لە میسر و سعودیە و سوریا– لەگەڵ جیاوازیی و پێکەوە گونجانیان ـ توانییان زۆر بە ئاسانی پەیمانێکی دژ پێکبهێنن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەی هێزی سەربازیی سەددام حسێن کە دەیویست هاوسەنگییەکە تێکبشکێنێت، لەوکاتەدا دەرفەت لە بەردەم هێزە گەورەکاندا بە سەرکردایەتی ئەمریکا کرایەوە بۆ گەمەکردن بە سیستمە عەرەبیەکە هەمووی، بۆ ئەوەی جارێکی تر نەخشەی هاوسەنگییەکە لە نێوان هێزە سەرەکییەکانی ناوچەکەدا دابڕێژێتەوە و هەروەها بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بەپێی پێداویستییەکانی سیستمی نوێی جیهانیی ڕێك بخاتەوە، بەڵام مۆلەق بوونی ڕژێمە حوکمڕانەکان لە وڵاتە عەرەبییەکاندا لە نێوان خانەوادە شانشینە کلاسیکیەکان و نوخبە عەسکەرتارە بیرۆکراسیەکاندا ـ وەك دوو بەدیل بۆ بونیادنانی شەرعیەت ـ سەقامگیریی سیاسیی درێژخایەن زامن ناکات لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی دوای ڕوودانی ئەو گۆڕانکارییە ژیاریانەی کە ڕژێمە بیرۆکراتییەکانی ناچار کردووە لەسەر دابەشکردنی هێزە سیاسییەکە لەگەڵ جەماوەردا، سەرباری ئەوەش فشارە ڕوو لە زیادبووەکان بۆ بەشداربوون لە پرۆسەی سیاسییدا لە ناوچە جیاجیاکاندا، کاریگەریی دەبێت لەسەر تێکڕای دۆخەکە لە ناوچەکەدا، بە ڕژێمە حوکمڕانەکانیشەوە، کاریگەریی ئەو فشارانە دەستی کردووە بە دەرکەوتن لە ژمارەیەك لە نموونە دیموکراتییە سنووردارەکانی وەك ئەردەن و جەزائیر لە کۆتاییەکانی ساڵانی هەشتاکانەوە ڕاستەخۆ پێش قەیرانی کەنداو، لێرەدا تەنگژەی

زلهێزەكان و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەدیارییكراوی، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، زیاتر دەردەكەوێت، مەترسیەكانیش دەستیان كردووە بە ختوكەدانی ئەو هێزانە بەهۆی بەرەوپێشچوونی پرۆسەی دیموكراسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەگەرچی پێشتر پشتگیری بزاڤە جەماوەرییە گۆڕانخوازەكانیان دەكرد لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا، هۆكاری مەترسییەكانیان ئەوەیە كە بەگومانن لەوەی پرۆسەی گۆڕانكاریی دیموكراتی لەم ناوچەیەدا ببێتە هۆی هاندانی ((ئوسوڵیەتی ئیسلامیی))، هەرلەبەر ئەوەش بوو كە هەوڵیاندا سیاسەتی سەددام حسێن بەكاربهێنن بە ئامانجی گێڕانەوەی ئامرازە تەقلیدییەكانی شەرعیەتی سیاسیی لە جیهانی ئیسلامییدا، خۆ ئەگەر دیراسەی پشتەوەی گۆڕاوە سیاسییەكانی ڕۆژانە بكەین، بۆمان بەدیار دەكەوێت كە قەیرانە سیاسییەكە لە جیهانی ئیسلامییدا، گەیشتن بە چارەسەركردنی ئەستەمە، مەگەر لە ڕێگای جێگیركردنی ئەو ڕێسا تیۆریی و پراكتیكیانەوە كە سەقامگیریی و مەشروعیەت زامن دەكەن و لە ئەزموونی مێژوویی و كولتوریی كۆمەڵگە موسڵمانەكاندا ڕەگ و ڕیشەی هەیە، ئەوەش لە ڕێگای فراوانكردنی بازنەی بەشداربوونی سیاسییەوە دەكرێ، بەو هۆیەشەوە پرۆسەی بەهێزكردنی شەرعیەتی سیاسیی لە وڵاتانی ناوچەكەدا گەرم و گوڕ دەكرێت. هەروەك پێویستە لەسەر ڕژێمەكانی ئێستا پێداچوونەوە بكەن بە ڕادەی شەرعیەتی شێوازەكانیانەوە لە قۆناغی داهاتوودا، كەوا چاوەڕوان دەكرێت گۆڕانكاریی ژیاریی زۆر هەستیار بەخۆیەوە ببینێت، قەدەغەكردنی بەشداربوونی سیاسیی دەبێتە هۆكارێك بۆ زیاتر تێكچوونی سەقامگیریی سیاسیی و هەڵگیرسانی ڕووبەڕووبوونەوەی خوێناویی لە نێوان جەماوەر و نوخبە حوكمڕانەكاندا، بۆیە پێویستە ئەو بارگرژییەی ئێستا لە جیهانی ئیسلامییدا هەیە، هێور بكرێتەوە لە ڕێگای گەیشتن بە دیارییكردنی ڕادەی پێویستی هاوكاریی و پشتیوانییكردن لە یەكتر بە مەبەستی هێنانەدی سەقامگیرییەكی درێژخایەن، سەقامگیرییش لە جیهانی ئیسلامییدا مەرجێكی دیكە دەخوازێت كە بریتییە لە پەیداكردنی هۆكارەكانی

ئاسایشی ناوخۆیی بە مەبەستی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە سیاسییەکان کە لە نێوان دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا دێتە گۆڕێ، ئەوەش بەوە دێتەدی کە جارێکی دیکە پەیکەری ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی بەشێوەیەك ڕێکبخرێتەوە کە بتوانێت ڕۆڵی خۆی بە شێوەیەکی کارا و چالاکانە ئەنجام بدات.

لەسەر هەموو دەزگا نێودەوڵەتییەکانیشە کە دەست بکەن بە پێداچوونەوە بە ڕۆڵی خۆیاندا لە ساحەی سیاسیی نێودەوڵەتییدا، بەتایبەتی دوای ئەو گۆڕانکارییە ڕیشەییانەی بەسەر سیستمی جیهانییدا هاتووە، داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە لە هەمانکاتی گرێدانی کۆبوونەوەی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامییدا لە قاهیرە، دەستەوسانی ڕێکخراوەکەی سەلماند لە زامنکردنی ئاشتیی و ئاسایشی نێوان دەوڵەتە ئەندامەکانی، هەروەك لەهەمانکاتدا بەڵگە بوو لەسەر نەبوونی کەناڵە دبلۆماسییەکانی پێویست و بەتوانا بۆ گەمارۆدانی قەیرانە سیاسییەکە لە نێوخۆی دەزگاکانی ڕێکخراوەکەدا، ڕەنگە ئامرازێك کارایی هۆکارە ئاشتییەکان زامن بکات، بریتی بێت لە بەستنی ڕێکەوتننامەی ئاسایش و هاوکاریی لە نێوان ئەندامانی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامییدا لەسەر شێوازی ڕێکەوتننامەی هەلنسکی بۆ ئاسایش و هاوکاری ئەوروپی، لەو میانەدا پێویستە هەموو ناکۆکییە ئیقلیمییەکان ڕابگیرێت و ئەندامانی ڕێکخراوەکە گەرەنتی ئەوە بدەن کە دەوڵەتێك پەلاماری دەوڵەتێکی تریان، نەدات.

لەسەرمانە کە بە سیفەتێکی گشتیی دەرك بەوە بکەین کە بیرۆکەی هەڵسانەوەی جیهانێکی ئیسلامیی یەکگرتوو کە بتوانێت لەمپەر و کۆسپەکان تێپەڕێنێت، مانای ئەوەیە کە تەنها سنوورەکانی نێوان دەوڵەتەکان لابېرێت، یان دەوڵەتێك بخرێتە سەر دەوڵەتێکی دیکە، چونکە ئەوە لەوانەیە حاڵەتێك لە پشێویی دروست بکات، ڕوونترین بەڵگە لەسەر ئەوە ئەو پشێوییە بوو کە لە ئاکامی قەیرانی کەنداوەوە تەشەنەی کرد و دەرفەتێکی زێڕینی دەستەبەر کرد بۆ دەستوەردانی سەربازیی لەلایەن زلهێزەکانەوە بۆ وێرانکردنی وڵاتە ئیسلامییەکان و دوابەداوی

ئەوەش دووبارە بونیادنانەوەی لە بەرژەوەندیی هێزە ڕۆژئاواییەکان لەسەر حسابی سەروەت و سامانی ماددیی و مرۆیی جیهانی ئیسلامیی.

**أ- سیستمی نوێی جیهانیی: گوتاری پاساوی قەیرانەکە:**

قەیرانە ژیارییە گەرمەکە لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی سیستمی جیهانیی لە دوو ڕوانگەوە دەردەکەوێت: یەکەم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە قەیرانەکە پەیوەستە بە دەوڵەتی نەتەوەییەوە، بەو سیفەتەی کە یەکێتییەکی سیاسییە، دووەم جەخت دەکات کە قەیرانەکە پەیوەستە بە سیستمی نێودەوڵەتییەوە، وەك سیستمێکی جیهانیی. یەکێتی سیاسیی لە نموونەی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاواییدا دەوڵەتی نەتەوەییە بەو سیفەتەی کە دەسەڵاتێکی سیاسیی باڵایە کە خاوەنی سەروەرییە بەسەر ئیقلیمێکی جوگرافیای سنووردارەوە.

ئەوەی زانراوە ئەوەیە دەوڵەتی نەتەوەیی وەك قەوارەیەکی سیاسیی بە تێپەڕبوون بە زنجیرەیەکی درێژ لە پەرەسەندنەکان هاتۆتە وجود، کە هەر لە سەدەی دوانزەهەمەوە دەستی پێکرد، بە هاوتەریبی لەگەڵ پەرەسەندنەکانی لایەنی کۆمەڵایەتیی و ئابووریدا. لەسەر ئەوەشەوە بنەما فەلسەفیەکانی چەمکی دەوڵەتی نەتەوەیی چاوەڕێی کرد تا (هیگڵ) هات، کە هەڵسا بە تیۆریزەکردن و فۆرمۆلەکردنەوەی بە شێوەیەکی توندوتۆڵ و لەو بوارەشدا گوتەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت: ((دەوڵەت شەریعەتی خودایە لە زەویدا))، ئەم گوزارشتە گشتگیرە پاراوە، جەوهەری ڕاستەقینەی دەوڵەتە لە ڕوانگەیەکی ڕووتەوە، بەم شێوە (هیگڵ) ناوەڕۆکێکی ڕۆحیی و ماددیی بەخشی بە سیستمە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان.

لێرەوە دەکرێ بڵێین کە تیۆرەکەی هیگڵ لە بارەی دەوڵەتەوە گشتگیرترە لەو تیۆرەی کە تۆماس هۆبز دایناوە.

(هۆبز) هەوڵی داوە پاساوەکانی هێزی ڕەهای دەوڵەت لە ڕێگای دانانی لێکدانەوەیەکی بێلایەنەوە پەیدا بکات، لەکاتێکدا (هیگڵ) ناوەڕۆکێکی (غەیبی ماوەرائی) ڕووتی پێداوە، هیگڵ دەڵێت: ((دەوڵەت هێمایە بۆ واقیعیبوونی فیکری ئەخلاقیی، چونکە عەقڵی ئەخلاقیی وەك ئەو جەوهەرەیە کە خۆی ڕادەگەیەنێت بە دەرککردنی ڕەهەندەکانی و پراکتیزەکردنی زاراوەکانی تا دوایین تێگەیشتنی لە

خۆی، دەوڵەتیش ڕاستەوخۆ دادەمەزرێت بەو سیفەتەی کە نەریتێکی تەقلیدیە ڕۆدەچێتە ناو هوشیاریی زاتیی تاك و مەعریفە و گشت چالاکییەکانی ژیان، لەکاتێکدا هۆشیاریی زاتیی بە هۆی سۆزی خۆیەوە ڕزگاربوونی لە دەوڵەتدا دەبینێتەوە، وەك هێمایەك بۆ ماهیەت و نیهایەتی خۆی، بەڵکو بەرهەمی وجودی خۆیەتی و بەرهەمی ئەو ئازادیەیە کە ئاواتی بۆ دەخوازێت، دەوڵەت بە درێژایی ڕێڕەوی خۆی ئاڕاستەیەکی عەقڵانی هەیە تا ئەوەندەی تەعبیر لە جەوهەری ڕاستەقینەی خۆی بکات، بەو شێوەیە زاڵبوونی بەسەر هۆشیاریی زاتیی دا بۆ زامن دەکات، تەنها بە بەرزبوونەوەی ئەو هۆشیارییە بۆ ئاستە گشتگیرەکەی، ئەو پێکەوە گونجانە جەوهەرییە بە کۆتاییەکی نەگۆڕ و ڕەها دادەنرێت، بە مەرجێك ئازادیی بێت بۆ ئەوەی جێگاکەی بگرێتەوە لەژێر چەتری ئەو کۆتاییە نەگۆڕە ڕەهایەدا، لە لایەکی دیکەوە ئەو کۆتاییە نەگۆڕە دەسەڵاتی خۆی بەسەر تاکدا ئومارەسە دەکات و پابەندی دەکات بە چەندین ئەرك و کارەوە لەبەرامبەر ئەندامبوونی سەر بەو دەوڵەتە)) (١٩٩٠: ٨٣– ٨٤).

ئەو پلەو پایە مەزنەی (هیگڵ) لە فەلسەفەکەیدا داوێتی بە دەوڵەت ـ بەو پێیەی دەوڵەت دامەزراوەیەکی ئەخلاقیی حەتمییە ـ گونجاو بوو لەگەڵ بەرپابوونی نموونەی مۆدێرنیزم لە سەدەی نۆزدەهەمدا، هەروەها بۆ تێر و تەواوبوون لەگەڵ بیرۆکەی بڵندبوونەوە و پەرەسەندن و ڕەنگدانەوە مێژووییەکانیدا و بەشداریشی کرد لە وەلانانی کڵێسا کە بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد گوایە نوێنەرایەتی ئیرادەی ئیلاهیی دەکات لە زەویدا. ((سەردەمی ڕۆشنگەریی کە گەشەکردنی گومانەکانی بەرامبەر مەسیحیەت بەخۆوە بینی لەناو گشت چینەکانی کۆمەڵگەدا، هات بۆ جێگیرکردنی دەوڵەتیی عەلمانی و بە خاوێن دانانی لە هەموو کەم و کورتییەك، بەتایبەتی لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەییدا)) (هایز،١٩٦٠، ٤٥).

جگە لەوەش دروستبوونی ئەو ئایدۆلۆژیا ڕەسمییانەی توانایان هەبوو لەسەر دانانی پێناسێك بۆ ئەو دامەزراوە ڕووتە (دەوڵەت)، توندترین دەزگا سیاسییە

سەرکوتکەرەکانی هێنایە کایەوە لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتییدا، ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی و سۆشیالیستیی کە ڕێنماییان لە پێشبینیە مێژووییەکانەوە وەردەگرت، بوونە مۆتەکەیەك بەسەر تاکەکانەوە کە نەیاندەتوانی ناسنامەیەك بۆ خۆیان دابنێن لە سایەی هەیمەنەی ڕۆحیی و ڕەهای دەوڵەتدا.

دەوڵەت ـ بەو سیفەتەی کە دامەزراوەیەکی بڵند و پیرۆزە لە چوارچێوەی نموونەی مۆدێرنێتەدا ـ ناسنامەی نوێ و یاسا و ڕۆڵ و ئەرکی بۆ تاکەکان دانا، چونکە نە سروشت و نە ژینگەی کۆمەڵایەتیی دروستبوونی بۆشاییان قبوڵ نەبوو لە دوای ڕووخانی کڵێساوە، دەزگا حکومەتییەکانیش پێشکەوتووتر و ئاڵۆزتر بوون، بەڵکو ئەو ئاڵۆزبوونە لە سەردەمی نوێدا زۆر زیادی کرد، وەك هەوڵێك بۆ بەرزکردنەوەی دەوڵەت بۆ پلەی ئاراستەکەر بەسەر سیستمە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەکانەوە، بۆیە تێبینی دەکەین فەلسەفەی هیگڵی کە پایەکانی دەوڵەتی قایم کرد بەو پێیەی باشترین ڕێگایە بۆ هێنانەدی ئازادیی و هۆشیاریی زاتیی، گۆڕا بۆ ئەوەی ببێتە سیستمێکی بەکۆیلەکردن و هەستکردن بە نامۆبوون، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر ئاڵۆز.

ڕاستە کە فەلسەفەی هیگڵ تەنها نەبوو لە دانانی بنەمای فەلسەفیی ئەو بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر پەیوەندیی نێوان تاك و دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا هات، بەڵام هەر ئەوە کە بەرپرسیارە لەوەی سەرچاوەی ئیلهام بووە بۆ زۆرێك لە ڕژێمە شمولییەکان، بۆ نموونە مارکسیزم جارێکی تر دیالێکیەتی هیگڵی دارشتەوە بە مەبەستی دانانی چوارچێوەیەك بۆ ئایدۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕیی، لە کاتێکدا فاشیزم فەلسەفەی هیگڵی بۆ دەوڵەت گۆڕی، بۆ ئەوەی ببێتە ئایدۆلۆژیایەکی نەتەوەیی پشتبەستوو بە گریمانەیەك کە وەسفی دەوڵەت دەکات بەوەی باڵاترین هێزە و داهێنەری ئەخلاق و بەهاکانە، بۆیە ئەم کێشەیە بەڵگەیە لەسەر ڕاددەی شمولیەت و ڕەگداکوتانی تەنگژە ژیارییە هاوچەرخەکە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی پێشەوە، دەردەکەوێت کە فۆکۆ یاما کەوتۆتە تەنگژەیەکی ئالۆزەوە، ئەو دەیەوێت تیۆرەکەی لە بارەی کۆتایی مێژووەوە بسەلمێنیت لە ڕێگای دەرخستنی لاوازییەکانی دەوڵەتی نەتەوەوە بە بەکارهێنانی چوارچێوە فەلسەفیە هیگڵیەکە و هیچ دەرچوونێك لەو تەنگژەیە نابینێت جگە لە جیاکردنەوە لە نێوان کۆمەڵگەی مەدەنیی و دەوڵەتدا، بەڵام دژایەتیی فەلسەفەی هیگڵیش دەکات کە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە: ((قوربانییدان لە بەرژەوەندیی تاکبوونەوەی دەوڵەت، پەیوەندیی بنەڕەتییە لە نێوان دەوڵەت و هەموو ئەندامەکان و پێکهاتەکانیدا و بە ئەرکێکی گشتیی دادەنێت)) (هیگڵ، ١٩٩٢: ١١١).

لەبەر ئەوە زۆر گرانە ئاشتەوایی بکرێت لە نێوان وێناکردنی قوربانیدان لەپێناو دەوڵەتدا وەك نیشاندەرێکی بەڵگە لەسەر دەوڵەتی نموونەیی هیگڵ و لە نێوان لێکدانەوەی فۆکۆ یاما بۆ عەقڵانیەتی هیگڵیزم کە چەند هێڵێکی سوور دادەنێت لەژێر خاڵە لاوازەکانییدا لەناو سیستمی دەوڵەت دا وەك نیشاندەرێکی بەڵگەدار لەسەر کۆتایی مێژوو، فۆکۆ یاما کاردەکات بۆ ئاساییکردنی توخمێکی تر وەك هێزێکی ڕەها کە بتوانێت کۆتاییەك بۆ مێژوو دابنێت: ئەو توخمەش عەقڵانیەتی زانستی نوێیە بەو پێیەی میکانیزمێکی ڕێنماییکردنە، دەڵێت: ((دۆزینەوەی ئامرازە زانستییەکان دابەشکردنێکی بنەڕەتیی ـ نابازنەیی بۆ مێژوو ـ دروست کردووە بۆ چەند ماوەیەك لەپێش و دوای ئەو دۆزینەوەیەوە، تەنها بە گەیشتن بە سەردەمی زانست، ئەوا پێشکەوتن و بەرەوپێشچوونی زانستییانە ئامرازێکی ڕێنماییکردن دەستەبەر دەکەن کە دەتوانێت زۆرێك لە ڕواڵەتەکانی پەرەسەندنی مێژوو دوای خۆی تەفسیر بکات)) (١٩٩٢: ٧٣).

فۆکۆ یاما خاڵە لاوازەکانی دەوڵەت ڕوون دەکاتەوە ـ کە توخمە هیگڵیەکەیە لە نموونەی مۆدێرنیزم دا ـ بەو پێیەی ئەو لاوازیە بەڵگەیە لەسەر کۆتایی مێژوو، لە ڕێگای دیاریکردنی توخمێکی پیرۆزی نوێ کە ڕووکارێکی تری ڕووکارەکانی خودی

نموونەکە پێکدێنێت، بەگشتی هیچ بوارێك نییە بۆ جیاکردنەوەی قەیرانی سیستمی دەوڵەت دوور لە چوارچێوە گشتییە جیاکراوەکەی تازەگەری، لەڕاستیدا ڕاگەیاندنی کۆتایی مێژوو بە مەبەستی فێڵکردن لەو ناکۆکیە فەلسەفیە، تەنها بەکارهێنانێکی پراگماتیکیانەی لەڕادەبەدەری سادەکردنەوەی پێدراوە مێژووییەکانە، هەرەسهێنانی سیستمی سۆشیالیستیی سەلماندی کە هەرەسهێنانی چەمکی دەوڵەتە، نەوەك کۆتایی مێژوو، چونکە گەلانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات شۆڕشیان بەرپا نەکرد، تەنها لەبەر شکستهێنانی سیستمە ئابوورییە سۆشیالیستییەکە، بەڵکو هەڵسان دژ بەو شێوازە سەرکوتکارانەی کە هەڵقوڵاوی چەمکەکانی بەکۆیلەکردنی مۆدێرنیزمە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ـ تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ـ هێشتا ئەو گەلانە دەستەوسانن لە گەیشتن بە بەدیلێکی شیاو ئەو بۆشاییەیان بۆ پڕ بکاتەوە کە دروست بووە، بەدوای ئەوەشدا ئارەزووەکانیان هەڵواسراوە بە یەکگرتن لە ناو کۆمەڵەی ئەوروپییدا بۆ هێنانەدی خەونەکەیان لە کۆت و بەندی ستەمکاریی بیرۆکراسی کە دەوڵەتی سۆشیالیستی بۆی بەجێهێشتوون، بەڵام ئەو خەونانە بەهەوادا چووە کاتێك دابەش بوو نە ئەتنیە دەمارگیرییەکان شوێنی سیستمی دەوڵەتی نەتەوەییان گرتەوە.

سیستمی دەوڵەتی نەتەوەیی ـ لە واقیعی ئێستادا ـ بەرەنگاری قەیرانێکی گشتگیر بووە بە دوو ئاڕاستەی بنەڕەتیی کە بریتین لە گلۆباڵیزم و دەمارگیریی نەژادیی لۆکاڵیی، چونکە ئەوروپا لە ئێستادا دووچاری ئەو دوو دیاردەیە بووە، تێبینیش دەکەین ئەوروپای ڕۆژئاوا دەستەوئەژنۆ لە ئاست ئەو تەنگژەیەدا ڕاناوەستێت، بەڵکو چەندین چارەسەر و پێشنیاز پێشکەش دەکات لە ڕێگای بازدان لە چەمکی دەوڵەتی نەتەوەوە بۆ چەندین چەمکی قوڵتر و کاراتر بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ گۆڕاوەکانی جیهانگیرییدا، لەکاتێکدا هێشتا ئەوروپای ڕۆژهەڵات بەهۆی ئاژاوەنانەوەی دەمارگیریی نەژادیی توندڕەوەوە دەلەرزێت، هیچ دەوڵەتێك خاوەنی سیستمی فیدراڵی بێت، یان مەرکەزیی یەکگرتوو، سەلامەت دەرناچێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو تەحەددییاتە بەزەبرانەدا. پلۆرالیزمی ئایینیی و نەژادیی لە

ناوچەکانی وەك بولقان و قەفقاسیا ئەو دوو ناوچەیەی کردۆتە توندترین تیشکۆی ململانێی خوێناوی لەم قۆناغەدا کە دووچاری ئاژاوەی سەرتاسەریی هاتووە.

گۆڕانکارییە ڕادیکاڵییەکان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا و ئەو قەیرانەی سیستمی دەوڵەتی نەتەوەیی پێدا تێدەپەڕێت، تەنها ڕەنگدانەوەکانی قەیرانێکی محەلیی نین تایبەت بێت بەو ڕژێمە سیاسییانەی پاشکۆی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بوون و بەس، بەڵکو ڕەنگدانەوەکانی قەیرانە ژیارییە گشتگیرەکەن کە سەرشانی نموونە مۆدێرنێتەکەی بەتەواوی گران کردووە، ئاڕاستە نەتەوەییە نوێکان لە ئەوروپای ڕۆژئاوا و باکووری ئەمریکا نیشاندەری ئاگادارکەرەوەمان پێشکەش دەکەن لە بارەی قەیرانی بەهاکانەوە، کە ئەم قۆناغە مێژووییەی پێ دەناسرێتەوە، سەرباری ئەوەش ئەو قەیرانەی دەوڵەتی نەتەوەیی پێوەی دەناڵێنێت تەنها وەك قەیرانێکی هەیکەلیی دانانرێت، بەڵکو زیاتر قەیرانێکی سیستمی بەهاکانە و خۆ لێدوورگرتنی تەنها لە ڕێگای هەندێك ڕێ و شوێنی چاکسازیی هەیکەلییەوە مومکین نابێت، کێیە دەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەوەی لە بۆسنیا ڕوویداوە لە پاکتاوی نەژادیی و قەتلوعامە کۆمەڵکوژییە دڕندەییەکان، تەنها بە هەندێك گۆڕانکاریی هەیکەلیی دووردەخرانەوە، سیستمی بەهاکانی دەوڵەتی نەتەوەیی لە توانایدا نەدەبوو ڕێگا لەو جۆرە ئاژاوە و پشێویە بگرێت، لە لایەکی دیکەوە ڕووی ساختەی شمولیەت و جیهانیبوونی (بەها ئەوروپییەکان) کاتێك دەرکەوت، گەلانی موسڵمان پێویستیان بەو بەهایانە هەبوو.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی پێشەوە، دەکرێ بوترێت قەیرانە ناوخۆییەی سیستمی دەوڵەتی نەتەوەیی پێوەی گرفتار بووە، پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بە سەرجەم سیستمی جیهانییەوە، ئەو سیستمەی لەسەر بنەمای تاکبوونەوەی هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی تر، ڕاوەستاوە: ((تاکێتی بریتییە لە هۆشیاری بە بوونی تاك وەك یەکەیەك کە لە یەکەکانی تری هاوشێوەی جیاکارە، خۆی تەعبیر لە خۆی دەکات لە

دەوڵەتەکەیدا و بوونی خۆی لە هەموو دەوڵەتەکانی تر جیادەکاتەوە، ئەو دەوڵەتانەش بە دەوری خۆیان سەربەستن لە دەوڵەتەکانی تر)) (هیگڵ،١٩٩٠: ١١٠).

ئەم تێڕوانینەی کە دەربڕی ئەرکی تاکە بەرامبەر دەوڵەت لە سیستمی هیگڵیدا، پاساوێکی فەلسەفیی بۆ بەرپابوونی جەنگەکان پێشکەش دەکات: ((ئەگەر دەوڵەتەکان جیاواز بن و پێکەوە گونجانی ئیراداتیان بە یەکەوە نەگونجاو بوو، کێشەکە بە جەنگ نەبێت چارەسەر ناکرێت. دەوڵەتیش بە هاوکاریی ژێردەستەکانی دەتوانێت خۆی فراوان بکات و بەرژەوەندییە لق و پۆپدارەکانی بهێنێتەدی و پەیوەندییە جیاوازەکانی دابمەزرێنێت، ئەو پەیوەندیی و بەرژەوەندییانە لەوانەیە بە هەڵگیرسانی جەنگ تا ڕادەیەکی زۆر زیانیان پێبگات، بەڵام ئەستەمە ئەوە دیاریی بکرێت کام لەو پەیوەندیی و بەرژەوەندییانە دەتوانێ بە پێشێلکارییەکی ئاشکرای پەیماننامەی نێوان دوو دەوڵەت دابنرێت، یان تەنانەت دیارییکردنی ڕادەی زیانگەیاندنی ئەو پێشێلکارییە بە کەرامەت و سەربەستی دەوڵەتەکە، هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی داخۆ دەوڵەتەکە وجود و کەرامەتی بە کام لەو پەیوەندیی و بەرژەوەندییانەوە پەیوەست بکات، با ئەگەر زۆر کەمیش بێت، دوابەدوای ئەوە پەیوەندییەکە لەوەدا کورت دەکرێتەوە کە دەڵێت هەرکاتێك دەوڵەت هەستی کرد بە هەستیاریی هەر پەلامارێك لەسەر بەرژەوەندییەکانی، ئەوا ئەو دەوڵەتە وێناکردنێکی بەهێزتر دەسەپێنێت بە تاکێتی بوونی لەوانی تر لە ئەنجامی ئاشتییەکی ناوخۆیی درێژخایەن لە گەڕان بە دوای هێنانەکایەی حاڵەتێك لە چالاکیی لە دەرەوەی سنوورەکانی)) (هیگڵ،١٩٩٠: ١١٣).

بەم شێوەیە دەبینین تێڕوانینی دەوڵەتی نەتەوەیی لای هیگڵ لایەنێکی ئیجابیی جەنگ دەخاتە ڕوو، لەبەر ئەوەی هاووڵاتیانی دەوڵەتەکە بە توانا دەکات بۆ بەدیهێنانی هۆشیاریەکی زیادبوو بە ئاستی ئەو پەیوەندییەی پێکیانەوە دەبەستێت، وەك هاووڵاتیان لە یەك دەوڵەتدا.

هیگڵ گومان دەکات لەوەی یاسای نێودەوڵەتیی و پلانە هاوچەرخە جیاوازەکان کە هەوڵ ئەدەن بۆ پێکهێنانی یەکێتییەکانی ئاشتیی لە توانایاندا بێت هەر پێشکەوتنێکی بەرچاو بهێننەدی، ئەو گومانی لەوەدایە، چونکە بڕوای بەوەیە دەوڵەت پێویست نییە ـ ناشتوانێت ـ قوربانیی بدات بە تاکێتی و سەربەخۆیی خۆی، بۆیە دەڵێت: ((گریمانەی بنەڕەتی کە پەیوەندیدارە بە یاسای نێودەوڵەتییەوە (وەك ئەو یاسا جیهانییانەی کە پێویستە دەست بدەن بۆ جێبەجێکردن لە نێوان دەوڵەتەکاندا جیاوازە لە ناوەڕۆکی وردی بەڵگەنامە دانراوەکان) دەڵێت بە یاساییکردنی پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتەکان و مقاوەمەکردن لەسەرپابەند بوونی دەوڵەتەکان بەرامبەر یەکتر، کەوا دەکات هێشتنەوە لەسەر ئەو یاسایە پێویست دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی سەروەریی دەوڵەت ئەو بنەما سەرەکیەیە کە دەوڵەت پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانی تردا لەسەر دادەمەزرێنێت، بۆیە دەوڵەتەکان تا ئەو ڕادەیە لە بارێکی سروشتییدان لەگەڵ یەکتر، مافەکانیشیان دەگوێزرێتەوە بۆ بواری جێبەجێکردن، مادامەکی مافەکانی تاك بن، نەك مافی بە کۆمەڵ لە ژێر چەتری ئیرادەیەکی دەزگاییدا کۆیانکاتەوە، لەبەر ئەوە ئەم مەرجەی کە پێویستە لە یاسای نێودەوڵەتییدا جێگیر بکرێت، لەوە زیاتر نییە کە مەرجێکی بە باش زانراوە، بەڵام ئەوەی لەڕاستیدا ڕوودەدات ئەوەیە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان کە ملکەچن بۆ پەیماننامە گرێدراوەکان، جێگای ئەو پەیوەندییانە دەگرنەوە)). (١٩٩٠: ١١٣)

سێ پرسیار لێرەدا دەوروژێت کە پەیوەستن بە ئاستی تێگەیشتن لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ئەو قەیرانەی ئەو پەیوەندییانەی پێدا تێدەپەڕێت.

پرسیاری یەکەم ئەوەیە کە: ئایا لە توانادایە گەیشتن بە ئەخلاقیاتێکی نموونەیی دیارییکراو کە بەدیهێنانی ئاشتی و ئازادیی زامن بکەن لەسەر ئەو بنەما فەلسەفیە تازەگەرییانەی لە سیستمی جیهانییدا هاتوون بەو شێوەی هیگڵ وێنای کردووە؟ وەڵام، بێگومان نەخێرە، چونکە هیگڵ وا دەبینێت بەرزبوونەوەی توندی گرژی نێوان دەوڵەتەکان پێویستە لە پێناو پاراستنی قەوارە و کەرامەتی

هەریەکیان، کەواتە ئامانجی فۆکۆ یاما لەمەدا چییە کە فەلسەفەی هیگڵیزم دەکاتە مەرجەعیەتی خۆی بۆ ڕوونکردنەوەی بەهاکانی لیبرالیزم وەك فۆڕمێکی جیهانیی ڕەها لە بەهاکان، مەگەر ئاخۆ فۆکۆ یاما لەلایەنی مەنهەجیەوە هیچ بەلایەوە گرنگ نییە خوێندنەوەکانی خۆی لە نووسینەکانی هیگڵەوە هەڵدەبژێرێت، یان ڕەنگە بیەوێت بنەمایەکی فەلسەفیی مەحکەم پێشکەش بکات بۆ کەمکردنەوەی توانای هیگڵ لە بەرگرییکردن لە سیستمە جیهانییەکەی کە هەر لە بنەڕەتەوە لە سیستمی دەوڵەتی نەتەوەیی (هیگڵی)یەوە بەرهەم هاتووە، بەڵام بە وێنەیەکی زیاتر مۆدێرنیزم و بە دوای ئەوەدا فۆکۆ یاما دەیەوێت قەیرانە هاوچەرخەکە بشارێتەوە و شکستی نموونە تازەگەرییەکە ڕووپۆش بکات لە جێگیرکردنی پایەکانی سیستمێکی جیهانیی دادپەروەردا، وەك دەردەکەوێت ئەوە باکگراوندێکی فەلسەفیی پێکدێنێت بۆ سیستمی جیهانیی نوێ.

پرسیاری دووەم ئەمەیە: ئایا (هیگڵ) لەسەر هەق بووە، یان بەلای کەم ڕاستگۆتر بووە لە (فۆکۆ یاما) لە شیکردنەوەیدا بۆ یاسای نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، ئەگەر مەبەستی بووبێت وەسفی دۆخەکە بکات؟ مومارەسەکانی سیستمی بەرگریی هاوبەش بەو سیفەتەی سەرکەوتووترین دامەزراوەکان لە ناوخۆی یاسای نێودەوڵەتییدا دەیسەلمێنێت کە شیکردنەوەکەی فۆکۆ یاما هیچ پەیوەندییەکی نییە بە پەرەسەندنی سیستمی جیهانیی و بەهاکان و ئەخلاقیاتەکانیەوە، چونکە سیاسەتی دووپێوانەیی کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە جەنگی کەنداو و قەیرانی بۆسنەدا مومارەسەی کرد، ئەو ڕاستییەی دەرخست کە تەنها هێز کۆنترۆڵی سیاسەتە نێودەوڵەتییەکان دەکات، ئیرادەی دەوڵەتە گەورەکانە، نەتەوە یەکگرتووەکانیش نەیتوانیوە هیچکام لەو بڕیارانەی جێبەجێ بکات کە پێویستی بە سەپاندنی هێز بووبێت لە سەردەمی شەڕی سارددا، بەهۆی مۆلەقبوونی لە نێوان دوو هێزە گەورەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەتدا، لەبەر ئەوەش کە قۆرخکردن سیفەتی زاڵە بەسەر پەیوەندییە

نێودەوڵەتییەکانەوە لە ماوەی دوای تەواوبوونی شەڕی سارددا، نەتەوە یەکگرتووەکان نزیکترە لەوەی کە ببێتە دەزگایەکی سیاسەتی دەرەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و شتێك ناکات جگە لە بڕیاردان و ستایشکردنی ئەو دەوڵەتەی چاودێریی دەکات، بۆیە یاسای نێودەوڵەتیی و هەموو دەزگاکانی تەنها ڕەنگدانەوەیەکی هەیمەنەی هێزە ڕاستەقینەکانە بەسەر دەوڵەتانی تردا، ئەو مەسەلەی کە (هیگڵ) لە پێش زیاتر لە سەدەیەك، بە وردی وەسفی کردووە.

پرسیاری سێیەم ئەوەیە: سیستمی جیهانیی ئامانجی بۆ چ شتێکە؟ ئایا بەڕاستی ڕەنگدانەوەیە بۆ جەختکردنەوەکەی فۆکۆ یاما لەسەر جیهانێتی بنەما دیموکراسیی و لیبراڵیزمەکان؟. وا دەردەکەوێت کە پێچەوانەکەی ڕاست بێت، چونکە سیستمی جیهانیی بەرجەستەکردنە بۆ سیستمی ((حوکمی کەمینە)) لە قۆناغی دوای شەڕی ساردا، ئەو سیستمەش دەسەڵات و بەرپرسیارێتی تایبەتی داوە بەو پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجومەنی ئاسایش و تەنها بۆ (مافی بڕیار وەرگرتن و مافی ڤیتۆ)، لە بارەی هەستیارترین و گرنگترین کێشەکان لەسەر گۆڕەپانی جیهانییدا، خۆ ئەگەر تیۆرەکەی فۆکۆ یاما لە بارەی بەجیهانییکردنی بەها دیموکراسیەکانەوە ڕاست بێت، دەبوو ئاڕاستەیەك ببوایە بەرەو بونیادێکی زیاتر دیموکراسییانە لەوەی پەیوەندیدارە بە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە، هەروەها دەبوو نەتەوەیەکگرتووەکان ڕێبەرایەتی ئەو ئاڕاستەیەی بکردایە لەگەڵ دەوڵەتە دیموکراسییەکاندا، بەڵام لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا پێچەوانەکەی ڕاست دەرچوو، چونکە ئەو حوکمە کەمینەیە کە سیستمی جیهانیی ڕۆژئاوایی جێگیری کردووە، گۆڕا بۆ قۆرخکردنێکی گشتگیریی بڕیاری نێودەوڵەتیی، هەر بڕیارێك پەیوەست بێت بە کێشە نێودەوڵەتییە چارەنووسسازەکانەوە ئەمڕۆ قۆرخ کراوە بۆ ئەو نوخبە ئەمریکییەی کە ئەولەویاتی ستراتیژیی دیاریی دەکات، ئەرك و کاری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانیش بووە بە پاساودانی بڕیارە ئەمریکیەکان، زیاتر لەوەش ئامانج لە پێکهێنانی کۆمەڵەی هەشت دەوڵەتە گەورەکە کە ((دەوڵەتە پیشەسازییە

گەورەکان)) لەخۆ دەگرێت و ئەو دەسەڵاتەی کە هەیەتی بەسەر بڕیارە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکانەوە، هەمان ئاڕاستەی ئێستا جەخت دەکاتەوە بەرەو سیستمێکی جیهانیی قۆرخکاریی کە ژمارەیەکی زۆر کەم لە دەوڵەتە گەورەکان حوکمی دەکەن، لێرەوە دەردەکەوێت کە هیگڵ لە شیکردنەوە وەسفکارییەکەیدا ڕاستی کردووە، هەروەك دەردەکەوێت کە فۆکۆ یاما بەهەڵەدا چووە لە خراپ بەکارهێنانی سیستمە هیگڵیەکەدا لە پێناو بەرگرییکردن لە ئامانجە سیاسییە پراگماتیکیەکان بۆ حسابی ئەو نوخبە نادیموکراسییە دەسەڵاتدارەدا، ئەوەش بە پێدانی پاساوی هێشتنەوە لەسەر سیستمی جیهانیی کۆن، بەڵام لە بەرگێکی نوێدا کە سیستمی جیهانیی ئێستا لەبەریدەکات، لەگەڵ هەموو ئەوەشدا شاردنەوەی قەیرانی بەهاکان کە داویەتی لە سیستمی جیهانیی ئێستا لە شوێنی کوشندەدا زۆر زەحمەتە، تەنانەت ئەگەر نموونەی وەك (فۆکۆ یاما)ش هەوڵ بدەن ئەو ئازارانە سووك بکەن کە ئەم سیستمە لە ڕووی فیکریی و سیاسییەوە پێوەی دەناڵێنێت.

**ب - سیستمی نوێی جیهانیی و جیهانی ئیسلامیی: باکگراوندی بەرەنگاربوونەوە:**

لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا لە لای ناوەندە سیاسییەکان و سەنتەرەکانی توێژینەوەی ڕۆژئاوا ڕاستییەك پەیدابووە بۆ شێواندنی کۆمەڵگە موسڵمانەکان و وێناکردنیان وەك کۆمەڵەی شاز و ڕیزپەڕ لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، مەسەلەکەی سەلمان ڕوشدی و ئەو مشتومڕەی لە بارەی یاسای پۆشاکی ئیسلامیی لە فەڕەنسا و بەریتانیا بەرپابوو، هەموویان چەند هۆکارێکن بۆ ورووژاندنی لایەنگیرییە مێژووییەکان دژ بە ئیسلام، هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیش بە شێوەیەکی چڕ و پڕ بەکارهێنراون بۆ ئەو مەبەستە، تا هەڵگیرسانی قەیرانی کەنداو بە داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە، ئەوەبوو سەرنجماندا کە لەگەڵ ئەوەش زۆرێك لە دەوڵەتە ئیسلامییەکان پشتیوانیان کرد لە بەرەی هاوپەیمانیی، لە بەرژەوەندیی کوەیت، کەچی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی سەدددام حسێنی وێنا دەکرد وەك هێمایەك لەسەر

گەشەکردنی ڕەوتی ئیسلامیی ئوسولّیی، ئەو وێناکردنە دەیسەلمێنێت کە ڕۆژئاوا هەولّدەدات دوژمنێکی ئیسلامیی ـ بە شێوازی فیلمە سینەماییەکان ـ دروست بکات بۆ بەکارهێنانی لە بەدیهێنانی ئامانجە سیاسییەکانی دا.

لە دیمانەیەکدا لەگەلّ ڕۆژنامەی (لیبراسیۆن)، زانای کۆمەلّناسی فەرەنسایی (ئی. مارین) ئاماژە دەکات بۆ قەیرانی عەلمانیەتی ڕۆژئاوایی، لە باسێکدا لە بارەی مەترسی ئیسلامیی دروستکراوەوە، دەڕوات بۆ ئەوەی بلّێت هەندێك کەس هەولّ دەدەن بۆ شاردنەوەی قەیرانی ڕۆژئاوا لە ڕێگای هاندان دژ بە ((وێنەی دوژمنێکی مێژوویی))، بێگومان سیناریۆی دوژمنی مێژوویی لەوانەیە هەندێك کێشە و قەیرانی ناوخۆیی بشارێتەوە، هەروەك لەوانەیە یارمەتیدەر بێت لەسەر بەدیهێنانی هەستکردن بە یەکێتی ناوخۆیی و پشتگیرییکردنی یەکدی، لەم ڕاستایەدا گرێدانی کەسایەتی سەددام حسێن بە کەسایەتییەکانی دیکەی وەك هیتلەر و ستالین لە کاتی قەیرانی کەنداودا نموونەیەکی سەرنجڕاکێش بوو، کاتێك وردبینەوە لە دەرهاویشتە فکریی و دەروونییەکانی ئەو جۆرە گرێدانە، لەوانەیە لانی کەم: وێناکردنی جیهانی ڕۆژئاوا بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك جەنگاوەرێك تێدەکۆشێت لە پێناو ئازادیی و دیموکراسییەت دژ بە نازیزم لە سیەکان و چلەکانی سەدەی ڕابردوودا، یان وەك ئەوەی لە ماوەی شەڕی ساردا بەرەنگاری بیروباوەڕە سۆشیالیستییەکان بوونەوە.

بوونی دوژمنێکی ئایدۆلۆژیی، یان سیاسیی، ئامرازێکە لە ئامرازەکانی پاساودانی سیاسەتی دەرەوە، (فالرشتاین) جەخت دەکات لەسەر ئەو دیاردەیە بەو سیفەتەی خاسیەتێکە لەو خاسیەتانەی کە بەلّگەن لەسەر بەردەوامبوونی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکیی و دەلّێت: ((ئێمە گریمانە دەکەین بیّ وردکردنەوەی ڕوودانی گواستنەوەیەك لە سیاسەتی ئەمریکیدا بەرامبەر یەکێتی سۆڤیەت لە سیاسەتی هێورکردنەوە کە (ڕۆزفلت) دایناوە، بۆ سیاسەتی دوژمنکاریی کە (ترومان) و جێنشینەکانی لە سەردەمی شەڕی ساردا پێی ناسرابوون، بەلاّم من جیاوازم لەگەلّ

ئەوەدا، چونکە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە لای منەوە نەگۆڕاوە، بەدوور لە ڕەوانبێژیی گوتاری سیاسیی، دەبینین ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کار دەکات بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی ستالینی بچووککراوە، بەڵکو چاودێرییشی دەکات، بەتایبەتی لەناو سنوورەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا لە ماوەی سالانی (١٩٤٥) بۆ (١٩٤٨م)، ستالینیش بە جوانی وەڵامی دایەوە کە بەبێ مەبەست پاساوی ئایدۆلۆژیی بۆ دەستەبەر کرد بۆ جێگیرکردنی هەیمەنەی ئەمریکی بەسەر سیستمی جیهانییدا، ستالینیزم خاوەنی بۆچوونی میانڕەوانە بوو و ئارەزووی گرژکردنی دۆخەکەی نەبوو، بەتایبەتی ئەو هەموو دەسەڵاتەشی هەبوو بەسەر هێزە شۆڕشگێڕییەکانەوە لە ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا، بەڵکو کاری دەکرد بۆ زامنکردن و سەقامگیرکردنی بارودۆخەکە لە ناوچەکەدا کە نوێنەرایەتی سێیەکی ڕووبەری جیهانی دەکرد، تا ستالین مرد، دوای ئەو یەکێتی سۆڤیەت دەستی کرد بە لاوازبوون بە شێوەیەکی خێرا تا کۆتایی حوکمی (گۆرباچۆڤ) کە بووە هۆی تەنگەتاوکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا)) (١٩٩٠: ٤٦).

دوای کۆتاییهاتنی شەڕی سارد، بەرەیەکی دوژمنکاریی نوێ دەستیکرد بە دەرکەوتن لەسەر ساحەکە بۆ شوێنگرتنەوەی ئەو وێناکردنە لایەنگیرە، لە زۆرێك لە نەخشە گریمانەکراوەکاندا کە ڕۆژنامەکان دەیانکێشا بۆ ئەوەی پەیوەستە بە دابەشکردنی سیاسیی هێز لە سەدەی بیست و یەکەمدا، ئوسوڵیەتی ئیسلامیی هەڕەشەی یەکەم بوو کە ڕێگر دەبێت لە بەردەم بەجیهانییکردنی ئەو بەهایانەی کە شارستانێتی ئەمریکی پشتیوانیی لێدەکات و کۆسپە لە ڕێگای دامەزراندنی ئەورووپای یەکگرتوودا، شیکردنەوەکەی فۆکۆ یاما لەسەر هەمان ڕەوت دەڕوات، بەڵکو دوورتریش لەوە کە دەڵێت: ((ئیسلام بە کردار توانیویەتی دیموکراسیی لیبراڵیزم زیندەبەچاڵ بکات لە زۆر پارچەی جیهانی ئیسلامییدا، ئەوەش هەڕەشەیەکی ئاشکرایە بۆ مومارەسەکانی لیبراڵیزم تەنانەت لە ناو ئەو دەوڵەتانەش دا کە هێشتا دیموکراسیی سیاسییان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجام نەداوە، بە

**دوای کۆتاییهاتنی شەڕی ساردda هەڕەشەیەکی عێراقی دژ بە ڕۆژئاوا دەرکەوت کە ئیسلام ڕەگەزێکی کاریگەر بوو بەشێوەیەك کە قسەکردن هەڵناگرێت))[٢٧]، بەم شێوەیە وێناکردنی جیهانی ئیسلامیی وەك دوژمنێکی چاوەڕوانکراو پاساو بوو بۆ ئەنجامدانی سێ کردە دژ بە گەلانی موسڵمان:**

**یەکەمیان پاساوهێنانەوە بۆ مومارەساتی سیاسەتی سەرکوتکردن دژ بە جەماوەرە موسڵمانەکە لەسەر دەستی نوخبە سیاسییە گەندەڵەکانی لایەنگری ڕۆژئاوا، لەژێر کارتێکردنی وێنەی ئەو فشارە دەروونیی و کردارەکانی مێشك شووشتنەوە، پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ و مومارەساتە شمولیە نادیموکراسییەکانی ڕژێمە سەربازییەکەی جەزائیر، تەنانەت نەخرایە بەر تاوتوێکردن و ئیدانەکردنی ڕووتیش، مەسەلەکە وا دەردەکەوت کە دوو سیستمی جیاوازی بەها جیهانییە دژ بە یەکەکان، بن.**

[٢٧] وادیارە فۆکۆ یاما لەبیری چووە یان لەبیری خۆی بردووە کە هێزە ڕۆژئاواییە لیبرالیزمە دیموکراسییەکان پێشتر هاوکاریی عێراق و ڕژێمی (سەددام حسێن)یان کردووە لە ڕووی سەربازییەوە دژ بە ئێران کە لەو قۆناغەدا ڕەمزێك بوو بۆ هەڕەشەکردن لە ڕۆژئاوا. لەگەڵ ئەوەشدا لە پەراوێزەکانی کتێبەکەیدا دان بەوەدا دەنێت کە ((ئەگەرچی عێراق دەوڵەتێکی ئیسلامییە، بەڵام حزبی بەعس کە سەددام حسێن سەر بەو حزبەیە، حزبێکی عەرەبییە و خاوەنی بۆچوونی نەتەوەیی و عەلمانییە و هەوڵەکانی بۆ ڕووپۆشکردنی خۆی بە بەرگێکی ئیسلامیی لە دوای داگیرکردنی کوەیت، کارێکی هیچ و پووچە بە بەراورد لەگەڵ هەوڵەکانی بۆ وێناکردنی خۆی وەك بەرگریکارێك لە بەها عەلمانییەکان لە بەرامبەر دەمارگیریی ئیسلامیی ئێراندا لە ماوەی جەنگی کەنداوی یەکەمدا))(١٩٩٢: ٣٤٧).

بێگومان فۆکۆ یاما دیاری نەکردووە چی مەبەستە لە ناوهێنانی عێراق بە دەوڵەتێکی ئیسلامیی، بۆیە هەردەم دەستەوسانە لە تەفسیرکردنی چۆنێتی وجودی دەوڵەتێکی موسڵمان لە ژێر حوکمی حزبێکی عەلمانییدا. من بڕوام وایە کە تێکەڵبوونێك دەکات لە نێوان بیرۆکەی گەلی موسڵمان و دەوڵەتی ئیسلامییدا، ئەوەش هەڵەیەکە لە زانستی سیاسییدا لێخۆشبوونی بۆ نییە. زاراوەی ((گەلی موسڵمان)) وەسفی بیروباوەڕێك دەکات کە گەلێك بڕوای پێیەتی، بەڵام زاراوەی ((دەوڵەتی ئیسلامیی)) ئەو مانایە لەخۆ دەگرێ کە دەوڵەتەکە سیستمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئیسلامیی کردۆتە ڕێباز.

مەسەلەی دووەم ئەو داپڵۆسینە دڕندانەیە کە دووچاری کەمینە موسڵمانەکان بووە و ئەو هێزانەی واپیشان دەدەن کە بەرگریی لە مافەکانی مرۆڤ دەکەن، تەنها وەك مەسەلەیەکی ناوخۆییان دانا کە بۆیان نییە دەستوەردانی تێدا بکەن و بەجێیانهێشت بۆ ئەو دەوڵەتانەی کەمینە موسڵمانەکانی تێدا دەژین، کەمینە موسڵمانەکان لە کشمیر و جۆرجیا و کۆسۆڤا و شوێنەکانی تر مەحروم بوون لە سوودوەرگرتن لە جیهانیبوونی بەها دیموکراسییەکان دوای ئەو هەموو تاڵیەیان چەشت لە ژینگە دیموکراسیەکەیاندا، بەڵکو بازنەی ئەو شێوازە فراوان بوو تا مەسەلەکە گەیشتە ئەوەی چەتە ڕێگرە صربییەکان– دوای ئەوەی ژنان و منداڵە موسڵمانەکانیان کوشت ـ وایان دەگەیان کە گوایە خەریکی ئەنجامدانی ئەرکێکی مێژوویی گرنگن بۆ پاراستنی ئەوروپا لە ئوسوڵیەتی ئیسلامیی، هەروەك دوو ملیۆن موسڵمانی بۆسنیایی کە دەیان ساڵ لە ژێر داپڵۆسینی ڕژێمەکانیاندا بوون، توانیبێتیان ئەوروپا داگیر بکەن! !

مەسەلەی سێیەمیش بریتی بوو لە گرێدانی هاوپەیمانێتییە نێودەوڵەتییەکان دژ بە هەر هەڕەشەیەکی ئیسلامیی چاوەڕوانکراو، بۆ نموونە دەبینین (لاری بەرسلر) سەناتۆری ئەمریکی و ئەندامی حزبی کۆماری سەرۆك بۆش، لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ هیندستان لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٢)دا سوور بوو لە سەر ئەوەی کە یەکێتییەکی ئیسلامیی هێزی ناوکی (هەستەیی) کە لە نۆ دەوڵەت پێکدێت لە ناوەڕاست و باشووری ئاسیا نزیکە دروست ببێتەوە، کە بێگومان هەڕەشە دەبێت لەسەر سەقامگیریی هیندستان بە شێوەیەکی تایبەت و سەقامگیریی جیهانیی بە شێوەیەکی گشتی، تائێستاش شیکەرەوە ستراتیژییەکان سەرگەرمن لە هەوڵەکانیان بۆ سەلماندنی ئەوەی کە پشتێنەیەکی ئیسلامیی کە لە تورکیاوە درێژ دەبێتەوە و ئێران و ئەفغانستان و پاکستان دەگرێتەوە و بە کۆمارە سۆڤێتییەکانی جاراندا تێدەپەڕێت لەسەر ڕێگای گۆڕانە بەرەو ئوسوڵیەت، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەو پشتێنەیە لە لایەن ئەمریکاوە پشتیوانی لێدەکرا لە سەردەمی شەڕی

ساردداا بۆ زامنکردنی بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی ئەمریکا دژ بە سیاسەتە فراوانخوازییەکانی یەکێتی سۆڤیەت لەو ڕۆژگارەدا، بە هاوتەریبی لەگەڵ ئەو دیاردەیەدا کۆماری صربیا داوای فراوانکردنی هاوکاریی لەگەڵ یۆنان دەکرد لە ناوچەی بەلقان، بەڵام ئەرمینیا کاری کرد لەسەر وروژاندنی هەست و سۆزە ئایینییەکان لە دەوڵەتە مەسیحییە گەورەکاندا بە مەبەستی دەستخستنی پشتیوانیان لە جەنگ لەگەڵ ئازەربایجان، هەروەك ئیسرائیل پشتگیریی هیندستان دەکات دژ بە بزاڤە جەماوەرییەکان لە هەرێمی کشمیر و بەنجاب، سەرباری زۆرێك لەو ئاماژانەی کە بەڵگەن لەسەر ڕوودانی پێشێلکارییەکانی ئیسرائیل دژ بە مافەکانی مرۆڤ لە فەلەستین، هاوشێوەی پێشێلکارییە داپلۆسێنەرەکان کە صربەکان لە بۆسنیا ئەنجامیان داوە، بەو شێوەیە دەبینین کە لایەنگیریی بێ پەردە دژ بە جیهانی ئیسلامیی، بە ناوی دژایەتیکردنی ئوسوڵیەتی ئیسلامیەوە دوژمنایەتییەکی ئاشکرای لە دواوەیە بە هاندانی دەوڵەتە دراوسێکانی هەندێك لە دەوڵەتە ئیسلامییەکان هەر لە مەغریبەوە تا ئەندەنووسیا و لە بۆسنیاوە تا ئاسیای ناوەڕاست.

باکگراوندێکی مێژوویی کە چەند ڕەهەندێکی تیۆریی و تەنانەت خەیاڵیشی هەیە بۆ نموونەی ئەو لایەنگیرییە دژ بە ئوسوڵیەتی ئیسلامیی، گرنگترینیان دوو ڕەهەندە: یەکەمیان ئەوەیە شارستانێتی ئیسلامیی تەنیا شارستانێتییەکە پێگەیەکی بەرزتری لە شارستانێتی ڕۆژئاوا هەبووە، سەروەری ئیسلامیی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و حەوزی دەریای ناوەڕاست لە گرنگترینی ئەو هۆکارانە بوون لە پشت هەوڵدانی ڕۆژئاواوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگا جوگرافیە بازرگانییە نوێیەکان لە هەردوو سەدەی پانزەهەمدا، بەڵام هەموو شارستانێتییەکان و کولتورە ڕەسەنەکانی تر کە لە ژێر باری جیهانگیریی ڕۆژئاوادا دەناڵێنن تا ئەم سەردەمەی ئێستاش، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە سەروەری و باڵادەستیی هاوشێوەی شارستانێتی ئیسلامییان نەبووە، بۆیە هەمیشە ئوممەتی ئیسلامیی لە مێژووی ڕۆژئاوادا وەك دوژمنی سەرسەخت سەیر کراوە.

ڕەهەندی دووەمیش بەرهەڵستیکردنی گەلانی موسڵمانە دژ بە چاوچنۆکیەکانی دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، بەڵام کۆمەڵگەکانی تر ملیان کەچکرد بۆ باڵادەستیی ڕۆژئاوا، ڕەهەندی سێیەم بریتییە لە هەوڵدانی جەماوەری موسڵمان لەم سەردەمەدا لە پێناو دووبارە دارشتنەوەی نەگۆڕە شارستانێتی و کولتورییەکانی لە سەردەمی جیهانگیریی کولتور و قۆرخکارییدا، هەر ئەوەش هۆکاری سەرەکییە بۆ تەفسیرکردنی ئەو مەسەلەی کە بۆچی گەلانی موسڵمان بە توخمی نەگونجاو لەگەڵ سیستمی جیهانییدا وەسف دەکەن، لە واقیعدا هەستێکی گشتیی بە نەبوونی ئارامیی پەیوەست بە ڕۆڵی سیستمی جیهانیی گەلانی موسڵمان گرتۆتەوە، هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ گرتنەبەری سیاسەتی دووفاقیی و دوو پێوانەیی لە کاروباری نێودەوڵەتییدا. چاوتێبڕینە فراوانخوازییەکانی سیاسەتی ئیسرائیلی کە سیستمی جیهانیی زۆر بە لێبوردەیی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، بەڵام ڕاپەڕینی خەڵکی فەلەستین بە کاری تیرۆریستیی وەسف دەکرێت، لە هەمانکاتیشدا بزاڤە یاخیبووە جەماوەرییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بە سەرکەوتنی ئازادیی وێنا دەکرێت، هیچ جۆرە کاردانەوەیەکی جیددیی نەبوو بەرامبەر دەستێوەردانی سەربازیی سۆڤیەتی لە کۆمارەکانی دەربارەی بەلتیقدا، تەنانەت ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان کە هەستیارییەکی لە ڕادەبەدەریان هەیە بەرامبەر کەمینەکان لە دەوڵەتانی جیهاندا، ئەوەندە زەحمەتی خۆیان نەدا ئیدانەی ئەو داپڵۆسین و سەرکوتکردنە بکەن دژ بە کەمینە موسڵمانەکانی هیندستان و یوگسلافیای پێشوو و بولگاریا و کشمیر و بۆرما و شوێنانی تر.

لە کاتێکدا ئەو دەوڵەتە ئیسلامییانەی هێزی ناوکییان هەیە، وەك پاکستان و کازاخستان بە سەرچاوەی مەترسیی لەسەر جیهان دادەنرێن، دەبینین زلهێزەکان چاوپۆشیی دەکەن لە چەکی ناوکیی و بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی دادەنێن لە دەوڵەتانی وەك ئیسرائیل و هیندستاندا، موسڵمانان ـ کە چواریەکی دانیشتوانی زەوی پێکدێنن ـ تەنها یەك کورسی هەمیشەییان لە ئەنجومەنی ئاسایشدا نییە،

لەكاتێكدا لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە كە ئەندامی هەمیشەییین مافی ڤیتۆ دژ بە هەموو خواستەكانی وڵاتانی ئیسلامیی بەكاردەهێنن.

ئەو ڕاستیانەی كە ئاماژەمان بۆ كردن و زۆری تریش كە لێرەدا بواری باسكردنیان نییە، وایكردووە میللەتانی موسڵمان متمانەیان بە سیستمی جیهانیی لاواز ببێت وەك میانگیرێكی بێلایەن بۆ چارەسەركردنی ناكۆكییەكان، بەتایبەتی دوای ئەو هەموو تاوانەی دژ بە گەلانی موسڵمان كراوە لە دوو دەیەی ڕابردوودا، هەستكردنی موسڵمانان بە نەبوونی ئارامیی بەو شێوەیە یەكێكە لە هۆكارە بنەڕەتییەكانی پشت كاردانەوەكانیان بەرامبەر ئەو ڕۆڵەی كە سیستمی نوێی جیهانیی پێی هەڵدەسێ.

**ج - بەرنامەیەكی نوێ بۆ كاری سیاسیی لە جیهانی ئیسلامییدا: بەرەو سیستمێكی جیهانیی ئەڵتەرناتیڤ:**

ئەو پرۆسەی پەراوێزخستنەی لە سایەی سیستمی جیهانییدا، ئەنجام دەدرێت و كاردانەوە ناڕەواكانی لەسەر گەلانی موسڵمان، بێگومان كاریگەریی نەخوازراوی دەبێت لەسەر بەرنامەی سیاسیی ئوممەتی ئیسلامیی، بە دڵنیاییەوە ئەو پەراوێزخستن و لایەنگیرییە پێشوەختە كار دەكەنە سەر تێڕوانینی سیاسییانەی موسڵمانەكان، بە نوخبە عەلمانیەكانیشەوە، ئەوانەشیان كە توندڕەون لە عەلمانیەتدا، تەنانەت كەمینە موسڵمانەكانی كە لە ژێر حوكمی ڕژێمە سۆشیالیستییەكانی پێشوودا بوون و قەناعەتیان بەوە كردبوو كە ئەو یەكسانییەی ئایدۆلۆژیای سۆشیالیزم ڕایدەگەیەنێت، جیاوازیی ناهێڵێت لە نێوان تاكەكانی كۆمەڵگەدا لەسەر بنەمای نەتەوەیی، یان عەقیدە، تەنانەت ئەوانەش سەلامەت دەرنەچوون لەو شێوازە سەركوتكردنانەی ڕژێمە سۆشیالیزمەكان جێبەجێیان كرد، وەك ئەو قەتڵ و عامەی لە بۆسنیا ڕوویدا لە سەر دەستی (میلۆسۆڤیچ)، هەروەها ئەوەی كە لە ئەنجامی سیاسەتی دوژمنكاریی و دەمارگیریی ڕوویدا لە لایەن (ئیدوارد شیفەرنادزە) كە بەحساب سەركردەیەكی دیموكراسی بوو لە هەموو لایەكەوە

ئاماژەی پێدەکرا، هاوزەمان لایەنگیری ڕووسیای دەکرد دژ بە موسڵمانەکانی هەرێمی ئەبخازیا و هەرێمی ئۆسیتیای باشوور.

لە لایەکی ترەوە، موسڵمانەکان ئەوانەشیان هەواداری بەها ڕۆژئاواییەکان بوون لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا دووچاری شۆك و بێئومێدی بوون بە هۆی سیاسەتی دووفاقییەوە کە بە ناوی لیبراڵیزم و دیموکراسیی و ئازادییەوە مومارەسە دەکرا، لەکاتێکدا پرۆسەکانی پاکتاوکردنی نەژادیی و پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ لە بۆسنەدا بەردەوام بوو، دەسەڵاتدارانی ئەمریکیی فشاریان دەخستە سەر تورکیا کە هاوپەیمانێکی هەمیشەیی ڕۆژئاوا بووە لە سەردەمی شەڕی سارد و دواتریشدا، ئەوەش لە پێناو پێشکەشکردنی تەنازولات لە قوبرسدا، لەگەڵ ئەوەی کە هیچ پرۆسەیەکی کۆمەڵکوژیی ئەنجام نەدرابوو لە ماوەی هەژدە ساڵی دوای دەستبەسەرداگرتنی تورکیا بەسەر بەشێك لەو دوورگەیەدا، ئەم جۆرە دژایەتییە بێگومان دەبێتە هۆی کەڵەکەبوونی قەیرانەکە لە نێوان نوخبەی عەلمانیەتی تورکیا کە هەمیشە هەوڵی داوە ناوەندەکانی هێزە ڕۆژئاواییەکان دڵنیا بکاتەوە کە تورکیا دەستی هەڵگرتووە لەوەی بەرپرسیارێتییەکانی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیی بگرێتە ئەستۆ، لەکاتێکدا فڕۆکەکانی هاوپەیمانی ڕۆژئاوا بە ئاسمانی عێراقدا دەسوڕانەوە بۆ وێرانکردنی ئەوەی کە ماوە، بەردەوام بوون لە دەستی دەستی و کات بەفیڕۆدان تا صربەکان موسڵمانانی بۆسنەیان لەناوبرد، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژئاوا ئارەزوویەتی هەموو بوونێکی ئیسلامیی لە ئەوروپادا لەناوبەرێت، ئەوەی کە لەگەڵ نوخبەی عەلمانیەتی تورکیادا ڕوویداوە، دەگونجێت هەمان سیاسەتی دووفاقیی ڕژێمە عەرەبیی و ئیسلامییەکانی دیکە ئەوانەی کوێرانە بوونەتە شوێنکەوتەی هێزە ڕۆژئاواییەکان، ڕەنگە ناچار بن پێداچوونەوە بکەن بە هەڵوێستەکانیاندا لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیاندا.

لەسەر مەودای دوور، ئەو پەرەسەندنە یەك لەدوای یەکانە بێگومان کار دەکەنە سەر ئیدراکاتی دەروونیی و سیاسیی جەماوەرە موسڵمانەکە، لەگەڵ پەیدابوونی

هەستکردنێکی بەهێز بە شوناسی ئیسلامیی لای نوخبەی حوکمڕان لەناو کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا، چاوەڕێی ئەوەش دەکرێت هۆشیاری زاتیی لە جیهانی ئیسلامییدا زیاتر گەشە بسێنێت لە ئەنجامی ئەو قەیرانەی ڕووبەڕووی سیستمی دەوڵەت بووەتەوە، بەهۆی خراپ بەکارهێنانی لەلایەن هێزە ڕۆژئاواییەکانەوە، لەبەر ئەوە لەوانەیە بەم نزیکانە گۆڕانکارییەکی فراوان لە بەرنامەی سیاسیی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا ببینین، تیۆرە سیاسییەکان و مومارەساتە کردارییەکانی جیهانی ئیسلامیی لە سەدەی ڕابردوودا باشترین سەرچاوەیە بۆمان بۆ پێشکەشکردنی چەندین بەڵگەی مانادار بۆ دانانی هێڵە سەرەکییەکانی ئەولەویاتی ئیسلامیی لە سەدەی بیست و یەکەمدا، واقیعەکە شاهێدە لەسەر ئەوەی کە گۆڕانکارییە سیاسییەکان لە سەدەی ڕابردوودا بەشێوەیەکی قووڵ کاری کردووە لە تێزەکان و مومارەساتی ڕژێمەکانی حوکم لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا، ئەوەتا دوای ئەوەی سیاسەتی بەڕۆژئاواییکردن بۆشاییەکی دروستکرد و ماوەی نێوان لایەنی تیۆریی و پراکتیکی زۆر لێکدوورخستۆتەوە و بەهۆیەوە دەزگاکان و چەمکە کلاسیکییەکان گۆڕانێکی نزیك لە ڕیشەییەوە دەبینین. بەهەرحاڵ هەڵسان بە شیکردنەوەی تێز و مومارەسە سیاسییەکانی نێوان چارەکی یەکەم و دوای سەدەی بیستەم، لەباریدایە کە ئەو چالاکییە نوێکارییانەمان بۆ بدۆزنەوە کە شارستانێتی ئیسلامیی پێوە ناسراوە.

دەشتوانین بە قووڵاییەکانی ڕژێمەکانی حوکمڕانی جیهانی ئیسلامیی لە سەدەی بیستەمدا بچینە خوارەوە و لە میانەی چوارقۆناغدا بۆی بڕوانین، هەریەکەیان چارەکە سەدەیەك لە پەرەسەندنە سیاسییەکانی جیهانی ئیسلامیی کورت دەکاتەوە.

قۆناغی یەکەم لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەست پێدەکات و بە ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی لە (١٩٢٤)دا دوایی دێت، ئەم قۆناغە لە ڕووی تیۆریی و پراکتیزەکردنی سیاسییەوە درێژکراوەی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بوو، بەڵام

قۆناغی دووەم لە کۆتایی دەوڵەتی عوسمانییەوە دەست پێدەکات تا هەڵگیرسانی شۆڕشەکانی ڕزگاربوون لە جەنگی ئیستیعمار تا کەمێك دوای جەنگی جیهانیی دووەم. قۆناغی سێیەمیش ماوەی شۆڕشەکان دژ بە ئیستیعمار تا دەیەی حەفتاکان دەگرێتەوە، تا دەگاتە قۆناغی چوارەم کە بە سەردەمێکی نویَ لە ئیدراکی زاتیی دەناسرێت و هاوتەرییە لەگەڵ ڕووداوی زۆر گەورەی وەك دەستپێکردنی جیهاد لە ئەفغانستان و هەڵگیرسانی شۆڕشی گەلانی ئێران دژ بە ڕژێمی شاهەنشاهی و گەرمبوونی ڕاپەڕینی گەلی فەلەستین و داڕووخانی بلۆکی سۆشیالیزم.

هەریەکە لەو قۆناغانە کاریگەریی ئاشکرای لەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییە جیاجیاکان بەجێهێشتووە لەناو سیستمی جیهانیی هاوچەرخدا و هەروەها لەسەر زلهێزە باڵادەستەکانی.

**قۆناغی یەکەم:** مەیلی ئیمپریالیستی پایەی بنەڕەتیی بوو لە پایەکانی سیستمی جیهانیی لەو قۆناغەدا و لەو ماوەیەدا دوو جۆر مومارەسەی سیاسیی جیاواز دەرکەوتن، چونکە دابەشبوونی جوگرافیای سیاسیی دەوڵەتی عوسمانیی، ناوەندی سیستمی حوکم بوو خۆی لە شەخسی خەلیفەی عوسمانیدا دەبینیەوە، لە ژێر لێدانە یەك لە دوای یەکەکانی هێزە ئیستیعمارییەکاندا دەینالاند، لەکاتێکدا دەوڵەتە ئیسلامییەکانی دیکە بووبوون بە ژێر ئاگری هێزە ئیستیعمارییەکانەوە، سوڵتان عەبدلحەمیدی دووەم دەرکی بەو پەیوەندییە بەهێزەی نێوان دوو دۆخی سیاسیی پێشوو کردبوو، هەروەك قەناعەتی تەواوی هەبوو بەوەی مانەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانیی ئەستەم دەبێت، هاوکاریکردنی دەوڵەتی خیلافەت لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامییەکانی تردا، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو سیستمە جیهانییەی کە هێزە ئیستیعمارییەکان پایەکانیان داکوتاوە، دامەزراوەی خیلافەت ڕۆڵێکی میحوەریی لەو بوارەدا بینی، هەر ئەویش تاکە هێز بوو بۆ کۆکردنەوەی هەموو لایەکی ئوممەتی ئیسلامیی و ئامادەکردنی جەماوەری ئیسلامیی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئیستیعمارە، لەبەر ئەوە بوو کە هێزە ئیستیعمارییەکان، بەتایبەتی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی

کاریان کرد بۆ لەناوبردنی خیلافەت کە ڕەمزێك بوو بۆ دامەزراندنی سیستمێکی جیهانیی تری بەدیل و نوێ.

لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین بڵێین لەو قۆناغەدا ئەو مومارەساتە ئیستیعمارییانە بوون کە مەیدانەکانی کاری سیاسیی ئیسلامییان دیاریی دەکرد، یەکێتی ئیسلامییش ئەو تەنیا ئامرازە بوو کە باشترین بەکارهێنانی بۆ ئەو پەیوەندییە ئیسلامییانە زامن کردبوو، چونکە ئەوە کولتوری سیاسیی و دامەزراوەکانی بوو کە سەرکەوتوو بوون لە مانەوە و بەرگەگرتندا، لەگەڵ هەموو ئەو فشارانەی کە ستراتیژییاتی بەغەربکردن لە دوای سەردەمی (تنقیمات)[٢٨] بە زۆر سەپاندبوونی، بەرنامەی سیاسیی لە جیهانی ئیسلامییدا ڕزگار بوون لەو دامەزراوانە و کولتورە سیاسییەکەی تێدا نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەو ڕەگەزانە سەرکەوتوو بوون لە پەرەپێدانی شێوازێکی نوێی دامەزراوەکان کە بوون بە چوارچێوەیەکی بنەڕەتیی بۆ سیاسەتی ئیسلامیی، تەنانەت سەرکردەکانی حەرەکەتی (ئیتیحاد و تەرەقی) کە لایەنگری ڕۆژئاوا بوون، ئاگاداری دروست بوونی ئەو دیاردەیە بوون.

پرۆسەی بەهێزکردنی پایەکانی ژێرخانی ئیداریی و سەربازیی لە ڕێگای ئەنجامدانی هەندێك ڕیفۆرمی بیرۆکراسی و پراگماتیکیەوە، پێگەیەکی پێشکەوتووی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیی و فیکری سیاسییدا پێکەوە داگیرکردبوو، بەڵام ڕیفۆرمە هەیکەلیە بیرۆکراسیەکان و گوتاری ئاییینی دوو سەرنجی زۆر جیاواز بوون لە ناوخۆی سیاسەتی ئیسلامییدا لەو ماوەیەدا، ئەوەش بووە هۆی گرتنەبەری تێڕوانینێکی دەستبژێری لەوەی پەیوەستە بە تیۆری سیاسیی و پراکتیزەکردنیەوە،

---

[٢٨] بەشی دەستپێکی ڕاگەیەنراوی ((تنظیمات)) ئەو خاسیەتە دەنوێنێت، چونکە ئامانج لەو سیاسەتە نوێیە ((لەو ڕۆژگارەدا)) گێڕانەوەی هێزی سیستمی ئیسلامیی و شەریعەتی ئیسلامیی بوو، کە هەردووکیان هێزی پاڵنەربوون بۆ ئەو سەرکەوتنە مێژووییەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەدەستی هێنابوو.

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ئەوەی لە توانایدا بوو کردی بۆ تێکەڵکردنی ئەو دوو سەرنجە بە مەبەستی بەجێهێنانی بیرۆکەی یەکێتی ئیسلامیی لە ڕێگای ئەنجامدانی هەوڵەکانی چاکسازیی لە سیستەمی خوێندن و پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێدا کە پڕچەك بێت بە زانستە ڕۆژئاواییە تازەکان، ئەو هەوڵی پێکەوە گونجاندنی ڕەزامەندیی پێشەوایانی تیۆرە سیاسییە ئیسلامییەکەی لەو قۆناغەدا بەدەستهێنا، بەڵکو هانیشی دان بۆ ئەوەی شوێن پێی (شێخ جەمالەددینی ئەفغانی) بگرنەبەر لە تێکەڵکردنی لە نێوان یەکێتی ئیسلامیی و ئاڕاستە نەتەوەییەکان لە جیهانی ئیسلامییدا، لە پاڵ هەوڵەکانی (خەیرەددین تونسی) بۆ ئەنجامدانی چاکسازییە بیرۆکراسیەکان لە ناو چوارچێوەی دامەزراوە تەقلیدییەکاندا، هەڵسانی بزاڤە ئیسلامییەکان و ئۆپۆزسیۆنەکان بە سەرکردایەتی (موحەممەد عاکف و سەعید نورسی) بۆ داواکردنی ڕووبەرێکی فراوانتر لە مومارەسەی سیاسییدا، هەروەها دەستپێشخەرییە ئیسلامییەکەی (سەعید حەلیم پاشا) کە لە سەردەمی حوکمی ئیتیحاد و تەرەقیدا پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرتبوو، جگە لە هەوڵەکانی تری پێکەوە گونجاندن و لێ هەڵبژاردن کە بەرپاکران بە مەبەستی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ هێشتنەوەی سیستەمی جیهانیی ئیسلامیی لە بەرامبەر سیستەمی جیهانیی ئیستیعمارییدا.

لەگەڵ ئەو هەموو زەحمەتانەی قۆناغی یەکەم، تیۆرە سیاسییە ئیسلامیەکە بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی دواتردا زۆر ڕوون بوو، ئەوەش بەهۆی باکگراوندە مەفاهیمی و تیۆریی و دەزگا هاوبەشەکانی ناو کولتورە کۆمەڵایەتییە سیاسییەکەوە کە پشتی بەستبوو بە چەمکە ئیسلامییەکانی وەك: (دار الاسلام) و جیهاد و خیلافەت و شورا و بەیعەت و شتانی تر کە لەو سەردەمەدا لە کولتوور و مومارەسەدا باو بوون، ئەو چەمکانە خاڵی بەیەکگەیشتن بوون لە نێوان نوخبە سیاسییەکان و جەماوەرە موسڵمانەکەدا، بۆیە دەتوانرا گەلانی موسڵمان لە کاتی جەنگە گشتگیرەکاندا ساز و ئامادە بکرێن لە ساڵەکانی نێوان (١٩١١، ١٩٢٣)دا لە

هەموو لایەکی ئیپراتۆریەتی عوسمانییدا هەڵدەگیرسان، ئەوەش لە ڕێگای پەیوەندی کۆمەڵایەتییە کولتوری و کۆمەڵایەتییە سیاسییەکانەوە.

**قۆناغی دووەم:** ئەم قۆناغە بە ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی (١٩٢٤)دا دەست پێدەکات تا هەڵگیرسانی شۆڕشەکانی ڕزگار بوون لە چنگی ئیستیعمار، کەمێك دوای جەنگی جیهانیی دووەم، لەم قۆناغەدا گەلانی موسڵمان ملکەچ بوون بۆ چەند گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی هەمەلایەن کە هەرگیز بە درێژایی مێژووی شارستانێتی ئیسلامیی نەیاندیبوو، هەر بەڕاستی قۆناغێکی مێژوویی مۆلەق بوو بۆ شوناسی ئیسلامییەت و مومارەساتی سیاسیی نوخبە غەرب زەدەکان بوون بە هۆی گۆشەگیربوون و پەراوێزخستنی هەموو چەمکەکان و دامەزراوە بەمیرات بۆماوەکان.

بەهەرحاڵ ڕووخسارە بنەڕەتییەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەو ماوەیەدا لە ژێر کارتێکردنی دوو دیاردەی گرنگدا دیارییکران: یەکەمیان بریتی بوو لە دەستهەڵگرتن لە سیستمەکانی فیکری ئایینیی و پەنابردن بۆ سیستمە ئایدۆلۆژییەکان وەك فۆڕمێکی عەقائیدی سەردەم و وەك گوزارشتکردن لە گەیشتنی بونیادی سیاسیی ئیستیعماری بە لوتکەی خۆی لە ڕوانگەی پاساوی بە دەزگاییکردن لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیی، ئەوە بوو هێزە کۆلۆنیالیستە ڕۆژئاواییەکان دەستیانگرت بەسەر سەروەت و سامانی زۆربەی زۆری دەوڵەتە ناڕۆژئاواییەکان بە قۆرخکردنی ڕەهای سیستمی جیهانیی و جێگیرکردنی پایە دەروونیی و ئایدۆلۆژییەکانی عەقڵیەتی ئیستیعماریی، جگە لە سێ دەوڵەتی تورکیا و ئێران و ئەفغانستان کە شەرعیەتی نێودەوڵەتیی خۆیان هەبوو، هەموو دەوڵەتەکانی تری جیهانی ئیسلامیی کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی ئیدارەی ئیستیعماریی لەو ماوەیەدا. تەنانەت ئێران و ئەفغانستان ڕژێمی هاوشێوە ئیستیعمارییەکان بۆ هەریەکەیان دروست بوو، بەڵام لە تورکیا نوخبە سیاسییەکە هەوڵیاندا دەست لە شوناسی مێژووی خۆیان هەڵبگرن و ڕابردووی شارستانێتی ئیسلامیی لە بیر خۆیان بەرنەوە و بچەنە سەر جیهانی ڕۆژئاوا.

کۆتاییهاتنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی بە شێوەیەك هات کە گونجاو بوو لەگەڵ پەیکەری ناوخۆیی سیستمی جیهانیی ئەو قۆناغەدا، چونکە خیلافەتی عوسمانیی وەك دامەزراوەیەکی سیاسیی، توانی بەردەوام بێت لە ڕاگرتنی دەستگرتن بە دەسەڵاتەوە بە درێژایی مێژووی خۆی تا ساڵی (١٩٢٤) و هەموو ئەو کارەساتانەی تێپەڕاند کە بەسەریدا هاتبوو وەك هێرشەکانی مەغۆل لە سەدەی سیانزەهەمی زاینیدا، ڕووخانی خیلافەتی عوسمانیی لەو ماوەیەدا دەلالەتێکی دوو لایەنەی هەبوو بۆ سەلماندنی ئەو بارە نادروستەی پێی گەیشتبوو لە پەراوێزخستنی فیکری سیاسیی ئیسلامیی لە کاروباری سیاسەتی نێودەوڵەتیدا لەسەر ئاستی سیستمی جیهانیی و لە ناوخۆی جیهانی ئیسلامییدا.

لەسەر ئاستی جیهانیی، کۆتایی خیلافەتی عوسمانیی بریتی بوو لە کۆتاییهاتنی سیستمی جیهانی ئیسلامیی وەك بەدیلێك بۆ سیستمی ئیستیعماری ڕۆژئاوایی، ئەوە بووە هۆی دروستبوونی حاڵەتێك لە ئاڵۆز بوون لە بارەی چەمکی (دار الاسلام)ەوە لەو ڕووەوە کە ناوەندێك بێت بۆ سیستمێکی جیهانیی بەدیل[٢٩]، ئەوەش هەرەسهێنانی دوایین قەڵای ڕووبەڕووبوونەوەی ئیستیعمار بوو وەك سیستمێکی جیهانیی سەرکوتکەر، هەروەها دژ بە ئایدۆلۆژیای تازەگەریی وەك دوژمنێکی تیۆریی و دەزگای سەرسەخت، نەك تەنها بۆ تێڕوانینی شارستانێتی ئیسلامیی و بەس، بەڵکو بۆ تێڕوانینی ئێستای خۆڕسکیش، بەم شێوەیە بۆ یەکەمجار لە مێژووی جیهانی ئیسلامییدا ئوممەت بوو بە ڕەگەزێکی سست و بێدەسەڵات لەسەر ساحەی سیاسەتی نێودەوڵەتییدا، ئەم سست بوونەش گرژییەکی دەروونیی کۆمەڵایەتیی لە ناو جیهانی ئیسلامییدا بەرهەمهێنا بە هۆی دژایەتیی نێوان هێزی تیۆری ئیدراکی زاتیی لەگەڵ لاوازیی پێگەی نێودەوڵەتی لە هەمانکاتدا، ئەو گرژیە بە ڕوونی لەناو کۆمەڵگەی تورکیادا دیار بوو بەو سیفەتەی کە دواناوەندی سیستمی خیلافەت بوو.

---

[٢٩] بێگومان مانای یاسایی ئەو زاراوەیە بەردەوام لە بواری جێبەجێکردندا بوو.

لەسەر ئاستی ناوخۆیی لە جیهانی ئیسلامییدا، ڕووخساری دووەم لە ڕووخسارەکانی پەراوێزبوون لە خۆماندووکردنی پەیکەری ناوخۆیی کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا دەردەکەوت، ڕۆڵی فیکری ئیسلامیی لە کاروباری سیاسەت و ئاڕاستەکردنی ژیانی ڕۆژانەدا لەم قۆناغەدا پوکابوویەوە، دۆخی مەرکەزیی دامەزراوە ئیسلامییەکان تێکشکابوو لە بەرژەوەندیی ئەم دامەزراوە تازانەی کە دەسەڵاتدارانی ئیستیعماری و نوخبەی عەلمانییە حوکمڕانەکان پایەکانیان دادەمەزراند، گۆڕانکارییە ڕیشەییەکان لە دامەزراوەکانی خوێندندا لەو قۆناغە ئیستیعمارییەدا بوو بە هۆی دەرچواندنی کادرە نوخبەویەکان بۆ میانگیری لەنێو ناوەندە ئیستعمارییەکان و کۆمەڵگە ئیستعمارکراوەکاندا، بەتایبەتی لە سەردەمی ئیستعماریی نوێدا لە قۆناغی سێیەمدا وەك پاش کەمێکی تر ڕوونی دەکەینەوە، بەو شێوەیە هێزە فراوانخوازییە ڕۆژئاواییەکان بەردەوامبوونی هەیمەنەی ئیستعماریی خۆیان زامن کرد.

پەراوێزخستنی ئیسلام لە تورکیا –کە دەرهاویشتە سلبییەکانی حوکمی ئیستیعماری ڕاستەوخۆی تووش نەبوو بوو– زۆر کاریگەرتر و گشتگیرتر بوو لەوەی لە ناو کۆمەڵگە موسڵمانەکانی تردا ڕوویدا، نوخبە سیاسییەکەی کە خۆیان لە هەموو بەرپرسیارێتییە مێژووییەکانی تورکیا قوتار کرد و وازیان هێنا لە ماف و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ جیهانی ئیسلامییدا، ئەو نوخبەیە فیکرێکی ستەمکاریی ڕەهایان داڕشت کە ڕێگایان پێ بدات بۆ دەستوەردان لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیریی لە بەرژەوەندیی پرۆسەکانی بە ڕۆژئاواییکردنی هەمە لایەنە، مەبەستیان بوو زاڵ بن بەسەر هەر شتێکدا لەمپەر بێت لەبەردەم ڕەوتی کولتوری تورکیادا بەرەو شارستانێتی ڕۆژئاوا، ئەوەش لە ڕێگای هێنانە کایەی کولتورێکی تازە و شوناسێکی سیاسیی نوێ و سیستمی خوێندنی نوێ، بەڵکو لێکدانەوەیەکی نوێ بۆ مێژوو، ڕاستە کە ئەو هەوڵە خواست و ئارەزوویەکی یۆتۆپیایی بوو لە ڕوانیندا بۆ گۆڕانکارییەکی ژیاریی گشتیی کە پێدراوەکانی کولتور

و مێژوو هێزە کۆمەڵایەتیی و سیاسییە ڕەگداکوتراوەکانی لە ناو کۆمەڵگەی تورکیدا فەرامۆش کردبوو، بەڵام ئەزموونی تورکی لە سەدەی بیستەمدا سەلماندی کە هەوڵەکانی بە زۆر سەپاندنی شارستانێتی دژەکاردانەوەیەك دروست دەکات بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئاراستە ڕۆژئاواییەکاندا و ئەو گۆڕانکارییانەی کە نوخبەی سیاسیی حوکمڕان ڕێبەرایەتیان کرد، هەرگیز سەرکەوتنی بۆ نانووسرێت، بەڵام ئەو مومارەساتانە لەو قۆناغەدا کە سێبەری خۆیاندا بەسەر سیاسەتە ئیسلامییەکەدا، لە میانەی دوو ڕووخساری بنەڕەتییدا دەکرێ شی بکرێتەوە:

یەکەمیان خۆی لە دەرکەوتنی هەوڵەکانی لێکدانەوەی کۆتایی خیلافەت و ژێرخانی سیاسیی نوێدا دەنوێنێت. دەتوانرێت بۆچوونە بنەڕەتییەکانی ئەو مەسەلەیە لە ڕێگای سێ وێناکردنەوە بخرێتە ڕوو کە سێ کەسایەتی دەرکەوتوو گوزارشتیان لەبارەوە کردووە.

وێناکردنی یەکەم ڕەتکردنەوەی پەیامی ئیسلامی سیاسییە، لەگەڵ ئەوەی کە پایەی بنەڕەتی بوو لە دامەزراوەی خیلافەت دا، ئەوەبوو (شێخ عەلی عەبدوڕڕزاق)ی زاناو دادوەری ئایینیی میسری ئەو وێناکردنەی لە کتێبەکەیدا (الاسلام وأصول الحکم) خستە ڕوو، لەوەدا ئامانجی بوو کە ئەو وێناکردنە ڕەتبکاتەوە کە لە واقیعی هاوچەرخدا سەری هەڵدابوو، لە میانەی ڕەتکردنەوەی تیۆرە مێژووییەکە و مومارەسەکردنی خیلافەت وەك دامەزراوەیەکی سیاسیی، بەڵام وێناکردنی دووەم خۆی لە هەوڵەکانی چاکسازیی دامەزراوە سیاسییەکاندا دەنواند و شێخ ڕەشید ڕەزا باشترین نموونەی لەبارەی ئەم بۆچوونەوە پێشکەش کرد لە کتێبەکەیدا بەناوی (الخلافة الاسلامية) و هەوڵیدا کە پێکهێنەرە تەقلیدییەکان و تازەکان پێکەوە تێکەڵ بکات بە مەبەستی زیندووکردنەوەی سیستمی خیلافەت، لایەنگرانی وێناکردنی سێیەمیش هەوڵیاندا بۆ هەڵسەنگاندنی سیستمی حوکمڕانی ئیسلامیی لە چوارچێوەیەکی فەلسەفیی تیۆریی گشتییدا، بە جەختکردنەوە لەسەر نوێکردنەوەی چەمکەکان و بنەما تەقلیدییەکان، لە پێشەنگی ئەوانەدا (موحەممەد ئیقباڵ) بوو کە

هەوڵی دا بۆ دووبارە لێکدانەوەی چەمکی (الاجماع) کۆدەنگی، لە کتێبەکەیدا (تجدید الفکر الاسلامي) بۆ جێگیرکردنی ڕۆحی سیستمی حوکمی کۆماریی.

بەڵام ڕوخساری دووەم لە بزربوونی پەیوەندیی ئەندامێتی لە نێوان دەوڵەت و بەشداربوونە کۆمەڵگەییە ئیسلامییەکاندا دەردەکەوت کە زۆرجار وەك مومارەسەی مێژوویی وەسف دەکرا، بەڵگەش لەسەر ئەوە بریتی بوو لە دەرکەوتنی کۆمەڵەکان و کۆمەڵە ئەهلییە ئیسلامییەکان کە هەوڵیان دەدا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی دەوڵەت هێنابوویە کایەوە، بۆ یەکەمجار بوو لە مێژوودا جەماوەرە موسڵمانەکە ڕووبەڕووی کێشەی جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی ئیسلام ببێتەوە بەبێ پشتیوانیکردنی دەوڵەت، بەڵکو لەسەر جەماوەر بوو لە هەندێ دەوڵەتی ئیسلامییدا باری ئەرکە ئیسلامییەکان لە ئەستۆ بگرێت و بەرەنگاری هێزی دەوڵەت ببێتەوە، بەو هۆیەشەوە ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی توندی لێکەوتەوە، گەلانی موسڵمان بەرپرسیارێتی (جیهاد)یان لە دژی هێزە ئیستیعمارییەکان لە ئەستۆ گرت، ئەوەش ڕۆڵێك بوو پێویست بوو دەسەڵاتە سیاسییە حوکمڕانەکان پێی هەڵسن، هەروەك گەلانی موسڵمان بوون بە ناوەندی بەرگرییکردنی ئیسلامیی دژ بەو ڕەوتە عەلمانیانەی کاریان دەکرد بۆ وەلانانی ئیسلام لە ژیانی ڕۆژانەی موسڵمانەکاندا، ئەوەبوو بزاڤە ئیسلامییەکانی وەك (برایانی موسڵمان) لە میسر و (کۆمەڵی ئیسلامیی) لە پاکستان و (کۆمەڵی نور) لە تورکیا لەو ماوەیەدا دەرکەوتن، ئامانجی ئەو بزاڤانە دامەزراندنی سیستمێکی نوێ و ئەڵتەرناتیڤ بوو لە ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی موسڵماناندا.

کێشەی سیاسیی مەرکەزیی لەو ماوەیەدا بریتی بوو لە چۆنێتی پەرەپێدانی چوارچێوەیەکی تیۆریی و مەفاهیمیی نوێ دوای پرۆسەکانی پەراوێزخستنی چەمك و دامەزراوە تەقلیدیەکان، ئەوەش بۆ زاڵبوون بەسەر کێشەکانی ئەو پەراوێزخستنە لە مومارەسەی سیاسییدا، دوای ڕووخانی خیلافەتی عوسمانییەکان گەلانی موسڵمان خۆیان ڕێبەرایەتی بەرەنگاربوونەوەیان دژ بە هێزە ئیستیعمارییەکان گرتە دەست و

ڕووبەڕووبوونەوە هەڵگیرسا لە نێوان سیستمی نێودەوڵەتیی باڵادەست و گەلانی موسڵماندا، ئەو بەرەنگاربوونەوەیەش لە ڕاستیدا جەنگێکی نابەرامبەر و بێئەنجام بوو لە تێڕوانینی نوخبە عەلمانییەکەدا کە پێیان باش بوو سیاسەتێکی سازشکارانە لەگەڵ ئاغا ئیستیعمارییەکانیاندا بگرنەبەر، ئاغا ئیستعمارییەکان و شوێنکەوتەکانیان لە نوخبە عەلمانییەکان لە حاڵەتی ئەوەدا بوون دڵیان تێر ئاو بخواتەوە لە تۆڵەکردنەوەیان لە شارستانێتی ئیسلامیی کە لە دوا هەناسەکانیدایە، دوای ئەوەی هەموو هێزەکانی تازەگەریی و ئیستیعماریی لە دژی کۆبوونەوە، بەڵام خەونەکانیان بە بادا چوو دوای ئەوەی بزاڤە ئیسلامیەکان هەڵسانەوە و قارەمانێتیان نواند لەدەستگرتن بەشوناسی ئیسلامیی و بەهێزکردنەوەی ئیدراکی زاتیی ڕەسەن و بڵاوکردنەوەی لەناو موسڵماناندا، هەر ئەوەش دەستمایەیەکی دەروونیی پشتیوان بوو بۆ هەوڵەکانی زیندووکردنەوەی روحی ئیسلامێتی لە قۆناغەکانی دواتردا.

قۆناغی سێیەم: ئەم قۆناغە لەوەدا دەردەکەوێت کە لە دوای شۆڕشەکانی دژ بە ئیستعمار دەوڵەتە ئیسلامییەکان دروست بوون، لە واقیعدا ئەجێندای تیۆریی و پراکتیکی جیهانی ئیسلامیی گۆڕا بوو بۆ ئەوەی هاوڕێك بێت لەگەڵ پەرەسەندنە نوێیەکاندا، هەروەها گۆڕا بوو وەك کاردانەوەیەك دژ بە ستراتیژییە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکانی کە لە میانەی پرۆسەی پێکهاتنی بونیادی سیاسیی دەسەڵاتدارێتی دا لە چوارچێوەی سیستمی نوێی دەوڵەتی نەتەوەیی دا پەیدا بووبوون.

پرسیاری یەکەم پەیوەست بوو بە نوخبەی سیاسیی کە ڕێبەرایەتی ئەو گۆڕانکارییەی دەکرد لە بونیادی ئیستیعمارییەوە بۆ سیستمی دەوڵەتی نەتەوەیی، ئەرکی گۆڕین سپێردرا بوو بە نوخبەی عەلمانیەتی غەرب زەدەوە– نەك کەسی تر– لەبەر هۆیەکی سادە، ئەویش خۆدوورگرتنی جەماوەری موسڵمان بوو لە سیستمە پەروەردەییە ئیستعمارییەکان لە ماوەی قۆناغی پێشوودا، لە زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا نوخبە عەلمانیە غەرب زەدەکان توانیان ئەو سەرکەوتنە

سەربازییانەی کە بزاڤە جیهادییەکان دژ بە ئیستیعمار بەدەستیانهێنا بەکاربهێنن و بەری ئەو سەرکەوتنانەیان خستە خزمەتی دانانی ژێرخانی سیاسیی سیستمی دەوڵەتی نەتەوەییەوە، هەروەك ئاغا ئیستیعمارییەکانیش پێیان باش بوو کە ئەو نوخبە عەلمانیانە کاروباری حوکمڕانی بگرنە دەست، بۆ ئەوەی ئامرازێك بن بۆ درێژەدان بە پەیوەندییە ئیستیعمارییەکانیان لە چوارچێوەی ئیمپریالیزمی نوێدا، لە پاڵ دروشمە ڕەوانبێژیە پڕوپووچەکانیاندا کە ئەو نوخبانە بەرزیان کردبوویەوە لە بارەی سەربەستی سیاسیی و سەروەریی نیشتیمانیەوە، سیستمە ئابووریی و سیاسیی و ڕۆشنبیریەکان کە دەوڵەتی نەتەوەیی نوێ دایهێنابوون، یارمەتیدەربوون لە دەرکەوتنی شێوازێکی نوێ لە پاشکۆبوون بۆ سیستمی جیهانیی باڵادەست، ئەوە لەگەڵ دژواریی گونجاندن لە نێوان شوناسی ئیقلیمی و دەرهاویشتەکانی لە دابەشبوون و پەرتەوازەبوون، لەگەڵ تێڕوانینە سیاسییەکانی جەماوەری موسڵمان کە لەسەر هۆشیاریەکی هەمەلایەنە و قووڵ دامەزرابوو بەوەی کە یەك ئوممەت پێکدەهێنن، دژواریی ئەو پێکەوە گونجاندنە بوویە هۆی دروستبوونی ئاڕاستە و بۆچوونی دینامیکیەتی نوێ لەسەر هەردوو ئاستی تیۆریی و پراکتیکی، هەر ئەوەش هانی بیرمەندان و تیۆریستەکانی کۆمەڵە ئیسلامییەکانی دا لەسەر کارکردن لەپێناو دانانی چەمکی نوێ و داڕشتنی چوارچێوەی تیۆریی پێشکەوتوو بۆ جێگرتنەوەی ئەو باکگراوندە تەقلیدیەی کە نەیدەتوانی هاوشانی تازە پەیدابووەکانی واقیعی هاوچەرخ، بڕۆن.

ئا لەم ڕاستایەدا چەمکی (دەوڵەتی ئیسلامیی) پێگەیەکی مەرکەزیی لە تیۆری سیاسیی ئیسلامییدا داگیر کرد، کاتێك ئەوە ڕوویدا هیچ بنەمایەکی تیۆریی و پراکتیکی پێشینەی نەبوو چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو چەمکە تازە پەیدا بووەدا بکات، چونکە بە درێژایی مێژوی ئیسلامیی کاتێك سیستمی جیهانی ئیسلامیی سیستمی باو و جێبەجێ کراو بوو، دروستبوونی دەوڵەتی نائیسلامیی، یان دەسەڵاتێکی سیاسیی عەلمانیی لە چوارچێوەی ئەو سیستمەدا وێنا بکرێت، مومکین

نەبوو، لەبەر ئەوە بوو، چونکە چەمکی (دار الاسلام) بەکاردەهێنرا بۆ وەسفکردنی ئەو ناوچە جوگرافیانەی کە لەژێر دەسەڵاتی سیاسیی ئیسلامییدا بوو و دەیتوانی ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامیی تیادا جێبەجێ بکات.

لە سۆنگەی ئەم تێڕوانینەوە لێکدوورکەوتنەوە لە نێوان چەمکی (دار الاسلام) و چەمکی (دەوڵەتی نەتەوەیی) کە بنەمای سیستمی جیهانیی بوو، بە جوانیی دەردەکەوت، چەمکی (دار الاسلام) لە ڕووی تیۆریی و پراکتیکیشەوە گونجاو بوو لەگەڵ سیستمی ئیسلامیی جیهانییدا، لەگەڵ ئەوەشداو بە هۆی پێکەوەژیانی ئاشتیانە لە نێوان حکوماتە ئیسلامییە یەك لەدوای یەکەکان[٣٠] و نێوان کۆمەڵەکانی (أهل الذمة) – کەمینە ناموسڵمانەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامیی کە سەربەخۆیی خۆیان پاراست و بەشداربوون لە پێدانی مۆرکی پلۆراڵیزم بە شارستانێتی ئیسلامیی– چەمکی (دار الاسلام) مومکین نەبوو ببێتە ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی سیستمی (دەوڵەتی نەتەوەیی)، چونکە لە واقیعدا بەدیلێکی تەواو بوو بۆی، کاتێك پێویستیی موسڵمانەکان دەرکەوت بۆ دانانی چەمکی نوێ، لەو ماوەیەدا کە هاوزەمان بوو لەگەڵ دەرکەوتنی سیستمی (دەوڵەتی نەتەوەیی)دا، ڕۆڵی میحوەریی

---

[٣٠] دەرکەوتنی چەندین دەوڵەتی ئیسلامیی لە هەندێ قۆناغی مێژوویيدا لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی ئیسلام یان لە ئەنجامی بێتوانایی خەلیفەی سیاسیی، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە (دارالاسلام) لەوە زیاترە کە سنوورێکی سیاسیی یاسایی جیاکەرەوە بێت لە ژێر دەسەڵاتی تەنیا دەوڵەتێکدا. ئەو دەوڵەتانە هەندێ جار توانیویانە بۆشاییە سیاسیەکە پڕبکەنەوە کە لە دەرەنجامی بێتوانایی ناوەندی هێزە سیاسییەکەوە دروست دەبوو. وەك ئەوەی لە کاتی خەبات و جیهادی سەلاحەددینی ئەیوبیدا دژ بە خاچدارەکان ڕوویدا. هەندێ جار ئەو دەوڵەتانە داوای ڕەزامەندیی خەلیفەیان دەکرد بۆ شەرعیەتدان بە دەسەڵاتی سیاسییان. هەروەك لە (طغرل بك)ی سوڵتانی سەلجوقی ڕوویدا کاتێك داوای ئەوەی لە خەلیفەی عەباسی کرد، هەروەها کاتێك فەرمانڕەوایی موسڵمانانی وڵاتی هیند ئەو داوایەی ئاڕاستەی (باب العالي) کرد لە ئەستانبوڵ. لەگەڵ ئەوەش هیچ کامیان ڕایان نەگەیاندووە کە (دار الاسلام) ئەو سنوورە جوگرافیایەیە کە هەریەك لەوانە حوکمی دەکات بە ویستی خۆی)) (احمد داود اغلو،١٩٩٤: ٢٠١).

بۆ چەمکی (دەوڵەتی ئیسلامیی) ڕۆشن بوویەوە لە هەوڵدانیدا بۆ دووبارە دارِشتنەوەی تیۆری حوکمی ئیسلامیی بە ڕوئیایەکی نویَ، گوتاری نوێی فیکریی سیاسیی هەریەك لە (مەودودی و سەید قوتب و عەلی شەریعەتی) بەڵگە بوو لەسەر ئەو بۆچوونە و یەکێك بوو لە بەرهەمەکانی.

ئەو پرسیارەی کە لە بەشی شەشەمدا لە بارەی شەرعیەتی سیاسییەوە چارەسەرمان کرد، لە بارەی شەرعیەتی سیاسییەوە، هەروەها لایەنگیریی پێشینە لەلایەن ناوەندەکانی هێزەوە لە سیستمی جیهانیدا کە ڕۆژئاوا ڕێبەرایەتی دەکرد لەو ماوەیەدا کە باسی لێدەکەین، کاریان کردە سەر کۆمەڵگە موسڵمانەکان بە هەموو بەشەکانیانەوە، بەو کۆمەڵانەشەوە کە بۆچوونی عەلمانیەتی توندڕەویان هەیە، هەموو لایەك دەرکیان کرد بەوەی کە پەراوێزخستن و دوورخستنەوەی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە ساحەی نێودەوڵەتیی بەردەوام دەبێت، ئەگەرچی سیاسەتێکیش دەگرنەبەر کە لایەنگری ڕۆژئاوایە، دامەزراندنی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی بەپێی بڕیارەکانی لووتکەی دەوڵەتە ئیسلامییەکان بوو– کە لە دوای پەلاماردانی مزگەوتی (الاقصی) و سوتاندنی لە ساڵی ١٩٦٩دا سازکرا– ئەو هەنگاوە خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ بوو، ئاماژە بوو بۆ ئەوەی گۆڕانێکی دەروونیی و سیاسیی ڕووی داوە، بۆ یەکەمجار بوو لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانییەوە نوخبە سیاسییە حوکمڕانەکان لە جیهانی ئیسلامییدا، دەرك بکەن بە پێویستییان بۆ کاری هاوبەش و بەئاگا بێنەوە سەبارەت بە گرنگیی بەهێزکردنی هەڵوێستی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتییدا، دەکریَ ئەو گۆڕانە دابنێین بە گوزارشتکردن لەو پەیوەندییە بەریەککەوتووەی کە لە نێوان ناوەندەکانی هێزە سیاسییەکان و جیهانی ئیسلامییدایە لەسەر ساحەی نێودەوڵەتیی، بەهەرحاڵ فشارەکان و سیاسەتە سەرکوتکاریەکان کە ناوەندەکانی هێزە نێودەوڵەتییەکان مومارەسەیان دەکرد، لەو مەسەلانەی پەیوەستن بە کێشە سیاسییەکانی جیهانی ئیسلامیەوە– بەتایبەتی لە مەسەلەی فەلەستیندا– ئەو ئاڕاستە هاوکاریکردنەی بەهێز کرد دوای هەڵوێستی

هێزە ڕۆژئاواییەکان لە بەرژەوەندیی یۆنان لە مەسەلەی قوبرسدا، لەگەڵ ئەوەی کە موسڵمانەکان دووچاری چەوساندنەوە و سەرکوتکردن بووبوون، ئەوە بوو تەنانەت عەلمانییەکانی تورکیاش کە پێشتر دەستیان هەڵگرتبوو لە هەموو بەرپرسیارێتییە نێودەوڵەتییەکانیان، دڵنیابوون لە پێویستیی یەکگرتنەوە لەگەڵ جیهانی ئیسلامییدا جارێکی تر، ئا بەم شێوەیە نوخبەکان و گەلان وەك یەك دەرکیان کرد بەوەی کە لایەنگیریی ڕۆژئاوا و دوژمنایەتیکردنی هێزە نێودەوڵەتییەکان دژ بە جیهانی ئیسلامیی دوو مەسەلەی بەردەوامن و ڕۆژئاوا مومارەسەیان دەکات لەژێر پەردەیەکی ڕووپۆش کراو بە دروشمە ئینسانیە بریقەدارەکانی وەك، سیستمی ئاسایشی بەکۆمەڵ کە نەوە یەکگرتووەکان پشتیوانی لێدەکرد.

لایەنێکی دیکە هەیە پەیوەستە بە سیستمی حوکمی ئیسلامییەوە لەو قۆناغەدا، ئەوەش گۆڕانی نموونە بنەڕەتییەکەی سەرکردایەتی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و فیکرییە لە ناوخۆی بزاڤە ئیسلامییەکاندا، بە بەراوردکردن لەگەڵ ڕێبەرایەتی سیاسەتە تەقلیدییەکەدا کە هاوزەمان بوو لەگەڵ بەشی یەکەمی ئەو قۆناغەدا، نموونەیەکی سەرکردایەتی نوێ بە دەرچوانی قوتابخانە هاوچەرخەکان پێگەیشت، پێشەوایانی ئەم نموونەیە زیاتر لە پزیشکان و ئەندازیاران و زانایانی کۆمەڵناسیی بوون، هەوڵیان دەدا بۆ داڕشتنەوەی تیۆرێکی ئیسلامیی لە چوارچێوەیەکی نوێ کە لە ڕووی ڕێکخستنەوە زیاتر یەکگرتوو بێت، شیکەرەوە ڕۆژئاواییەکان کە چاودێریی بزاڤی ژیانەوەی ئیسلامییان دەکرد ناویان لەو هەوڵانە نا ((بەئایدۆلۆژیکردنی ئیسلام))، لەڕاستیدا لە لایەن بزاڤە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و فیکرییەکانەوە کاردانەوەیەکی سروشتیی بوو کە ناچار کرا بوون بۆ ئەوەی ناکاراو لە پەراوێزدا بن لەسەر هەردوو ئاستی ناوخۆیی و دەرەکیی، لەو شتانەی کە زۆر سەیر بوون سیاسەتی سەرکوتکردن و لایەنگیری دژ بە جیهانی ئیسلامیی یارمەتیدەربوون لە بەهێزکردنی ئاڕاستەی زیندووکردنەوەی پێوەرەکانی شارستانێتی ئیسلامیی و گەڕانەوە بۆیان، بەری ئەو ئاڕاستە و مەیلەش بە روونی لە کۆتایی سەدەی

بیستەمدا دەرکەوت، کاتێك هەستکردنی ڕوو لە زیادبوونی متمانە بە خۆ بڵاوبویەوە و ئەو هەستکردنەش بە ڕۆڵی خۆی بوویە هۆی پەیدابوونی چالاکییەکی کۆمەڵایەتیی و فیکریی و سیاسیی لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامییدا.

**قۆناغی چوارەم:** ئەم قۆناغە لەگەڵ گۆڕانێکی ڕیشەیی لە ئەولەویاتی ڕژێمە حوکمڕانەکانی جیهانی ئیسلامییدا لەسەر ئاستی تیۆریی و پراکتیکی دەستی پێکرد، بەتایبەتی بە بەراوردکردن لەگەڵ قۆناغی دووەمدا کە لە پێشەوە باسکرا. ئەوەبوو ئیدراکی زاتیی ئیسلامیی تازەبوویەوە و بەهێز گەڕایەوە بۆ خۆقوتارکردن لەو گرێی خۆبەکەم زانینەی باڵی کێشابوو بەسەر زاتییەتی موسڵماناندا لە قۆناغی باڵادەستی ئیمریالیزمدا، دوای ئەوەی زۆر کەسانێك بەلایانەوە وابوو نەگۆڕەکان و پێوەرە ئیسلامیەکان لە دوا هەناسەدان، بەڵام دەرکەوت بەرگەگریەکی زیاد لە چاوەڕوانکراویان هەیە و توانای نوێبوونەوەیان ڕوون بوویەوە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا. دەکرێ بوترێت سەرکەوتنی شۆڕشی گەلی ئەفغانی بەسەر سۆڤیەتە داگیرکەرەکاندا بەهۆی بەهێزیی ئیدراکی زاتیی و سووربوونیان لەسەر بەرهەڵستیکردن، ڕۆڵی هەبوو لە ئاشکراکردنی لایەنە لاوازەکانی بلۆکی سۆشیالیستی دا، هەروەك ڕۆڵی هەبوو لە لاوازکردنی پایەکانی سیستمی دووجەمسەریی لەسەر ساحەی نێودەوڵەتیی و داڕووخانی سۆشیالیزم و لاوازبوونی نموونە تازەگەرییەکە، چەندە ڕەهەندێکی نوێی بزاڤی نوێکردنەوە و ژیانەوەی ئیسلامیی دەرخست، کە توانی چەندین شێوازی نوێ لە چالاکیی دەروونیی و فیکریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دابڕێژێتەوە.

لەگەڵ هەبوونی ئاستەنگ و تەحەددیاتی زۆر لەبەردەم پەرەپێدانی ناوەندێکی ژیاریی ئەڵتەرناتیڤ– وەك لەبەشی شەشەمدا ڕوونمان کردەوە– بەڵام ئەو زیندوێتییە ژیارییە لەمەودای دووردا دەگۆڕێت بۆ تێگەیشتنی قوڵتر لە سیستمی حوکمڕانی لە جیهانی ئیسلامییدا، ڕەفتاری پێکدادان کە سەنتەرەکانی هێزە ڕۆژئاواییەکان دەیگرنەبەر، زیاتر هانی ئەم پرۆسەیە دەدات و پاڵی پێوە دەنێت بۆ

پێشەوە، ئەزموونەکانی ڕابردووی پێکدادان لە نێوان ڕۆژئاوا و جیهانی ئیسلامییدا جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکاتەوە کە بەرەنگاربوونەوە لە نێوان هێزە ئیمپریالیزمەکان و گەلانی موسڵماندا یارمەتیدەر بوو لەسەر زیاتر دەستگرتنی ئەو میللەتانە بە ئیدراکی زاتیی خۆیان لە تاریکترین ڕۆژگارەکانی مێژووی شارستانێتی ئیسلامییدا، لەکاتێکدا نموونە تازەگەریەکە لە چڵەپۆپەی پێشەکەوتن و باڵادەستییدابوو بەسەر کولتورە کلاسیکیەکانەوە لە ڕوویەکەوە، لەکاتێکدا ئەو سیاسەتی پێکدادانە لایەنگیرە– کە هێزە باڵادەستە ڕۆژئاواییەکان گرتبوویانە بەر دژ بە دەوڵەتە ئیسلامییە پەرتەوازەکان– توانیبوی موسڵمانەکان ناچار بکات لەسەر مل دانەواندن و هاوکارییکردن لەپێناو بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانیاندا، لە ڕوویەکی ترەوە.

وەك ڕوونمان کردەوە، هەوڵەکانی چەواشەکردنی وێنەی جیهانی ئیسلامیی و وێناکردنی بەوەی لە هەڵوێستێکی دژبەیەکدایە لەگەڵ سیستمی جیهانیی نوێدا، یەکێکی ترە لە شێوازەکانی ڕووبەڕووبوونەوە کە ڕۆژئاوا دەیەوێت بیسەپێنێت، ئەم شێوازەش زیاتر دەبێتە هۆی هاندانی هەوڵەکانی جیهانی ئیسلامیی بۆ دۆزینەوەی بەدیلێکی نوێی شارستانێتی، بێگومان قەیرانی سیستمی دەوڵەتی نەتەوەیی وا لە موسڵمانان دەکات تاوتوێی پەیکەرە سیاسییە بنەڕەتییەکان و ئەو پێوەرە شارستانییانە بکەن کە لە قۆناغی سێیەمدا دەرکەوت وەك لە پێشەوە باسکرا، دەتوانین نیشاندەرە سەرەتاییەکانی ئەو هەوڵە نوێیە تێبینی بکەین لە زیاتر لە وڵاتێکی عەرەبی و ئیسلامییدا، لەوانە جەزائیر و ئەردەن و میسر، کە لایەنە ئیسلامییەکان سەرکەوتنی سیاسیی بەرچاویان لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا بەدەستهێناوە، هەروەها دەتوانین بڵێین کارتێکردنە سەلبیەکان کە سیستمی جیهانیی نوێ بەسەر جیهانی ئیسلامییدا دێنێت و هەوڵە بێوچانەکان بۆ پاراستنی دۆخی ئێستا– کە لە هەردوو قۆناغی دووەم و سێیەمدا دروست بووە– ناتوانێت ڕێگر بێت لە بەردەم سەرهەڵدانی هێز و دامەزراوەی کارا و چالاك لە جیهانی

ئیسلامییدا، وەك پێویستییەك لە پێویستییەکانی پەرەپێدانی سیستمێکی جیهانیی بەدیل لەسەر مەودای دوور، مانەوەش بۆ هیچ هێزێکی سیاسیی لە ناو جیهانی ئیسلامییدا نانووسرێت ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر ڕەتکردنەوەی ڕادەی گەورەبوونی دەسەڵاتی ئیسلامیی جگە لە هەندێك لە ڕژێمە حوکمڕانەکان بە پشتیوانیکردنی هێزە سیاسییە ڕۆژئاواییەکان – وەك ئەوەی لە جەزائیر ڕوویدا– کە لەوانەیە لەناو زۆنگاوی کێشە و بارگرژییدا نقوم بن، هەرچەندێك بزاڤە ئیسلامییەکان بەرەوپێش بچن و هێز و چالاکییەکانیان توندوتۆڵتر ببێت، بەو شێوەیەی کە لە پەرەسەندنەکانی ساڵانی دواییدا دەردەکەوێت.

سیاسەتی دەرەوەی تورکیا لە دوو دەیەی دواییدا باشترین نموونەیە لەسەر قبوڵکردنی ڕوو لە زیادبووی هێزە ئیسلامییەکان لە ساحەی ناوخۆییدا، تورکیا کە سیاسەتێکی دەرەکیی داخراوی بەسەر خۆیدا گرتبووە بەر و خۆی گونجاندبوو لەگەڵ ((ئەمری واقیع))دا، لە دوای ڕووخانی خیلافەتی عوسمانییەوە، فشار و داخوازییەکانی هێزە ئیسلامییە مێژووییەکانی تێدا ڕوو لە بەرزبوونەوەیە، ئەو هێزانە – کە خاوەنی دینامیکیەت و زیندوێتیین– ئەو بۆچوونانە ڕەتدەکەنەوە کە داوای گۆشەگیری تورکیا لە جیهانی ئیسلامیی دەکەن، سنوورەکانی دەوڵەتی تورکیا لەژێر فشارە هاوشێوەکاندایە لە لایەن کۆمەڵگە موسڵمانەکانی دراوسێوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر لاوازبوونی شەرعیەتی دابەشکردنە ئیقلیمیە دەستکردەکان لە ناوچەکەدا، هەر ئەوەش کۆچکردنی موسڵمانان لە بولگاریا و یۆنانەوە ئاماژەی بۆ دەکەن، هەروەها گەڕانەوەی پەیوەندییە مێژووییەکانی نێوان بۆسنە و هەرسك و کۆسۆڤا و مەقدۆنیا لە ڕوویەکەوە و تورکیا لە ڕوویەکی دیکەوە، جگە لە ڕاگەیاندنی ئیقلیمی (ناختشڤان) بۆ یەککگرتن لەگەڵ تورکیا و داواکردنی ئازەربیجان بۆ هاوکاریی سەربازیی دژ بە ئەرمینیا، هەروەها کۆچکردنە بەردەوامەکانی ناوچەی باکووری عێراق و داواکردنی پشتیوانیی و دانپێدانانی نێودەوڵەتی بۆ کۆمارە سەربەخۆکانی باکووری قەفقاسیای ئیسلامیی وەك چیچان و ئەنگۆشیا و ئەبخازیا و ئەوانی تر،

ئەوانە هەموویان فشار دەخەنە سەر تورکیا بۆ ئەنجامدانی هاوکاریی زیاتر لەگەڵیاندا و بە دوای ئەوەشدا گۆڕینی سیاسەتە گۆشەگیریە تاك ئاڕاستەکەی کە دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی سییەکانی سەدەی بیستەم، واچاوەڕوان دەکرێ ئەم ئاڕاستە نوێیە لای دەوڵەتە ئیسلامییەکانی تر قبوڵکراو بێت، ڕەوتی ئیسلامیی بێگومان ئەو سیناریۆیە دەگۆڕێت کە هێزە ئیمپریالیستەکان وێنەیان کێشاوە بۆ جیهانی ئیسلامیی لە قۆناغی دووەمدا، هێزە ئیمپریالیستەکان پێشبینیان کردووە بۆ ئەگەری ڕوودانی بزاڤێکی ژیانەوەی ئیسلامیی لە ناو جەرگەی جیهانی ئیسلامییدا و بە دیارییکراوی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەو ناوچەیەدا کە میسر و حیجاز و عێراق و سوریا و تورکیا دەگرێتەوە، بۆیە ئەو هێزانە هەوڵیانداوە بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕژێمە سیاسییەکانی ئەو دەوڵەتانە، لەگەڵ ئەوەشدا، دوور لە چاوەڕوانکراو، لە ماوەی دەیەی دواییدا دەستپێشخەربوون لەو بوارەدا، وەك ئەوەی بینرا لە بزاڤەکانی جیهاد لە ئەفغانستان و پرۆسەی بەئیسلامییکردن لە پاکستان و زیندووکردنەوەی کولتور و شوناسی ئیسلامیی لە ناوچەی قەفقاسیا و ناوەڕاستی ئاسیا، هەروەها دامەزراندنی حکومەتێکی ئیسلامیی لە سودان و (پێشتریش لە ئێران) و هۆشیاریی ئیسلامیی ڕوو لە زیادبوون لە ئەریتیریا و نایجیریا، لە پشتیوانییکردنی جەماوەریی لە جەزائیر بۆ دامەزراندنی سیستمێکی سیاسیی ئیسلامیی بەدیل و ئیرادەی بەهێزی گەلی بۆسنە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی سەرەبەخۆ لەناوچەی ناوەڕاستی ئەوروپا، هەموو پێدراوی مانادارن و بەڵگەن لەسەر ئاڕاستەیەکی نوێ کە لە دەوڵەتەکانی جیهانی ئیسلامییدا گەڵاڵە دەبێت، ئەو پێدراوانە هانی کەسێتییە موسڵمانەکانی دا بۆ بەرگریکردن لە وڵاتە جیاجیاکاندا و داواکارییەکانیان بەرز کردەوە سەبارەت بە ڕێزگرتن لە دروشمە ئایینییەکان و مافەکانی مرۆڤ لە ناوچە جیاجیاکانی هەرێمی تورکستانی ڕۆژهەڵات لە چین و هەرێمی مەندنا و لە فلیپین و هەرێمی ئەراکان لە بۆرما و کشمیر لە هیندستان و بزاڤی ئەبخازی لە جۆرجیا و موسڵمانانی ڤۆلگا لە باکووری قەفقاسیا لە ڕووسیا، هەروەها موسڵمانانی هەرێمی نیوەدوورگەی کرایمیا

له ئۆكرانيا و كۆسۆڤا له كۆماری صربيا، جگه له كه‌مينه موسڵمانه‌كانی بولگاريا و يۆنان، ئه‌وانه هه‌موويان به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر به‌رنامه‌يه‌كی سياسيی نویێ له جيهانی ئيسلاميی له‌م سه‌رده‌مه‌دا ده‌يگرێته به‌ر، ڕه‌نگه گرنگترين خه‌سڵه‌ت ئه‌و به‌رنامه‌يه‌ی پیێ ده‌ناسرێته‌وه، داواكاريی بێت به‌پێكه‌وه‌گرێدانی هه‌وڵه‌كان و تواناكان له نێوان ده‌وڵه‌ته ئيسلامييه‌كاندا، هه‌ر ئه‌وه‌ش هانی موسڵمانه‌كان ده‌دا له‌سه‌ر زيندوێتی به‌رجه‌سته‌ی چه‌مكه ته‌قليديه‌كانی، وه‌ك (برايه‌تی جيهانيی له نێوان ڕۆڵه‌كانی ئوممه‌ت) و (دار الاسلام) وه‌ك چه‌مكێكی جيهانيی و (خيلافه‌ت) وه‌ك دامه‌زراوه‌يه‌كی سياسيی بۆ ئه‌و سيستمه جيهانييه، هيچ پێويست ناكات ڕاوه‌ستان له‌سه‌ر شێوازه ته‌قليدييه كۆنه‌كانی ئه‌و دامه‌زراوانه، چونكه گومان له‌وه‌دا نييه دۆزينه‌وه‌ی فۆرمێكی نویێ مه‌سه‌له‌يه‌كی حه‌تميه، به‌تايبه‌تی دوای ئه‌و ئه‌زموونه دژوارانه‌ی گه‌لانی موسڵمان دووچاريان بووه به هۆی سياسه‌تی دوژمنكارانه‌ی زلهێزه ڕۆژئاواييه‌كانی باڵاده‌ست به‌سه‌ر سيستمی جيهانييدا، ئه‌و ئاڕاسته‌يه هه‌وڵێكه بۆ په‌ره‌پێدانی سيستمێكی جيهانيی به‌ديل، نه‌ك هه‌وڵێك بۆ په‌ره‌پێدانی سيستمی ده‌وڵه‌تی نه‌ته‌وه‌يی كه به‌سه‌رچووه، ئاڕاسته گشتييه‌كه به‌ره‌و گلۆباليزم يارمه‌تيده‌ر ده‌بێت له زيادكردنی هه‌ستكردن به پێويستيی هاوكارييكردنی يه‌كتر له نێوان گه‌لانی موسڵماندا.. ڕاسته ئه‌و ئاڕاسته و بۆچوونه سياسييه تازانه، به‌ره‌نگاريی چه‌ند ئاسته‌نگێك ده‌بنه‌وه له ئه‌نجامی ئه‌و قه‌يرانه‌دا كه ئوممه‌تی ئيسلاميی تيايدا ده‌ژی له‌سه‌ر ئاسته‌كانی فيكريی و ئابووريی و سياسيی، به‌ڵام ئه‌و ئاسته‌نگانه به مسۆگه‌ريی ده‌گۆڕێن بۆ پرۆسه‌يه‌كی ديناميكی له مه‌ودای دووردا، له ميانه‌ی دانانی پلانی عه‌قڵانيی توندوتۆڵ و درێژخايه‌ندا، هه‌تا پڕۆسه‌ی دامه‌زراندنی تيۆريی بۆ ژيانه‌وه‌ی ژياريی نویێ به‌هێزتر بێت، كارايی روئيا و بۆچوونه‌كان زياتر ده‌بێت بۆ گه‌يشتن به‌هێنانه‌دی ئامانجه كۆمه‌ڵايه‌تييه ئيسلامييه ڕاست و ڕه‌وانه‌كان.

گرنگترین دیاردە لە دەیەی دوای سەدەی بیستەمدا، ئەو مەیلە ڕوو لە گەشەکردنەیە بەرەو گۆڕانکارییەکی ژیاریی ڕاستەقینە، لە ئەنجامی ئەو قەیرانە ژیارییە هەمەلایەنەی نموونەی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوایی بەجێی هێشتووە، بە شێوەیەك هەڕەشەیە لەسەر ئاسایشی وجودیی و ئازادیی ئینسانیەت، ئەو دووەش گرنگترینی ئەو ئامانجە بنەڕەتیانەن مرۆڤ بە درێژایی مێژوو بەدوایاندا دەگەڕێت، ئەو بومەلەرزە بەهێزەی تووشی بنەما سەرەکییەکانی نموونە تازەگەرییەکە بووە، گۆڕین و دووبارە پێکهێنانەوەی پێویست کردووە، ئەوەش ئەو پرۆسەیە کە شارستانێتی ڕۆژئاوا سەرگەرمی بووە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو تێکچوونە مەفاهیمیی و دامەزراوەییانەی دووچاری پەیوەندیی مرۆڤ بە مرۆڤ و مرۆڤ بە سروشتەوە، هاتووە.

وەك لە پێشەوە باسمان کرد تیۆری کۆتایی کە گریمانە دەکەن پەرەسەندن لە فیکری ئینسانییدا بگاتە کۆتاییەکەی لە پەیوەندییدا بە ڕێگاکانی بەدیهێنانی بەختەوەریی بۆ مرۆڤایەتی، ئەو تێکچوونانەی ڕووی کردۆتە نموونەی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوایی، ئەوەش بووەتە هۆی هێنانە کایەی حاڵەتێك لە گەشبینیی درۆینە، نەك تەنها لە لایەنی فەلسەفییەوە و بەس، بەڵکو لە لایەنی سیاسیی و پراکتیکیشەوە، بەڵام ڕەوتێکی گشتیی باو ئاماژە دەکات بۆ دەرکەوتنی مەیلێکی تر کە مەبەستییەتی گۆڕانکاریی ژیاریی ئەنجام بدات لەپێناو زاڵبوون بەسەر ئەو قەیرانەدا، وا چاوەڕوانیش دەکرێت وێنەی ئەو گۆڕانکارییە ژیارییە و ئەو دەرهاویشتە فیکریی و ئابووریی و سیاسییانەی بەدوایدا دێت، بێگومان سایە سیاسییەکانی دەخاتە سەر ساحە نێودەوڵەتییەکە بەگشتیی، نموونەی ئیسلامیی تێڕوانینێکی هەمەلایەنە و پێچەوانە پێشکەش دەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە ژیارییە، چونکە ئیسلام یەکەم جەخت دەکات لەسەر بەها وجودیەکانی ژیانی مرۆڤ لە ڕێگای سەربەستبوونی لە هەر ئامرازێك، یان سیستمێکی تازە پەیدابوو لە بوارە ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکاندا، ئیسلام ئەو چارەسەرە پێشکەش دەکات بۆ ئەو قەیرانی نامۆ بوون

و گۆشەگیربوونەی کە ژینگە پیشەسازییەکە دروستی کردووە بۆ نموونە تازەگەرییەکە.

دووەم: تێڕوانینی ئیسلامیی بۆ چۆنێتی هێنانەوەی پێکەوە گونجان لە نێوان سەرچاوە مەعریفیەکاندا بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەرکەزیەتی ڕەهای مەعریفەی مرۆڤ، ئەو تێڕوانینە ئامانجێتی چارەسەری ئەو تەنگژە تازەگەریە بکات کە زانست و بەجێهێنانە وێرانکارییەکان بوونەتە هۆی.

سێیەم: پێوەرگەرایی بەها ئیسلامییەکان کە پشتی بەستووە بەو چەمکە وجودیە مەعریفیانەی پەیوەستن بە خودا و مرۆڤ و سروشتەوە، تێڕوانینێکی تیۆریی پێکدێنێت ڕێگرە لەبەردەم ئامرازە دەستکردەکان و خراپ بەکارهێنانی داهاتە سروشتییەکاندا. ئەو پەیوەندییە بەیەکدا چووەش لە نێوان چەمکە وجودیەکان و مەعریفە و بەهاکاندا، ئەو ڕەهەندە کاراو دینامیکیەیە لە تێڕوانینە گشتییەکەدا، کە جەخت دەکات لەسەر پێویستیی تێگەیشتن لە یەکێتی ژیان، لە بەرامبەر تێزە عەلمانییەکەدا کە هەڵقوڵاوی نموونە تازەگەرییە ڕۆژئاواییەکەیە.

تێڕوانینی ئیسلامیی بەدیل لەوەی پەیوەستە بە تەنگژەکەی ڕۆژئاواوە، ڕەگەکانی لە ناخی ئیدراکی زاتیی دا داکوتاوە بەو سیفەتەی سەرچاوەیەکە نایەتە وشك بوون لە مانا ئینسانییە بەدیلەکان، چەمکی ئیسلامیی بۆ ئاسایشی وجودیی و ئازادیی وەك یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەو ئیدراکە زاتییە بەهێزەیە، چونکە ئازادیی لە ڕوانگەی ئیسلامییەوە پشت بە هێز نابەستێت، وە لەویشەوە سەرچاوەی وەرنەگرتووە، بەڵکو حاڵەتێکی سروشتییە لە هۆشیاریی زاتییەوە هەڵدەقوڵێت، لەبەر ئەوەیە کە ئازادیی ئیسلامیی وەك دیاردەیەکی ڕێژەیی وەسف ناکرێت کە مرۆڤەکان بۆیان هەبێ وەك یەك لێی بەهرەمەند بن، یان هەندێکیان خۆیان بە گەورەتر بزانن بەسەر ئەوانی تردا، هەروەها ئازادی بەوە وەسف ناکرێت کە بەرەنجامی بەکارهێنانی داهاتە سروشتییەکانە ڕێگای ئامرازەکان و ڕژێمە دروستکراوەکانەوە، ئازادیی بەپێی تێڕوانینی ئیسلامییانە گوزارشتە لە

پێگەیشتنێکی ڕۆحانیی کۆنترۆڵ و ئاڕاستەی (الأنا الانساني) دەکات، کەواتە ئازادیی پەیوەست نییە بە هێزەوە، بەڵکو پەیوەستە بە هۆشیاریی زاتیی و بە کەینونەی ئینسانیەوە، ئاسایشی وجودی مومکین نابێت بێتە دی بەبێ ئەوەی ئازادیی ڕۆحانی ببێتە شێوازێکی کۆمەڵایەتیی لە ڕەوشتە بەرزەکان، هەر ئەو ئیدراکە زاتییەش بوو ڕێگربوو لە ڕێگای خۆهەڵتەکاندن لە کولتورە ئیسلامییەکە لە میانەی پرۆسەی بەجیهانییکردنی نموونە ڕۆژئاواییەکەی مۆدێرنیزم دا، ئەوەش بە فەزڵی توانای ئەو ئیدراکە لەسەر پارێزگارییکردن لە هەستی موسڵمانەکان بەوەی سەرگەرمی ئەرکێکی تایبەتن و پێویستە لەسەریان ئەنجامی بدەن و نابەسترێتەوە بە هیچ کۆت و پێوەندێك لە دەرەوەی خۆی.

ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە فراوانبوونی مێژووی ئیسلام لە سەدەی کۆچی یەکەمدا موعجیزەیەکی سیاسیی بوو، کە لە ماوەیەکی زەمەنیی پێوانەییدا هاتەدی، لەگەڵ ئەوەشدا موعجیزەی ڕاستەقینە کە عەقیدەی ئیسلامیی بەدەستی هێناوە، بریتییە لە داڕشتنی ئیدراکێکی زاتیی و کەسایەتییەکی تاقانە کە پاڵنەرێکی دەروونیی و کۆمەڵایەتییان بۆ ئەو زیندوێتییە ژیارییە دابین کردووە، شکستی ماددیی بە هۆی گرتنەبەری کۆپییە تازەگەرییەکەی شارستانێتی ڕۆژئاواوە، بوویە هۆی هەڵسانی هەندێك لە بیریارە موسڵمانەکان بە پەرەپێدانی شوناسێك بە تێکەڵکردن لە نێوان بنەما ئیسلامییەکان و بنەما ڕۆژئاواییەکان دا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئاڕاستەیە شکستی هێنا لە بەرهەمهێنانی ئیدراکێکی زاتیی نوێ دا کە توانای هەبێ لەسەر جێگۆڕکێ پێکردنی هاوتا ئیسلامییە تەقلیدییەکە، یان شوێنی بگرێتەوە، لەوە بەدواوە بزاڤیی ژیانەوەی ئیسلامیی چووە قۆناغێك لە بێداربوونەوە و دووبارە دۆزینەوەی ئیدراکە زاتییەکەی، بەتایبەتی دوای ئەو شکستەی دووچاری ئەو شوناسە بوویەوە کە بە زۆر سەپێنرا بوو بەسەر جیهانی ئیسلامییدا، ئەمڕۆ دەبینین هۆشیاریی وجودیی و ئیدراکی زاتیی ئیسلامیی چارەسەرێك پێشکەش دەکەن بۆ ئەو قەیرانەی کە ڕۆژئاوای شەکەت کردووە، ئەو تێڕوانینە ئیسلامییە

توانای هەیە لەسەر جێگیرکردنی چەندین بنەمای زیندو بۆ شارستانێتییەکی تر کە مرونەت و شەفافیەتی زیاتری هەبێت.

جیاوازیی سەرەکیی لە نێوان تێڕوانینە ئیسلامییەکە و هاوشێوە ڕۆژئاواییەکەدا لە چۆنێتی داننانە بە دەستدانی ئامرازە کۆمەڵایەتییەکان و دادانەوەی شەرعیەت بەسەریدا. هەروەك لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ڕوونمان کردەوە، تێکچوونی ئەخلاقی ماددیی پەیوەندیدار بە قەیرانە ژیارییەکەی ئێستاوە، ئەنجامی بێتوانایی مرۆڤە لە هەڵسان بە ڕۆڵی خۆی لە ڕێنماییکردنی سیستمی بەهاکاندا، هەر ئەوەش ناچاری کردووە ئەو بەرپرسیارێتییە بسپێرێت بەو ئامرازە کۆمەڵایەتییانەی کە خۆیان هەندێك بەهای تایبەت بە خۆیان بەرهەم هێناوە، بەدوای ئەوەدا مافی ئەوەی هەیە دان بنێت بە شەرعیەتی بەها زاتییەکانیدا، تەنگژەکەی مرۆڤی ڕۆژئاوایی ئالێرەدایە بە دیارییکراوی، چونکە تیۆرە سەرەکییەکانی مێژوو بە ڕەنگدانەوە ئایدۆلۆژییەکانیەوە، ڕۆڵی (مرۆڤی– تاك) و بەرپرسیارێتی ئەوەندە کورت کردۆتەوە کە دەرفەتی داوە بە دەزگاکانی دەوڵەت بۆ ئەوەی هەڵسن بە سەپاندنی هەر سیستمێکی بەهاکان کە بیەوێت، وەك ئەنجامێکی حەتمیی عەقڵانیەتی پەرگیر و حەتمیەتی مێژوویی، وەك ئەوەی لە سیستمی سۆشیالیستیدا ڕوویدا، یان ئەوەی کە ئێستا لە بارەی ئامرازەکانی جیهانگیریی ئابووریی سەر بە سیستمی سەرمایەداریی ڕوودەدات، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن ئەو ئامرازانەوە بەتایبەتی کۆمەڵایەتییەکانیان دەردەکەوێت، لە تەنیشت ئەوەی کە نوخبەنەتەوەیی و جیهانیەکان پێی هەڵدەسن لە بواری دیارییکردنی ئەرکەکانی غەیری خۆیان لە مرۆڤەکان و دەستنیشانکردنی پلە و پایەیان لەناو کۆمەڵگەکانیاندا.

بە پێچەوانەی ئەوەوە، پێوەرکاری ئیسلامیی گریمانەی لەو جۆرە ئازادییە ڕەهایە ناکات بۆ میکانیزمەکان و سیستمە داهێنراوەکان، کە وادادەنرێت وەك گۆڕاوی شوێنکەوتە بمێننەوە بۆ پلە و پایە وجودیەکە و بۆ بەرپرسیارێتی مرۆڤ لە

ژیاندا، به دوای ئەوەدا ڕێگایەك نییە بۆ شەرعییەتدان بەو میكانیزمانە بەبێ گەڕانەوە بۆ سیستمی بەهاكانی كۆمەڵگە موسڵمانەكان، هەمان مەسەلە بەسەر ئامرازە فەرعییەكانی پرۆسەكەدا جێبەجێ دەبێت، كە دەكرێ شەرعییەت وەربگرن بەس لە كاتێكدا مەبەست هێنانەدی ئامانجە كۆمەڵایەتییەكانی بەهاو ڕەوشتە ئیسلامییەكان بێت، بەڵام لە بارەی بنەما تیۆرییەكانی قەیرانەكەوە كە هەردوو شارستانێتییە ئیسلامییەكە و ڕۆژئاواییەكە لە كاتی ئێستادا پێوەی گرفتار بوون، ئەوە بۆ هەركامێكیان ئاڕاستەیەكی پێچەوانەی ئەوی تری هەیە، قەیرانی ئیدراكی زاتیی لە كەڵەكەبوونێكی بەردەوامدایە و زاڵبوون بەسەر ئەو قەیرانەدا بە ئەنجامدانی هەندێك چاكسازیی هەیكەلیی و دەزگایی بەتەنیا ناكرێ، بەتایبەتی قەیرانی شارستانێتی ڕۆژئاوا هەر لە بنەڕەتەوە لە تەنگژەی نێوان تێڕوانینە ژیارییەكە و پراكتیزە دەزگاییەكانیدایە.

لە حاڵەتی شارستانێتی ئیسلامییدا مەسەلەكە تەواو بە پێچەوانەوەیە، چونكە ئیدراكی زاتیی شارستانێتی و تێڕوانینەكانی هێشتا لە جیهانیی ئیسلامییدا بەهێزن، لەگەڵ ئەوەی كە شێوازە هەیكەلی و دەزگاییەكانی ئێستای ڕەنگدانەوەی باكگراوندە تیۆرییەكە و تێڕوانینە تایبەتەكەی نییە، قەیرانی جیهانی ئیسلامیی بەدیاریكراوی لە چۆنێتی ئەكتیڤكردنی ئەو ئیدراكە زاتییەوە لەدایك دەبێت لەسەر ئاستە كۆمەڵایەتی و ئابووریی و سیاسییەكان، هەرگیز كێشەی جیهانی ئیسلامیی كێشەی ئیدراكێكی زاتیی ناكام نەبووە، بەڵكو زیاتر كێشەی چۆنێتی گواستنەوەی بووە بۆ بواری جێبەجێكردن.

قەیرانی (ئوممەت) لە سەردەمی نوێدا لە ئەنجامی پراكتیزەكردنی كۆپیە دواكەوتووەكەی گۆڕانكارییە ژیارییەكانەوە دروست بووە، ئەو پرۆسەی گۆڕانكارییە ژیارییە بەزۆرسەپێنراوە لە قۆناغی بەڕۆژئاواییكردنی جیهانی ئیسلامیدا، بوویە هۆی وێرانكردنی هەموو بونیادە ژیارییە كلاسیكییەكان، یان بۆماوەكان، بەڵام ئەو گۆڕانكارییە دەستەوسان بوو لە داڕشتنی پێكهاتەیەكی ژیاریی نوێدا، مەبەستیش لە

پشت سەپاندنی ئەو گۆڕانکارییە ژیارییەوە لە ڕاستای قۆناغی بەڕۆژئاواییکردندا، بریتی بوو لە هێنانە کایەی گۆڕانێکی ڕیشەیی لە میانەی گواستنەوەی نموونە تازەگەرییەکە بۆ گەلانی موسڵمان، بۆ هێنانەدی دۆخێکی باشتر لە ناوخۆی هەرەمی دەوڵەتەکانی سیستمی جیهانیی لە ڕوانگەی ئابووریی و سیاسییەوە، بەڵام شکستی ئەو هەوڵە گرژیەکی دەروونیی و فیکریی و سیاسیی لە جیهانی ئیسلامییدا بەرهەمهێنا، بەهۆی لێکدوورکەوتنەوەی لایەنی تیۆریی و پراکتیکیی لە نێوان تیۆرە ئیسلامییەکە وەك پڕۆژەیەکی دژ بە نموونەی مۆدێرنیزم و شێوازە فیکریی و ئابووریی و سیاسییەکانی کە هەیە، ئیدراکی زاتیی موسڵمانان هاندەر بوو لەسەر دەرككردن و جێبەجێکردنی ئەو تیۆرە بەو سیفەتەی ڕەنگدانەوەیەکی بەهاکانە بۆ بەرپرسیارێتییەکی پیرۆز، بەڵام خەسڵەتی قۆرخکاریی کە شارستانێتی ڕۆژئاوایی سەردەمی پێ ناسراوە، بەو سیفەتەی کە شێوازێکی بیرکردنەوە و نەمەتێکی ژیانە و جیهانگیرییەکەی بەشێوەیەکی خێرا و بەردەوام زیاتر دەکات، ڕێگای بەمجۆرە پەرەسەندنە دامەزراوەییە بەدیلە نەداوە کە ڕێڕەوی خۆی وەربگرێت، تەنانەت لە ناوخۆی وڵاتە ئیسلامییەکانیشدا.

لە ماوەی چەند دەیەی کەمی ڕابردوودا، دوو شارەزابوون گەڵاڵە بوون کە بەشداریان کردووە لە زیادکردنی بارگرژیی نێوان جیهانی ئیسلامیی و سیستمی جیهانییدا، یەکەمیان ئەو لایەنگیرییکردنە بەردەوام و سیاسەتی دووفاقیەیە کە سیستمی جیهانیی سەبارەت بە مەسەلە گرنگەکانی جیهانی ئیسلامییەوە مومارەسەی دەکات، ئەوەش هەستیاریی جەماوەرە موسڵمانەکەی ورووژاندووە دژ بە ناوەندەکانی ئەو هێزانەی لە پشت سیستمی جیهانییەوە خۆیان مەڵاس داوە و هەڵدەسن بە جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە لایەنخوازیانە، بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی سەروەت و سامانی گەلانی موسڵمان لە بەرژەوەندیی هێزە ئەوروپاییە مەسیحی و جولەکەکان. بەدوای ئەوەدا لە ناو گەلانی موسڵماندا هەستکردن بە نەمانی متمانە بە سیستمی جیهانیی وەك میانگیرێکی بێلایەن لە چارەسەرکردنی ناکۆکییەکاندا

بڵاوبووەتەوە، هەرچی شارەزایی دووەمیشە لەوەدا خۆی دەنوێنێت کە قەیرانی نموونە تازەگەرییەکە بەڵگەکانی بانگەشەکەرانی بۆ سیاسەتی بە ڕۆژئاواییکردن لە جیهانی ئیسلامییدا زۆر لاواز کردووە، لە هەمان کاتیشدا بووەتە هۆی زیادکردنی هێزی ئەو ڕەوتەی بانگەواز دەکات بۆ ئەوەی ئیسلام لە میانەی تێڕوانینە جێگیرەکانیەوە توانای هەیە لەسەر پێشکەشکردنی چارەسەرێکی دیکە، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە نموونە تازەگەرییەکە پێشکەشی دەکات لە پێناو زاڵبوون بەسەر قەیرانە هاوچەرخەکەدا، مەیلێکی تری گەشەکردوو هەیە بەرەو پێکدادان لە نێوان هەردوو شارستانێتی ئیسلامیی و شارستانێتی ڕۆژئاوادا و مومکینە ئەو مەیلە بگۆڕێت بۆ زیندووێتییەکی ژیاریی بە پیت، بە مەرجێك ئەو تەحەددییە ژیارییە سەرنەکێشێت بۆ لایەنگیریی پێشوەختە و گرتنەبەری پێوەرە دوانەییەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجە پراگماتیکیە خۆپەرستەکان، جیهانی ئیسلامیی لە توانایدایە پێشکەوتنێکی ژیاریی بهێنێتە دی، ئەگەر نوخبە فیکریی و ئابووریی و سیاسییەکانی بتوانن پێکەوە گونجانی تیۆریی و بەهرەمەندییە مێژووییەکەی شارستانێتی ئیسلامیی بگێڕنەوە بە مەبەستی پشتیوانیکردنی بەرنامە سیاسییە نوێیەکەی جیهانی ئیسلامیی، بەو سیفەتەی پڕۆژەیەکی ئەڵتەرناتیڤە بۆ سیستمی جیهانیی نوێ و پەرگیر لە دووڕوویدا، بە مەرجێك ئەو پشتیوانییکردنە لە ڕێگای هاندانی داهێنانی فیکریی و لێهاتوویی ئابووریی و زیندوێتی کۆمەڵایەتییەوە بێت، نموونەی ئەم پێشکەوتنە ژیارییە تەنها چارەسەر بۆ کێشەکانی جیهانی ئیسلامیی پێشکەش ناکات، بەڵکو توانای دەبێت لەسەر دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤێکی گونجاو بۆ دەربازکردنی هەموو مرۆڤایەتیی لەم قەیرانەی کە تێیکەوتووە.

# سەرچاوەکان:


**Abd ur-Razq Ali.** (1966). *Al-Islam wa Usul al-Hukm*, Beirut.

**Abu-Lughod,J.L.** (1989). *Before European Hegemony: The World System A.D.1250-1350*, N.Y.: Oxford University Press.

**Ahmed, I.** (1987). *The Concept of Islamic State*, London.

**Aron, R.** (1968). "The end of Ideological Age" in C.I.Waxman *The End of Ideology*: 27-49, N.Y.: Simon and Schuster.

**Bacon, F.** (1990). *New Atlantis*, Chicago: Encyclopædia Britannica Inc.

**al-Baghdâdî** (1981). *Kitâb Uṣûl al-Dîn*. Beirut: Dâr al-Âfâq al-Jadîdah.

**Bennabi, M.** (1991). *Islam in History and Society*, Kuala Lumpur: Berita.

**Camilleri, J.A.** (1976). *Civilization in Crisis*, Cambridge: University Press.

**Clark, I.** (1989). *The Hierarchy of States*, Cambridge: Cambridge Univ.Press.

**Clough, S.** (1961). *The Rise and Fall of the Civilization: An Inquiry into the Relationship between Economic Development and Civilization*, N.Y.: Columbia University Press.

**Curtis, J.E. and Petras, J.W.** (1970). *The Sociology of Knowledge*, New York: Praeger.

**Davutoglu, A.** (1994). *Alternative Paradigms: The Impact of Islamic and Western Weltanschauungs on Political Theory*, N.Y.: University Press of America.

**Denisoff, S.** (1972). *Sociology in Conflict*, California.

**Ellis, B.** (1979). *Rational Belief Systems*, Oxford:Basil Blackwell.

**al-Fârâbî** (1985).*Kitâb Ârâ Ahl al-Madinat al-Fâḏilah*. Beirut: Dâr al-Machreq.

**Faruqî, I. R.** (1963). "On The Raison D'etre of the Ummah", *Islamic Studies*, vol.2/159-203.

__________ (1982). *Tawḫîd: Its Implications for Thought and LIfe*. Herndon, Virginia: International Institute of Islamic Thought.

**Fazlur Rahman** (1967). "The Qur'anic Concept of God, The Universe and Man", *Islamic Studies*, vol. 6/1: 1-19.

**Feyerabend, P.K.** (1981) *Problems of Empiricism: Philosophical Papers*, 2 vols. Cambridge: Cambridge University Press

**Fromm, E.** (1990). *The Anatomy of Human Destructiveness*, London:Penguin.

**Fukuyama,F.** (1990). "Are We at the End of the History", *Fortune International*: 1990/2: 33-36.

__________, (1992). *The End of History and The Last Man*, N.Y.:The Free Press.

**Galtung, J.** (1985). "On the Dialectic between Crisis and Crisis Perception", S.Musto & C.F. Pinkele, *Europe at the Crossroads* : 3-29, N.Y.:Praeger.

**Gibson,J.** (1931). *Locke's Theory of Knowledge and its Historical Relations*, Cambridge: Uni. Press

**Green, C.** (1989). "Freedom and Determination: An Examination of Yves R. Simon's Ontology of Freedom" in Michael D.Tore (ed). *Freedom in the Modern World: Jacques Maritain, Yves R. Simon, Mortimer J. Adler*, Indiana: American Maritain Association.

**Griffin,D.R.** (1989). *God and Religion in the Postmodern World*, N.Y: State University of New York Press.

**Grünebaum, G.E. von** (1962). "Pluralism in the Islamic World", *Islamic Studies*, vol.5/ 2: 37-59

**Haber, R. A.** (1968). "The End of Ideology as Ideology" in C.I.Waxman *The End of Ideology*:: 182-206, N.Y.: Simon and Schuster.

**Hayes, C.J.H.** (1960). *Nationalism: A Religion*, New York: Macmillan

**Hegel, G.W.F.** (1929). *Science of Logic*, trans. W.H.Johnston and L.G. Struthers, London.

________, (1990a). Philosophy of History, Chicago: Encyclopædia Britannica Inc.

________, (1990b). Philosophy of Right, Chicago: Encyclopædia Britannica Inc.

**Hume, D.** (1907). *Essays Moral, Political and Literary*; T.H. Green and T. H. Grose (ed) , 2 vols., 5. ed.; London: Longmans, Green and Co.

**Husserl,E** (1965). Philosophy and the Crisis of European Man in Phenomenology and the Crisis of Philosophy Trans. Q.Lauer, New York: Harper and Row.

**Ibn Khaldûn** (1978). *The Muqaddimah: An Introduction to History*. Trans. F.Rosenthal. London: Routledge and Kegan Paul in association with Secker and Warburg.

**Ibn Ṯufayl** (1905). *The Improvement of Human Reason Exhibited in the Life of Hayy Ibn Yakzan*. Trans. S. Ockley. Cairo: Al-Ma'âref Printing Office.

**Iivonen,J.** (1990). "Soviet Foreign Policy Doctrine in Transition",V.Harle & J.Iivonen, *Gorbachev and Europe*, London: Pinter.

**Iqbal, M.** (1988). *The Reconstruction of Religious Thought in Islam*, Lahore: Sh. Muhammad Ashraf.

**Izzetbegovic, A.A.** (1991) *Islam Between East and West*, Indianapolis, American Trust Publications.

**Kennedy,P.** (1988).*The Rise and Fall of the Great Powers*, London: Fontana.

**Kohn,H.** (1942). *World Order in Historical Perspective*, Harvard.

**Krasnov, V.** (1991). *Russia Beyond Communism: A Chronicle of National Rebirth*, Oxford: Westview.

**Kubalkova,V & Cruickshank,A.** (1980). *Marxism-Leninism and Theory of International Relations*, London: Routledge &Kegan Paul.

**Laszlo, E.** (1977). *Goals for Mankind: A Report to the Club of Rome on the New Horizons of Global Community*, N.Y.: E.P.Dutton.

**League of Nations** (1945). *Industrialization and World Trade*, New York.

**Marcuse, H.** (1972). *One Dimensional Man*, London: Abacus.

**Martina, G.** (1988). "The Historical Context in Which the Idea of a New Ecumenical Council Was Born", in Latourelle, R., *Vatican II: Assessment and Perspectives*, New York:Paulist Press.

**Marx,K.** (1967). *Capital*, New York: International Publishers.

**al-Mawârdî** (1973). *Al-Aḫkâm al-Sulṯânîyyah*. Cairo: Maktabah M. al-Ḫalabî.

**Mills, C.W.** (1959). The Sociological Imagination, N.Y,: Oxford Uni. Press.

**Mumford,L.** (1940). *Faith For Living*, N.Y.: Harcourt, Brace and Company.

_________. (1966). *The Myth of the Machine*, N.Y.:Harcourt, Brace and Company.

**Naisbitt,J & Aburdene,P.** (1990). *Megatrends 2000*, N.Y: Avon Books.

**Nasr, S. H.** (1986). *Man and nature: The Spiritual Crisis of Modern Man*, K.L.: Foundation for Traditional Studies.

**Pipes, D.** (1983). *In the Path of God: Islam and Political Power*. New York: Basic Books.

**Polanyi, M.** (1983).*Personal Knowledge:Towards a Post-Critical Philosophy*, London:Routledge and Kegan Paul

**Popper, K.R.** (1959). *The Logic of Scientific Discovery*, tr. by the author from *Logik der Forschung* (Vienna 1934), London: Hutchinson.

**al-Qur'ân al-Karîm** (1983). Trans. and commentary by Yûsuf 'Ali. Brentwood: Amana Corp.

____________, (n.d.). Trans. M. M. Pickthall. London: Islamic Book Centre.

**Ridâ, Rashîd** (1988). *Al-Khilâfah*. Cairo: Al-Zahrâ' al-I'lâm al-'Arabî.

**Rosenthal, F.** (1970). *Knowledge Triumphant: The Concept of Knowledge in Medieval Islam*. Leiden: E. J. Brill.

**Roszak,T.** (1971). *The Making of Counter-Culture*, London: Faber &Faber.

**Runciman, W.G.** (1969). *Social Science and Political Theory*, Cambridge.

**Russell, B.** (1962). *History of Western Philosophy*, 8. ed.; London: George Allen and Unwin Ltd.

**Rywkin,M.** (1991). "The Communist Party and the Sufi Tarikat in the Checheno-Ingush Republic", *Central Asian Survey*. vol.10;No.1/2, pp.133-145.

**Scheler, M.** (1963). *Schriften zur Soziologie und Weltanschauungslehre*, Bern: Franke Verlag.

**Shaybânî** (1966). *Siyar*. Trans. M. Khaddûrî as *The Islamic Law of Nations*. Baltimore: Johns Hopkins University Press.

**Shils, E.** (1968) "The End of Ideology" in C.I.Waxman *The End of Ideology*: 49-64, N.Y.: Simon and Schuster.

**Stites, R.** (1989). *Revolutionary Dreams: Utopian Vision and Experimental Life in the Russian Revolution*, N.Y.: Oxford University Press.

**Susser, B.**(1988). *The Grammar of Modern Ideology*, London: Routledge.

**Taftazânî, S.** (1950). *Sharh al-'Aqâid al-Nasafî*. Trans. E. E. Elder as *A Commentary on the Creed of Islam*. New York: Columbia University Press.

**Toynbee,A,J.** (1939). *A Study of History*, N. Y.:University Press.

**Wallerstein, I.** (1974). *The Modern World-System I.*, N.Y.: Academic Press.

____________, (1980). "The Ottoman Empire and Capitalist World-Economy: Some Questions for Research", in O.Okyar and H.Inalcik (eds.) *Social and Economic History of Turkey*, p.117-122.

___________, (1990). "Marx, Marxism-Leninism, and Socialist Experiences in the Modern World-System", *Thesis Eleven*, 27:40-53.

**Williams, J. A.** (1971). *Themes of Islamic Civilization*. Los Angeles: University of California Press.

# پێڕست

# دکتۆر ئەحمەد داود ئۆغلۆ



* دکتۆر ئەحمەد داود ئۆغلۆ لە ١٩٥٩/٢/٢٦ لەدایك بووە.

* دەرچووی بەشی ئابووریی و پەیوەندییە نێودەوڵـەتیی و زانسـتە سیاسییەکانی زانکۆی بوگازیجییە لە تورکیا.

* لـە هـەمان زانکـۆ بڕوانامـەی ماسـتەری لـە کـارگێڕیی گـشتییدا بەدەست هێناوە.

* پاشانیش بڕوانامەی دکتۆرای لە زانـستە سیاسـییەکان و پەیوەنـدیی نێودەوڵەتییـدا لـە هەمان زانکۆ بەدەست هێناوە.

* لـە سـاڵانی ١٩٩٣ ـ ١٩٩٩ مامۆسـتا بـووە لـە زانکـۆی مەڕمـەڕە لـە تورکیـا. هـەروەها سەرۆکی کارگێڕیی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بووە لە زانکۆی بیلکنت لە ئەستەنبوڵ.

* لە ٢٠٠٣/١/١٧ بـە بڕیـارێکی هاوبەشـی ئەحمـەد نەجـدەت سـیزەری سـەرۆکی ئـەوکاتی تورکیا و عەبدوڵڵا گول وەزیری دەرەوەی ئەوکات، نازناوی باڵیۆزی پێبەخشرا.

* لە ٢٠٠٩/٥/١وە تا ئێستا وەزیری دەرەوەی تورکیایە.

* پێشتریش گەورە راوێژکاری رەجەب تەیب ئەردۆگانی سەرۆك وەزیرانی تورکیا بووە.

* لە دانراوەکانی:

– Alternative paradigms: The Impact of Islamic and Western Weltanschauungs on political Theory.

- The Civilization Transformation and the Muslim World.

- العمق الإستراتيجي.

– الأزمة العالمية.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.